


**ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە**

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: **سیروان مەحمود**

بەڕێوەبەری هونەری: **باسم رەسام**

**ناوی کتێب:** دین و دونیا

**ناوی نووسەر:** مەریوان وریا قانیع

**بابەت:** دین و دەسەڵات

**دیزاینی تێکست:** دانا حەسەن

**نۆبەتی چاپ:** سێهەم ٢٠١٥

**چاپخانە:** پەنجەرە

**تیراژ:** (١٥٠٠) دانە

**نرخ:** (٧٠٠٠) دینار

**ژمارەی سپاردن:** لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٣٤٤)ـی ساڵی (٢٠١٥)ـی پێدراوە.



ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی–شەقامی مەولەوی–تەلاری سیروانی نوێ–نهۆمی چوارەم

www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com

http//www.facebook.com/Andeshacenter

07501026400

## ئەم زنجیرە کتێبە:

کتێبی "دین و دونیا" یەکەم کتێبی زنجیرەکتێبێکە، کە هەرجارەی باس لە ئامادەگیی دیاردەیەک لە دیاردەکان لەناو دونیادا دەکات. کتێبی دوای ئەمە، باس لە "کتێب و دنیا" دەکات، کتێبی دوای ئەویش، باس لە "سیاسەت و دونیا" و دواهەمین کتێبی زنجیرەکەش، تەرخانە بۆ باسکردنی "فیکر و دنیا." لە ئاییندەیەکی کورتدا هەریەکێک لەم کتێبانە دەکەونە بەر دیدی خوێنەر.

پێشکەشـە بـە ڕۆشـنبیرە دینییـە گەورەکانـی دونیـای ئێمـە. پێشکەشـە بـە حاجـی قـادری کۆیـی، مەحـوی، مـەلای گـەورە. عەلائەدیـن سـوجادی و مـەلا عەبدولکەریمـی مودەڕیـس.

"ئینتیمای من بۆ سەردەمەکەم ئینتیمایەکە بە هیچ جۆرێک ناکرێت بپووکێتەوە و لەناو ببرێت."

فرانز فانون، لە کتێبی "پێستی ڕەش، ماسکی سپی"

"دواهەمین دوعام ئەمەیە، ئەی جەستەم لێت دەپاڕێمەوە، بمکە بە ئینسانێک، هەمیشە پرسیار بکەم."

فرانز فانون، لە کتێبی "پێستی ڕەش، ماسکی سپی"

"ئەو شتانەی بە یەک چاو دەتوانین بیانبینین، هەرگیز ئەو شتانە نین کە دەکرێت بە دوو چاو بیانبینین."

نیزام ئەلمولک، لە کتێبی "سیاسەتنامە"

# ناواخن

# پێشەکی چاپی یەکەم

بێگومان دین زیاترە لەوەی تەنها باوەڕهێنان بێت بە خودا وەک هێزێک لە دەرەوەی دونیا و لە دەرەوەی گەردوون و لە دەرەوەی ژیاندا، هێزێک، لەسەرەوڕا چاودێریی ئەوە بکات، کە ئینسان چی دەکات و چۆن دەژی و بیر لە چی دەکاتەوە. دین تەنها مەسەلەی باوەڕهێنان نییە بە خودا، بەڵکوو پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆشی بە مەسەلەی شووناسەوە هەیە. پرسیاری ئەوەی من کێم، لەکوێوە هاتووم و بۆ کوێ دەچم، چۆن بژیم و چ باوەڕ و قەناعەتێکم هەبێت؟ کۆمەڵێک پرسیارن، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە دینەوە هەیە. بێگومان مەرج نییە وەڵامی ئەم پرسیارانە هەمیشە وەڵامێکی دینی بێت، یان دین چوارچێوەی وەڵامدانەوەیان بێت، بەڵام وەڵامی دین بەم پرسیارانە تا ئەمڕۆکەش یەکێکە لەو وەڵامانەی کە بە شێوەیەکی بەرفراوان ئامادەیە. لەپاڵ ئەمەدا، دین پەیوەندیی بە بوونی ئەنترۆپۆلۆژیانەی ئینسانەوە هەیە، واتە پەیوەندیی بە بوونی ئینسانەوە هەیە وەک ئینسان. پەیوەندیی، بۆ نموونە، بە ترسیَ ئینسانەوە هەیە لە مردن، پەیوەندیی بە سەرسووڕمانی ئینسانەوە هەیە لە تێڕامان، لە دروستبوونی ژیان و لەدایکبوونی بوونەوەران. پەیوەندیی بەوەوە هەیە، کە ئینسان بوونەوەرێکی پرسیارکەر و گومانکەرە، نە پرسیارەکانی و نە گومانەکانی بە یەک وەڵام و بە یەک یەقین کۆتاییيان نایەت. ئەمە وای کردووە، لانی کەم، تا ئەمڕۆ برێکی زۆر لە ئینسانەکان بەردەوام پێیەکیان

لەناو دیندا بێت، ئەگەر هەدروو پێکەشیان لەناویدا نەبێت. بەڵام تەنانەت لێرەشدا، واتە تەنانەت لەناو دین خۆشیدا، بڕێکی گەورە لە پرسیار و گومان و دڵەڕاوکێ هەیە. دینیش دواهەمین وەڵام و باوەڕپێکراوترین وەڵامی پێ نییە، تەنانەت بۆ کەسایەتییە دینییە قووڵەکان خۆشیان. بۆیە دین، هەم دەشێت سەرچاوەی جۆرێک لە یەقین و دڵنیایی تایبەت بێت، بەڵام دەشێت سەرچاوەی دوودڵی و گومان و پرسیاری زیاتر و زیاتر بێت. (١)

هەموو ئەم ئاستە جیاوازانەی بوون و ئامادەگیی دین، وا دەکەن دین تا ئەمڕۆش بەشێکی گرنگی ژیانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و دەروونی و سیاسیی ئینسان بێت. زەحمەتە لە دونیادا کۆمەڵگەیەک بدۆزینەوە، دین بەو مانایانەی سەرەوە، یان بە مانایەک لەو مانایانە، تیادا ئامادە نەبێت و ژمارەیەکی بەرچاوی مرۆڤ، بوونیان نەبێت، کە دین بەشێکی گرنگی پێکهاتی عەقڵی و پێکهاتی خەیاڵ و شێوەی ژیان و مۆدێلی بوونیان نەبێت. بۆیە پرسیاری سەرەکی ئەوە نییە ئایا دین لە ژیانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و دەرونی و سیاسیی ئینسانی ناو کۆمەڵگەکانی ئەمڕۆدا ڕۆڵی هەیە یان نا، بەڵکوو ئەوەیە، ئایا چ ڕۆڵێکی هەیە؟ چ بەشدارییەکی هەیە؟ لە چ پەیوەندییەکدایە بە ڕەهەندە جیاوازەکانی بوونی ئینسانەوە لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا، چۆن و چ پەیوەندییەک دروست دەکات لەنێوان خۆی و ئەو بەشانەی تری کۆمەڵگەدا، کە دین سەرچاوەی بیرکردنەوە و ڕێکخستنی ژیان و وێناکردنی شووناسی خۆیان نییە، چ پەیوەندییەکی هەیە لەگەڵ ئەوانەدا، کە لە دیندا بەدوای ڕزگاربووندا ناگەڕێن، کە دین سیستمی حەڵاڵ و حەرامەکانیان دەستنیشان ناکات؟ بەکورتی، پرسیاری سەرەکی ئەوەیە، دین چۆن لەگەڵ دابەشبوونە ناوەکییەکانی خۆی و چۆن لەگەڵ بێدینیدا دەژیی؟ واتە چۆن لەگەڵ لێکدانەوە و تێگەیشتنە دینییە جیاوازەکانی ناو هەناوی خۆی و چۆن لەگەڵ ئەو دیدە فیکری

و فەرهەنگی و ڕەمزییانەدا بژیی، کە نادینیین. وەک وتم، مادام ئینسان بوونەوەرێکی پرسیارکەر و گومانکەر و پڕترسە، بۆیە پرسیار و گومان و ترسەکانی ڕووبەڕووی هەموو شتەکانە، هەم ڕووبەڕووی ئەو دڵنیاییانەیە کە بیرکردنەوەی نادینی یان دژ بە دین بە ئینسانی دەبەخشن، هەم ڕووبەڕووی ئەو دڵنیاییانەشە، کە دین بە ئینسانی دەبەخشێت. واتە ئینسان بوونەوەرێکە نە لە دیندا ئۆقرە دەگرێت، نە لە بێدینیدا. چەند کەسانێک هەن دین بە سەرچاوەی ڕزگاربوونی تاکەکەسی و دەستەجەمعیی خۆیان دەزانن، ئاواش کەسانی تر هەن لە دەرەوەی دیندا بەدوای سەرچاوەی ڕزگاربوونی تاکەکەسی و دەستەجەمعیی خۆیاندا دەگەڕێن. مێژووی ئینسان خۆشی مێژوویەکە پڕ لە دین و پڕ لە بێدینی لە یەک کاتدا. باوەڕ و بێباوەڕی، دوو ڕەهەندی گەورە و گرنگی ژیانی ئینسان و کۆمەڵگەکانە، زەحمەتە ساتەوەختێکی مێژوویی بدۆزینەوە، کە تیایدا دین و بێدینی شانبەشانی یەکتری ئامادە نەبووبن. (۲)

بێگومان تەحەدای سەرەکی ئەوە نییە چۆن دینییەکان نادینییەکان، یان نادینییەکان دینییەکان لەناو ببەن، یان چۆن ئەمیان بەزۆر دیدی خۆی بەسەر ئەوی دیدا بسەپێنێت، یان شێوە ژیانی ئەمیان شێوە ژیانی ئەویدیکەیان لەناو ببات، یان پرسیار و گومان و وەڵامەکانی ئەمیان، پرسیار و گومان و وەڵامەکانی ئەوی دیکەیان بێدەنگ بکات، پرسیاری کۆمەڵگە هاوچەرخەکان، پرسیاری چۆنیەتی پێکەوەژیانی ئەم دید و بۆچوون و پرسیار و وەڵام و شێوەژیان و بەرخوردە جیاوازانەیە لەگەڵ یەکدیدا. پرسیاری هەڵکردن و پێکەوەژیانی دینە لەگەڵ نادین و نادینە لەگەڵ دیندا. بەڵام پێکەوەژیان بەو مانایە نا یەکێکیان ببێت بە براگەورە، یان سەروەوری ئەوی دیکەیان، ئەمیان لێگەڕێ ئەوی دیان وەک بوونەوەری پلەدوو و پلەسێ و پلەچوار بژیی و ئامادە بێت. بەڵکوو دروستکردنی شێوازێک لە پێکەوەژیان، کە بە هەمووان هەمان ماف

و هەمان ئەرک و هەمان بەرپرسیاریتی و هەمان ئەگەری پێشکەوتن و گەشەکردن ببەخشێت. تەحەدای سەرەکیی دونیای ئەمڕۆ، تەحەدای دروستکردنی پێکەوەژیانێکی پڕڕێز و پڕیەکسانییە لەنێوان ئەوانەی دین چوارچێوەی بیرکردنەوە و شێوەژیان و بەرخوردیان دیاری دەکات، لەگەڵ ئەوانەدا کە چوارچێوەی دیکەیان بۆ ژیان و بیرکردنەوە و بەرخورد هەیە. واتە، تەحەدای سەرەکیی ئەمڕۆ، تەحەدای قبوڵکردنی جیاوازی و قبوڵکردنی پلورالیزمە، واتە فرەدەنگییە. ئیدی لە فرەدەنگیی سیاسییەوە بیگرە بۆ فرەدەنگی بەها و ئەخلاق و شێوەی ژیان و شێوەی تێگەیشتن بۆ دین و دونیا و ئینسان و کۆمەڵگە. (٣)

بە بۆچوونی من، ئەم تەحەدایە لەمڕۆدا، تەحەدایەکی گەردوونییە و ڕووبەڕووی زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگەکانی دونیا بۆتەوە، لەوانەش، کۆمەڵگەی ئێمە. ئەمڕۆکە ئەو سادەیییەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و دینی کۆمەڵگەکانی بەر لە سەدەیەک، یان تەنانەت نیوسەدە لەمەوبەر هەیانبوو، بوونی نەماوە. زۆربەی کۆمەڵگەکانی دونیا، بوونەتە کۆمەڵگەیەکی ئاڵۆزی فرەبەها و فرەویست و فرەتێگەیشتن و پڕجیاوازی. ڕێزنەگرتنی ئەم فرەیییە و چەپاندنی جیاوازییەکان لەسەر بنەمای ڕازینەبوون بە دابەشکردنی هەقیقەت لەنێوان لایەنە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا، واتە وازنەهێنان لەوەی کە بەناوی هەقیقەتێکی ڕەهاوە قسە بکرێت، جا ئەو هەقیقەتە دینی بێت یان نادینی، هەمووان ڕووبەڕووی مەترسییە گەورەکانی سەپاندنی یەک دید و یەک تێگەیشتن و یەک ڕاستی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا دەکاتەوە. ئەمەش پڕۆژەیەکی تۆتالیتاریی ترسناکە و سەدەی بیستەم شایەتێکی بەئەمەکی مەترسییە گەورە و ئاکارە بەربەرییەکانی ئەم ئەزموونە تایبەتەی سەپاندنی یەک هەقیقەتە بەسەر هەمووانندا. (٤)

یەکێک لە کێشە گەورەکانی دونیای ئێمە، بریتییە لە نائامادەگیی ئەم

دیده پلورالّییە، واتە فرەدەنگییە، بۆ ژیان و ویست و هەقیقەت. لە دونیای ئێمەدا، هەم هێزە دینییەکان و هەم هێزە نادینییەکان هێزی هەقیقەتگەران، واتە هێزگەلێکن، بە ناوی هەقیقەتێکی ڕەهاوە دەدوێن، بە ناوی هەقیقەتێکی بەموقەدەسکراوەوە، کە هیچ کەس و هێز و لایەنێک بۆی نەبێت لێی لا بدات. لەمەشدا وێنەی خۆیان وەک نوێنەر، یان دەمڕاستیی ئەو هەقیقەتە ڕەهایە، دروست دەکەن و وێنەی ئەوانی دیش وەک کەسانێک، زۆر جار وەک گومڕایەک، کە دەبێت بهێنرێنەوە سەر ڕێی ڕاست، لە ڕێی ئەوەوە گوێ لە خاوەن هەقیقەتەکان بگرن و ئەو هەقیقەتانەش بەبێ هیچ گومان و هیچ دوودڵی و هیچ پرسیار و هیچ ڕەخنە و هیچ بەرخوردێک، قبوڵ بکەن و وەر بگیرێن. ئەم دۆخە نەک تەنها ئازادیی ئینسانەکانی وێران کردووە، بەڵکوو فیکری ڕەخنەیی و ئازادییشی بە شێوەیەکی ترسناک لاواز و بێبایەخ کردووە. لێرەوە لە دونیای ئێمەدا، هەم عەلمانیەتی بێ فیکر و بێ قوڵاییمان هەیە، هەم دینسالارییەکی بێ فیکر و بێ قوڵایی. لە کەمپی عەلمانیەتدا دروشمی "دابڕانی دین لە سیاسەت" چۆتە شوێنی هەموو بیرکردنەوەیەکی تیۆری دەربارەی چۆنێتیی ڕێکخستنی دین لە کۆمەڵگەدا و دەربارەی چۆنیەتی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ جیاوازییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و سیاسییەکاندا، لە کاتێکدا لە کەمپی ئیسلامییەکاندا نیشاندانی ئیسلام وەک "چارەسەر بۆ هەموو کێشەکان" و وەک بنەمای ژیان و بنەمای شووناس و بنەمای ئەخلاق و بنەمای ڕەسانەیەتی، چووەتە شوێنی بیرکردنەوەیەکی دیموکراسییانە و کراوە لە هەریەکێک لەو مەسەلانە و لە شوێنی ئاڵۆزی دین لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا، هەروەها چووەتە شوێنی بیرکردنەوە لە ئەرک، یان وەزیفە تازەکانی دین و بیرکردنەوە لە دروستکردنی پەیوەندیی نوێ لەگەڵ پێدراوە تازەکانی ژیان، لەم سەردەمە نوێیەدا. بەم مانایە، کێشەی دین و عەلمانیەت لە کوردستاندا کورت بووەتەوە بۆ کێشەی دوو

گروپ، کە هەردووکیان بە زمانی دروشمبازی لەگەڵ یەکدا دەدوێن و هەریەکێکیان لەسەر هەوڵدان بۆ بێدەنگکردن و تاوانبارکردنی ئەوی تریان کار دەکات. (٥)

یەکێک لە کێشە سەرەکییەکانی فیکری دینی ئەوەیە، کە بەردەوام بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکان، پێ لەسەر ئەخلاق دادەگرێت. ئەخلاقیش وەک سەرزەمینی بەرهەمهێنانی کۆمەڵێک بەها و نرخی کراوە نا کە دەستنیشانی ئەوە بکەن، باشە چییە و خراپە چییە، وەک پانتاییەک نا، کە پەیوەندیی ناوەکیی ئینسان لەگەڵ خۆی و دواتر لەگەڵ دونیای دەرەوەی خۆیدا، بە شێوەیەکی ئازادانە و بەرپرسیارانە ڕێک بخات، بەڵکوو ئەخلاق وەک پیادەکردنی هەندێک ئەمر و نەهیی دینی و وەک پەیڕەوکردنی هەندێک حەلال و حەرامی دینیی پێشوەخت-دەستنیشانکراو. لێرەدا ئەخلاق کەمتر پەیوەندیی ئینسان لەگەڵ ناوەوەی خۆیدا ڕێک دەخات، کەمتر ئینسان دەکاتە کەسێکی ئازاد و بەرپرسیار، بەر لە هەموو شتێک، لە بەرامبەر خودی خۆیدا و ئینجا لە بەرامبەر ئەوانی دی و کۆمەڵگەدا، ئەوەی دەیکات، ئینسان دەکاتە پیادەکەر و پەیڕەوکەری هەندێک بەها و نرخی تایبەت، کە وەک بەها و نرخی ئەبەدی دەبینرێن و مامەڵە دەکرێن. بەکورتی ئەخلاق لێرەدا کورت کراوەتەوە بۆ پاراستنی هەندێک سنووری دەرەکی کە کۆمەڵێک حەلال لە کۆمەڵێک حەرام جیادەکاتەوە. کورت کراوەتەوە بۆ گوێگرتن لە هەندێک ئەمر و نەهی، بۆ پەیڕەوکردنی کۆمەڵێک بەها و نرخ و کۆدی ئەخلاقی دەرەکی، کە ئەم، یان ئەو کەسایەتیی دینی وەک بەهای ئەبەدی و نەمر وێنایان دەکات، بەبێ پشکنین و بێ پیاچوونەوە و بێ ڕەخنەگرتن و بێ توانای ڕەفزکردن و بێ هیچ ئەگەرێکی سەرلەنوێ-نرخاندنەوەیان. ئەخلاق لێرەدا بریتی نییە لە هەوڵدانێک بۆ دەوڵەمەندکردنی دونیای ناوەکیی ئینسان خۆی، بەڵکوو کۆمەڵێک ئەمر و فەرمایشی پاتریارکییانەی

دەرەکییە، کە دەیانەوێت شێوازێکی زۆر تایبەتی ئینسانی گوێڕایەڵ و بێئیرادە دروست بکەن. لێرەدا ئەخلاق یارمەتیی ئینسان نادات ببێتە ئینسانێکی ئازاد و بەرپرسیار، ببێت بە کەسێک، کە نە ئەوە قبول بکات ئەوانی تر کۆنترۆڵی بکەن نە خۆشی کەسانی تر کۆنترۆڵ بکات، یان ببێت بە کەسێک، بە شێوەیەکی نابەرپرسیارانە دەست وەر نەداتە ناو ژیانی کەسانی دی و کاریگەرییەکی نابەرپرسیارانە لەسەر ژیانیان بەجێ نەهێڵێت. بەپێچەوانەوە، لێرەدا ئەخلاق دەبێتە یەکێک لە ئامرازە هەرە سەرەکییەکانی کۆنترۆڵکردنی ئینسان و پەکخستنی ئیرادە و ئازادی. (٦)

ڕەهەندە سیاسییەکەی ئەم تێڕوانینە بۆ ئەخلاق، هێجگار مەترسیدارە. لەم دیدەدا بۆ ئەخلاق، ئەگەر دەسەڵاتدار باوەڕدار بوو، واتە موسڵمان بوو، نوێژ و ڕۆژووی گرت، حەجی کرد، مزگەوتی کردەوە، مەلا و پیاوانی دینیی زۆری دامەزراند، بەرنامەی دینیی لە میدیاکانی خۆیدا دانا، وتی دین دەپارێزم، گفتی دا بەها دینییە تەقلیدییەکان بەزۆر بەسەر کۆمەڵگەدا بسەپێنێت... هتد. ئەوا ئیدی بەشێکی زۆری پێداویستییە گرنگەکانی دەسەڵاتێکی سیاسیی باش و پەسەندی جێبەجێ کردووە. لێرەدا فیکری دینی دانابەزێت بۆ شیکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی وەک بەشێک لە ئەزموونی دروستبوونی هاوڵاتیی یەکسان، مافی یەکسان، ڕێزگرتنی جیاوازییەکان، ئازادکردنی بۆچوونە جیاوازەکان، توانای لێپرسینەوە لەسەر بێڕێزینواندن بەرامبەر بە ئینسان... هتد. وەک وتم ئەم دیدە، ئەخلاق بە شێوەیەکی ترسناک کورت دەکاتەوە بۆ ئەخلاقی دینی بەگشتی و لەناو ئەخلاقی دینیشیدا بۆ ئەخلاقی تایفەیەکی دینی بەتەنها، بەم کارەشی هێڵە گشتییەکانی ئەزموونێکی تۆتالیتاری دادەڕێژێت، لەباتی بە ناوی ئایدیۆلۆژیایەکی عەلمانییەوە قسە بکات، بە ناوی دینەوە قسە دەکات. لە ڕاستیدا ئەمە یەکێکە لە کێشە هەرە گەورەکانی ناو فیکری سیاسیی ئیسلامی بەدرێژاییی مێژووی فیکری سیاسی لە ئیسلامدا. لێرەدا

دین، بەتایبەتی ڕووە ئەخلاقییە دەرەکی و تەقلیدییەکانی دین، خۆی وەک ئەڵتەرناتیڤی هەموو فیکرێک و وەک چارەسەر بۆ سەرجەمی کێشەکانی سەردەمەکە، دەخاتە ڕوو.

لەو دۆخەی سەرەوەدا، گوتاری دین تەنها خۆی وەک یەکێک لە گوتارە زۆرەکانی ناو کۆمەڵگە پیشان نادات، یاخود تەنها داوای ئەوە ناکات وەک یەکێک لە گوتارەکان دانی پێدا بنرێت و ئازاد بێت و کار بکات، بەڵکوو خۆی وەک سەرچاوەی بەخشین یان سەندنەوەی شەرعیەت لە سەرجەمی گوتارەکانی دیکە نیشان ئەدات. دین دەیەوێت لە یەک کاتدا ببێتە مەرجەعی سیاسەت و مەرجەعی ئەخلاق و مەرجەعی فەرهەنگ و مەرجەعی فیکر و مەرجەعی ئەو دونیا ڕەمزییەی کە ئینسانەکان بۆ بەخشینی مانا بە بوونی تاکەکەسی و دەستەجەمعییان دروستی دەکەن. کەمتر لەمە بە لادان، یان دوورکەوتنەوە لە دین ناو دەبات. هەموو ئەمانە لە کاتێکدا بوونی هەمان دیدی گشتگیر و هەمان گوتار بۆ هیچ هێز و لایەن و دیدێکی دیکە قبوڵ ناکات. واتە ئەوە قبوڵ ناکات، هیچ فیکرێکی دیکە ببێتە مەرجەعی سیاسەت و ئەخلاق و فەرهەنگ و... هتد لەم دیدەدا، دین نایەوێت تەنها هێزێک بێت لەپاڵ هێزەکانی دیکەدا، بەڵکوو دەیەوێت هەموو هێزەکانی دیکە لەژێر ڕکێف و چاودێریی ئەمدا بژین. نایەوێت یەکێک بێت لە چارەسەرەکان، یان ڕەهەندێک بێت لە ڕەهەندە جیاوازەکانی چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکان، بەڵکوو دەیەوێت هەموو چارەسەرەکان بێت، یان لانی کەم، لۆژیکی هەموو چارەسەرەکان دەستنیشان بکات و کەس بۆی نەبێت لەو سنوورانە دەرباز بێت، کە ئەم لۆژیکە دینییە دەیکێشێت. بێگومان هەر لۆژیکێکیش بخوازێت ببێتە لۆژیکی سەرەکیی ناو هەموو ڕەهەند و کایە و مەودا کۆمەڵایەتییەکان، لۆژیکێکە لەباتی چارەسەر، کێشە و لەباتی هێمنی پێکدادان و لەباتی هاریکاری، دوژمنایەتی دروست دەکات.

دین لێرەدا، لەباتی ئەوەی ببێتە هێزێک بۆ ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتی، دەبێتە هێزێک بۆ هەڵوەشاندنەوە و پارچەپارچەبوون و پێکدادان.

ئەمڕۆ لە کوردستاندا بەهێمنی، بەڵام بە شێوەیەکی بەردەوام، جارێکی دیکە بەشێکی گرنگی بیرکردنەوەی ئازاد بەر دیوار و ڕێگرە دینییەکان دەکەوێت، سانسۆری دینی خەریکە دەبێتە شێوازی سانسۆری باڵادەست لە کوردستاندا. هێزە دینییەکان ڕۆژانە لێرە سانتیمەترێک و لەوێ سانتیمەرتێک لە درێژیی ئەم سانسۆرە گەورە دەکەن. ئاگادار نەبین، لە چەند ساڵی داهاتوودا سانسۆری دینی دەست دەنێتە بینەقاقای بڕێکی زۆری ئەو ئازادییە بچووکانەی کۆمەڵگەی ئێمە بەدرێژاییی سەدەی بیستەم بەدەستی هێناوە. ئیدی لە ئازادیی جلوبەرگپۆشینەوە بیگرە بۆ ئازادیی پێکەوەبوونی نێر و مێ و ئازادیی بیرکردنەوە و نووسین. ئەمڕۆ ئەوەی بەئازادی بیر لە دین وەک دیاردەیەکی تایبەت بکرێتەوە، بەئازادی باس لە سەرچاوەکانی پەیدابوونی دین، چۆنێتیی مانەوە و بەردەوامبوونی، چۆنێتی بڵاوبوونەوە و بەکارهێنانی بکرێت، لەدەرەوەی حیکایەتە دینییەکان خۆیاندا، کارێکی ئاسان نییە. لەپاڵ ئەمەشدا، ڕەخنە لە دین هەمیشە ڕووی دەتەقێتەوە بە ڕووی بەرگریکردنێکی دینییانەی هەڕەشەئامێزدا، کە سڵ لەوە ناکاتەوە هەموو تواناکانی دین بۆ جۆشوخرۆشدانی خەڵک لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزی میدیای هاوچەرخەوە بخاتە گەڕ بۆ بەگژداچوونی نووسەری کتێبێک، یان وتاری ناو گۆڤار و ڕۆژنامەیەک، یان بۆچوونی ناو کۆڕ و کۆبوونەوەیەک، یان بەرنامەیەکی ڕادیۆ، یان زنجیرەیەکی تەلەڤزیۆنی یان فیلمێک. بەکارهێنانی زمانی هەڕەشە و بە-کافر-و-بێدینکردن و دروستکردنی ترسێکی ناڕاست و وەهمی بەرامبەر بە لاوازبوونی دین و سووکایەتیپێکردنی، لەو ئامرازە سەرەکییانەن، کە لەم هێرشەدا بەکار دەهێنرێن. جگە لەمە، باسکردنی هەڵوەشاندنەوە و لەبەریەکترازانی کۆمەڵگە و دروستکردنی دەستەواژەی

ترسناکی لە بابەتی "ئاسایشی ئەخلاقی" و "هێرش بۆ سەر ڕەسەنایەتی" و شتی دیکەی لەم بابەتە، بووەتە بەشێک لەو زمانە ترسناکەی کە وەک ڕێگرێکی گەورە لە بەردەم بیرکردنەوەی ئازاد و تێگەیشتنێکی کراوە و دیموکراسیدا بۆ ئەخلاق، قوت کراوەتەوە. (٧)

من تەواو باوەڕم بەو بۆچوونەیە، کە پێی وایە نابێت پیادەکردنی ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی باوەڕ، بە هیچ دەق یا تێکستێکی دینی سنووردار بکرێت، بە ڕەخنەگرتن لە دین خۆشییەوە. بێگومان من دەزانم ئازادیی ڕادەربڕین و بیرکردنەوە ڕەها نیین، بەڵام سنووردارکردنی بە دین، سەرەتای دروستکردنی وێرانەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییە. چونکە هەموو ئەو هێزە دینییانەی ئەمڕۆکە دەیانەوێت ئازادیی بیرکردنەوە و ڕادەربڕین سنووردار بکەن، لە دیدێکی تەواو تۆتالیتارییەوە ئەم کارە دەکەن، لە باوەڕبوون بە موقەدەسێکەوە، کە بە مافی خۆی دەزانێت هەموو شتەکانی دیکە وەک ناموقەدەس مامەڵە بکات و گەر بۆشی کرا، بێدەنگیان بکات. ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی ویژدان شتێک نییە هیچ دینێک خۆبەخۆ بیسەلمێنێت، نە یەهودیەت، نە مەسیحیەت، نە ئیسلام، ئەم ئازادییە بە مانا هاوچەرخ و تازەکانی ناسەلمێنن. ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی ویژدان، کە یەکێک لە ماناکانیان ئازادیی بوون یان نەبوونی دینە، لە هیچ یەکێک لەو دینانەدا نەسەلمێنراوە. سەلماندنی ئازادیی ویژدان و ئازادیی بیرکردنەوە، دەسکەوتێکی ئینسانی و شارستانی نوێیە و لە زۆر شوێنیشدا لە ململانێ لەگەڵ پیاوانی دیندا و لە بەگژاچوونەوەی بۆچوونەکانی ئەواندا، یان هی ئەوانەی کە بە ناوی دینەوە قسەیان کردووە، دروست بووە. لە ڕاستیدا بوونی ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی ویژدان، زۆر جار لە دەرەوەڕا بەسەر تێگەیشتنە باڵادەستەکانی دیندا سەپێنراوە، بەڵام کە ئەم ئازادییە دروست بووە و بووە بە واقیعێکی زیندوو، ئیدی زیاد لە دیندارێکی

کراوه و ئینساندۆست سەرلەنوێ و لەژێر هاتنەکایەی ئەو ئازادییانەدا بە شێوەیەکی تازە دینیان لێک داوەتەوە، هەوڵیان داوە لە مێژووی دیندا چەندان دید و بۆچوون و تێکست بدۆزنەوە و نیشانی بدەن کە دین لەگەڵ سەلماندنی ئەو تێگەیشتنە تازەیەدایە بۆ ئازادی. ئەمە مانای ئەوە نییە کە دین ساتەوەختی گرنگ و کراوە و ئینساندۆستی تیا نەبووە و تیا نییە، مانای ئەوە نییە دید و تێگەیشتنی دینی نییە کە ڕۆڵی گرنگیان لە قووڵکردنەوەی تێگەیشتنمان بۆ ئازادی نەبینیبێت، یان وێنەی ئینسانیان وەک بوونەوەرێکی ئازاد دروست نەکردبێت. لە مێژووی دیندا ساتەوەختی لەم جۆرە دەدۆزینەوە، بەڵام ئازادیی دین و ئازادیی ویژدان بە مانا تازەکەی، ئازادییەکن بۆ هەموو بوونەوەرێک، بە دیندار و بێدینەوە، بۆ ئەوانەی باوەڕی خۆیان بە فەرمایشە دینییەکان ئەدەن و بۆ ئەوانەش کە نایدەن. بەم مانایەیە کە دەڵێم، ئازادیی ویژدان و ئازادیی بیکردنەوە دوو شێوە ئازادیی نوێن و بەرهەمی خەبات و هەوڵدانی بێئامانی ئینسانن بۆ جوانترکردن و قووڵترکردنەوەی ماناکانی ژیان و بوونی ئینسانی.

ئازادیی ویژدان و ئازادیی دەربڕین دونیای ناوەکیی ئینسانەکان فرەڕەنگ و دەوڵەمەند دەکەن، وا دەکەن ژیان و بوونی ئینسانی هەمەڕەنگ بێت، ڕێ لەوە دەگرن ئینسانەکان ببن بە کۆپیی یەکتر و هەمووان هەمان دید و هەمان ڕا و هەمان بۆچوون و هەمان بەرخوردیان هەبێت. ئەم ئازادییانە وا دەکەن ئینسانەکان ژیانی ناوەکیی خۆیان بەپێی تێگەیشتن و ئیدراک و عەقڵ و ویست و خەیاڵی خۆیان دابڕێژن، نەک هەموومان هەڵگری دەروون و ڕۆحیەتێکی ناوەکی بین، کە کۆپیی دەروون و ڕۆحیەتی ئەم یان ئەو مامۆستای دینی و ئەم یان ئەو ڕۆشنبیری دینی و ئەم یان ئەو گرووپی دینی بێت. (٨)

بە سیاسییکردنی دەروون و بە سیاسییکردنی دونیای ڕۆحی خەڵک، لە ڕێگەی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین هەوادارەوە و

بـە هـۆی کۆپیکردنـی ئـەو هەوادارانـە بـۆ دەروون و ڕۆحیەتـی سـەرکردە دینییەکانیـان، ئـەو پرۆژە ترسـناکەیە کە گروپـە نامیانڕەوەکانـی ئیسـلامی سیاسـی هەڵگرین. لێرەدا ئیمانـی دینـی دەگۆڕدرێت بـۆ ئیمانێکـی سیاسـی و ڕۆحیەتـی دینـی دەبێتـە ڕۆحیەتێکـی سیاسـی، کـە لـە هەوڵـی سـەپاندنی سیسـتمێکی کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگـی و ڕەمزیـی تایبەتدایـە بەسـەر هەمووانـدا، سیسـتمێک، تـەواو ناکـۆک بـە ئازادیـی بیرکردنـەوە و ئازادیـی ویـژدان و ئازادیـی بـوون یـان نەبوونـی دیـن.

بێگومـان من کە ئەم قسـانە دەکـەم، هەوڵـی ئەوە نـادەم تەفسـیرێکی دین بەسـەر تەفسـیرەکانی دیکەیدا باڵادەسـت بێت، من تەواو لەگەڵ ئـەو ڕایەدام کـە کاری عەلمانییـەکان ئـەوە نییـە هـەوڵ بـدەن تەفسـیرێکی تایبەتیـی دین بەسـەر تەفسـیرەکانی دیکـەیدا زاڵ بکـەن، کاری من ئەوە نییـە تەفسـیرێکی تایبەتیی ئیسـلام وەر بگرم، یان بهێنم و بڵێم ئەمـە تەفسـیری ڕاسـتەقینەی ئیسـلامە و ئەوانـی تـر هەموویـان هەڵـەن. ئەمەیـان دووبارەکردنـەوەی هەمـان ئـەو لۆژیکـە دینییەیـە، کـە بـە نـاوی "فیرقـەی فریادڕەسـەوە" کار دەکات. کاری مـن ئـەوەی بەرگـری لـە ئازادیـی بیرکردنـەوە و ئازادیـی ویـژدان بکـەم، بـە ئازادیـی ئەوانـەوە، کـە دینیـان هەیـە و ئەوانـەش کـە دینیـان نییـە، ئەوانـەی دەیانەوێـت ژیانیـان لەگـەڵ داواکارییەکانـی دینـدا ڕێـک بخـەن و ئەوانـەش کـە نایەنەوێـت هیـچ پەیوەندییەکیـان بـە دینـەوە هەبێت. بێگومـان مـن پشـتی هەمـوو تەفسـیرێکی دینی دەگرم، کـە لەگـەڵ گەورەکردنـی پانتاییەکانـی ئـازادی و ڕووبـەری بەختـەوەری و هێمنیـی ناوەکیـی ئینسـان و ڕێزگرتنـی جیـاوازی لـە کۆمەڵگـەدا بێـت و هـەوڵ بـدات ئـەم پانتاییانـە بـەردەوام گـەورە بـکات. بـەڵام وەک وتـم، ئـەم لەگەڵدابـوون و پشـتگیرییە مانـای ئـەوە نییـە مـن ئـەم یـان ئـەو تەفسـیری دینـی بـە تەفسـیری ڕاسـتەقینە بزانـم، ئەمەیـان جەنگێکـی ڕەمزییـە، هێـزە دینییـەکان لەنـاو خۆیانـدا و لەگـەڵ یەکدیـدا دەیکـەن. ئـەم بەرخـوردە دینییـە گـەر بەهێمنـی و

بێ تەکفیر و بێدینکردنی یەکدی ڕوو بدات، کاریگەریی گەورەی دەبێت لەسەر فراوانبوونی پانتاییی ئازادی لە ولاتی ئێمەدا. من وەک کەسێکی عەلمانی هەمیشە تەماشای دەرەنجامەکانی ئەم جەنگە دینییە ڕەمزییە دەکەم بۆ گەورەکردن یان بچووککردنەوەی ئەگەرەکانی پێکەوەژیانی کۆمەلایەتی و بۆ گەورەکردن، یان بچوککردنەوەی ئەگەرەکانی ئازادی و بۆ گەورەکردن، یان بچوککردنەوەی ڕێزگرتن لە کەرامەتی ئینسانی. بێگومان هەمیشە لەگەڵ ئەو لێکدانەوە و تەفسیرانەدا ئەبم، کە توانای پێکەوەژیان و توانای ئازادی و ڕێزگرتن لە کەرامەتی ئینسانی دەپارێزن. لە ڕاستیدا ئەوەی من لە جەنگی تەفسیرە دینییەکاندا بەلامەوە گرنگە، ئەوە نییە کامیان ڕاستە و کامیان ناڕاستە، لە سەرەتاشەوە باوەڕم بە بوونی یەک تەفسیری ڕاستەقینە بۆ هیچ تێکستێکی دینی یان ئەدەبی یان هونەری نییە، پێم وایە هەمیشە ئەگەری زیاد لە تەفسیرێک بۆ تێکستەکان هەیە و ئەم تەفیسرانەش پەیوەندییان بە ململانێی سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگییەوە هەیە، نەک بە توانای دۆزینەوەی هەقیقەتەوە. دەڵێم من خودی تەفسیرەکانم بەلاوە گرنگ نییە، ئەوەی بەلامەوە گرنگە، ڕادەی کرانەوە و ئینسان و ژیاندۆستی و دیموکراسیبوونی ئەو تەفسیرانەیە. پرسیاری من ئەوەیە، ئایا ئەو تەفسیرانە ژیان جوانتر و فرەڕەنگتر و دەوڵەمەندتر و کراوەتر دەکەن، یان دین بۆ ئەوەی هەموومان بکەن بە کۆپیی یەکتری و بە کۆیلەی ئەم یان ئەو لێکدانەوەی دینی؟ ئایا ئەو لێکدانەوانە ئینسان وەک بوونەوەرێکی گوناهبار وێنا دەکەن، یان وەک بوونەوەرێکی ئازاد؟ ئەمانە پرسیارەکانی منن وەک نووسەر، یان ڕۆشنبیرێکی عەلمانی.

من لێرەدا حەز دەکەم دوو مەسەلەی گرنگ لە یەکدی جیا بکەمەوە، کە بریتین لە جیاکردنەوەی "ڕیفۆرمی دینی" لە "ڕۆشنگەریی". ڕیفۆرمی دینی شتێکە لەناو کایەی دین خۆیدا ڕوو دەدات و بە پلەی

یەکەم کەسایەتییە دینییەکان پێی هەڵدەستن، واتە ئیشی ئەوانەیە، کە ماکس ڤێبەر ناویان دەنێت "فەرمانبەرانی کاروباری موقەدەس،" لە کاتێکدا ڕۆشنگەری پرۆژەیەکی فیکری و فەرهەنگی بەرفراوانە و ئەرکی ڕۆشنبیرانە بە مانا فراوانەکەی، کە پێی هەستن. بێگومان ڕۆشنگەری کورت ناکرێتەوە بۆ قسەکردنی ئازاد و عەقلانی لەسەر دین بەتەنها، ڕۆشنگەری لە داواکردنی بەکارهێنانی سەربەخۆی عەقڵەوە دەست پێ دەکات، دەیەوێت ئینسان عەقڵی خۆی بە شێوەیەکی سەربەخۆ و لە دەرەوەی داخوازییە پێشوەختەکانی دین و نادین و غەیب و ستەمدا بخاتە کار. ڕۆشنگەری داوای ئازادیی عەقڵ و ئازادیی ویژدان دەکات، داوای ئەوە دەکات، عەقڵ لە هەموو بوارەکاندا ئازاد بێت، ڕێگرە دەرەکییەکان نەتوانن بە ناوی هیچ شتێکەوە سنووری بۆ بکێشن، جا ئەو ڕێگرانە دینی بن یان سیاسیی، فەرهەنگیی یان کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی بن یان ڕەمزی. (٩)

لە کاتێکدا "ڕیفۆرمی دینی" سەرلەنوێ-ڕێکخستنەوەی کایەی دین و سەرلەنوێ-دەستنیشانکردنەوەی مانای تێکست و مانای سروشە دینییەکانە، بەو شێوەیەی ڕیفۆرمیستە دینییەکان بە ڕاستی دەزانن، زۆر جاریش ئەم ڕیفۆرمە خۆی لە خۆڕزگارکردنی دیندا دەبینێتەوە، لەو خڵتە و ناشیرینییانەی لە مێژوودا تێکەڵاوی بوون. ڕیفۆرمی دینی لە دونیای ئیسلامدا لە سەدەی نۆزدەهەمدا ڕیفۆرمێک بوو، کە دەیویست ئیسلام لە عەقڵ و لە عەقڵانیەتی هاوچەرخ نزیک بکاتەوە و بیکات بە بەشێک لەو دونیا تازەیەی لەو سەدەیەدا دروست دەبوو. بە بۆچوونی من، ئەرکی ڕیفۆرمی دینی لەمڕۆدا ئەوەیە، ئیسلام و مافەکانی مرۆڤ و ئیسلام و ئازادی و ئیسلام و عەلمانیەت، ئیسلام و دیموکراسیەت و ئیسلام و ڕێزگرتنی یەکسانی نێر و مێ و ئیسلام و سەلماندنی مافی یەکسان بۆ ژن و پیاو، بە یەکەوە کۆ بکاتەوە.

ئـەوەی وا دەکات "ڕیفۆرمـی دینـی" قابیلـی پیادەکـردن بێت، وابەستەی ئـەو ڕاسـتییەی کـە دیـن یـەک ناوەڕۆکـی نییـە، یـەک مانـایٔ دەرەوەی کات و دەرەوەی شـوێنی نییـە، موقەدەسـێک نییـە لـە هەمـوو سـەردەم و شوێنەکاندا بـە هەمـان مانـاوە ئامـادە بێت. ناوەڕۆکـی دیـن لـە ساتەوەختە مێژووییـە جیاوازەکانـدا ناوەڕۆکێکـە ئـەو هێزانـە دەستنیشـانی دەکـەن، کـە دیـن تەفسـیر دەکـەن، ناوەڕۆکـە دینییـەکان بریتییـە لـەو مانایانـەی کۆمەڵگـە لـە ساتەوەختێکی مێژووییدا بـە دینـی دەبەخشـێت. بـە گۆڕینـی ئـەو ساتەوەختانە و بـە گۆڕینـی سـەردەمەکان و ئینسـانەکان، ماناکانی دینیش گۆڕانیـان بەسـەردا دێت. ڕیفۆرمـی دینـی مانـای ئـەوەی کۆمەڵێک مانـا بـە دیـن ببەخشـرێت، کـە بکرێـت لەگـەڵ داخوازییـە سـەرەکییەکانی ئینسـان و چاوەڕوانییـە گەورەکانیـدا لـە ئێسـتادا بگونجێت.

ئەم کتێبـە، کتێبێکـە دەربارەی دیـن لەمڕۆکـەی کوردسـتاندا، لـە ڕاستیدا کتێبێکـە دەربارەی دەرکەوتـە خراپەکانـی دیـن لەمڕۆکـەی کوردسـتاندا. واتـە کتێبێکـە دەربـارەی ئـەو دەرکەوتانـەی دیـن، کـە ژیانـی ئینسـانی ئێمـە لـە سـەرەتاکانی سـەدەی بیسـتویەکەمدا لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە هـەژار دەکـەن. بێگومـان دەرکەوتـی دیکـەی دیـن لەمڕۆکـەی کۆمەڵگـەی ئێمـەدا هـەن، کـە ڕۆڵـی گرنـگ دەبینـن لـە زیادکردنـی ڕۆحـی هاریکاریـی کۆمەڵایەتـی و زیادکردنـی لێبووردەیـی و زیادکردنـی بـڕی بەختەوەریـی ئینسـانی ئێمـەدا. ئەم دەرکەوتانـەی دیـن، دەرکەوتەکانیەتـی لـە دڵـی ئیمانـدارە سادەکاندا، لـە دڵـی دراوسـێکاندا لەگـەڵ یەکدا، لـە دڵـی ئەوانـەدا، کـە بەدوای هاریکاریـی هەژارانـەوەن، لـە دڵـی ئەوانـەدا، کـە خۆیـان بـە بەرپرسـیار دەزانـن بەرامبـەر بـە زیادکردنـی بـڕی بەختەوەریـی ئینسـان لـەو وڵاتـەدا، یـان لـە دڵـی ئەوانەدا، کـە ئیمـان وەک بەشـێکی گرنـگ لـە بـوون بـە ئینسـانێکی کـراوە و لێبووردە دەبینـن. ئـەم دەرکەوتانـەی دیـن لـەم کتێبـەدا قسـەیان لەسـەر نەکـراوە، ئـەم دەرکەوتـە جوانانـەی دیـن کەمتـر پێویسـتیان بـە قسـەلەسـەرکردن هەیـە،

چونکە ئەمانە کێشەیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ئینسان و لەگەڵ ژیان و لەگەڵ بەختەوەریدا نییە. لەگەڵ ئەو چاوەڕوانی و خۆزگە و ویست و جیهانبینییانەشدا گونجاون، کە دونیای ئەمڕۆ دەکەن بە دونیایەکی کراوە و هێمن و کەمفشار و ئازاد.

ئەم کتێبە بریتییە لە کۆکردنەوەی بڕێک لەو نووسینانەی من لە چەند ساڵی ڕابردوودا لەسەر دین نووسیومن و بڵاوم کردوونەتەوە، بەتایبەتی لە هەردوو ڕۆژنامەی هاوولاتی و ئاوێنەدا. من خۆم بڕێکی زۆری ئەو نووسینانە کە لە شێوەی ستوونی ڕۆژنامەگەریدا بڵاو بوونەتەوە، وەک جۆرێک لە ئەزموونی بیرکردنەوەی خێرا یان مەشقی فیکری وێنا دەکەم. زۆربەیان هەوڵدانن بۆ پێشنیارکردنی جیهانبینییەکی نوێ، بۆ شێوازێکی نوێی بەرخوردکردن و تێڕامان و خوێندنەوە. لە دیدی منەوە، ئەوەی بە پلەی یەکەم لەو نووسینانەدا گرنگە، چۆنێتیی نیشتەجێکردنی کێشەکانە لەناو مێژوو و لەناو ئەو چوارچێوە فیکرییانەدا، کە لەم ساڵانەی دواییدا بەکارم هێناون بۆ خوێندنەوەی بڕێک لە دیاردە گرنگەکانی ناو دونیای ئێمە. لەپێش هەمووانیشەوە، نیشتەجێکردنی دیاردەکان لەناو ڕەوتە مێژووییە تایبەتەکانی خۆیاندا و بەستنەوەیان بە پەیوەندییەکی دەسەڵات و بە پەیوەندییەکانی ماناوە، کە بەردەوام لە دۆخی گۆڕان و ململانێیەکی بەردەوامدان. ئەم دەسپێکەیە وای کردووە نووسینەکان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان هەبێت بەو ڕووداوانەوە، کە لە واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دینیی ئەم ساڵانەی دوایی دونیای ئێمەدا، ڕوویان داوە، بەڵام لە هەمان کاتدا، هەڵگری دیدێکی فیکری و شێوازێکی تایبەتیی بیرکردنەوەن، کە تیایاندا تێکەڵبوونی مێژوو و بە دەسەڵات و تێکەڵبوونی دەسەڵات بە مەعریفە، ڕۆڵێکی گەورە دەبینن. لە هەموو ئەو دۆخانەشدا، پێشنیارکردنی دیدێکی ڕەخنەیی و گۆڕانخواز و تازەگەر، خەمی سەرەکی بووە.

دواهەمین خاڵ بمەوێت لێرەدا هێمایەکی خێرای بۆ بکەم، ئەم ڕاستییەیە: ئەوەی خوێنەر لێرەدا دەیخوێنێتەوە، کەمێک جیاوازە لەوەی کە دەشێت پێشتر لە ڕۆژنامەی هاوولاتی و ئاوێنەدا خوێندبێتیەوە. لەم کتێبەدا، هەوڵم داوە نەک تەنها هەڵەی زمانەوانی و لاوازی لە داڕشتنی هەندێک بڕگە و پەرەگرافدا دەسکاری بکەم و سەرلەنوێ دایانبڕێژمەوە، بەڵکوو هەندێک جار و لە هەندێک شوێندا چەند ڕستەیەکم زیاد کردووە، بۆ ئەوەی ئەو بیرۆکەیەی کە باسم کردووە، ڕوونتر و وردتر و ئاشکراتر نیشان بدەم.

هیوادارم ئەم کتێبە بتوانێت بەشدار بێت لە پرۆسەی لاوازکردنی فاناتیزم و پەڕگیریی دینیدا و لە بەهێزکردنی پرۆسەی بەئینسانیکردنی زیاتری دین و لە زیادکردنی ڕێز و بەهادا بۆ ئینسانی ئێمە، بەتایبەتی لە ڕۆژگارێکدا، کە پڕە لە گۆڕانی گەورە و لەپڕ و چاوەڕواننەکراو. هیواداریشم هەموو ئەوانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوە، وەک هەوڵدانێک بۆ دیالۆگێکی کراوە لەسەر شێوازەکانی دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا وێنای بکەن، نەک وەک هەوڵێک بۆ هێرش، یان بریندارکردنی هەستی دینیی هیچ کەس و لایەن و گروپێک.

ئەم کتێبە نیاز و مەبەستی نییە هەستی دینیی هیچ کەس و لایەنێک بریندار بکات، بەڵام ناشیەوێت بێدەنگ بێت لەو شێوازە نالەبارانەی دین، کە هەستی ئینسانبوونی ئینسان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بە شێوەیەکی بەردەوام بریندار دەکەن.

# سەرچاوەکان

1- C. Stephen Evans (1982). Philosophy of religion. Thinking about faith. Inter Varsity Press.

2- Alan Aldridge (2000 ). Religion in the Contemporary World: A Sociological Introduction. Cambridge, UK. Polity Press.

3- Jurgen Habermas (2008). Between naturalism and religion. Polity Press.

٤- مەریوان وریا قانیع (٢٠٠٢). دەربارەی فەلسەفە و ئیسلام و ڕۆشنگەری. لە بڵاوکراوەکانی نێوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی.

٥- مەریوان وریا قانیع. لەنێوان مۆدێرنە و ئیسلامی سیاسیدا. گۆڤاری ڕەهەند. لە بڵاوکراوەکانی نێوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی.

6- Mary Candace Moore (1987). Ethical discourse and Foucault's conception of ethics. Human Studies. Volume 10, Number 1 / March, 1987.

7- Aziz Al-Azmeh (1991). Islamist Revivalism and western ideologies. History Workshop Journal 1991 32(1): 44-53; Oxford University Press.

8- J. S. Mill (1998). On liberty and other essays. Oxford paperbacks.

ئیسلامی سیاسی لە هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا، دوو جۆر بووە. یەکەمیان "دینی میللی،" کە بەرهەمی کارلێکردنی چەندجەمسەرەی دینە لەگەڵ کەلەپوور و بەها و خوو و ڕەوشتی کۆمەڵایەتیی ناوچەییدا. ئەمەش وای کردووە دەرکەوتەکانی دینی میللی لە دونیای کۆمەڵایەتیی ئێمەدا دەرکەوتی پلورال بن، بەپێی ناوچە و چین و توێژی کۆمەڵایەتی و بەپێی شارنشینی و گوندنشینی و خوێندەواری و نەخوێندەواری جیاواز بێت. ڕەنگە ئاکاری سەرەکیی ئەم دینە میللییە، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بریتی بێت لە پێداگرتن لەسەر هاریکاریی کۆمەڵایەتی و بەدەمیەکەوەچوون و پاڵپشتیکردن و پەناگەبەخشین بە لێقەوماوان. لە ڕووی بیروبۆچوون و عەقیدە و باوەڕیشەوە، تێکەڵێکە لە کۆمەڵێک ئامۆژگاری و گێڕانەوە و سەرگوزەشتەی دینی.

شێوازی دووهەمی دین کە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ئامادە بووە، "دینی ڕێکخراو" بووە، بەتایبەتی دینی ناو تەریقەتە سوفییەکان و ناو قوتابخانە و فێرگە دینییە جیاوازەکان لە کوردستاندا. بەدرێژاییی چەندان سەدە، ئەم شێوازە لە دین شێوازی باڵادەستیی دینیی ڕێکخراو بووە لە کوردستاندا و خاوەنی تۆڕێکی گەورە لە مزگەوت و فێرگەی دینی و تەکیە و خانەقا بووە، کە لە زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی ئێمەدا ئامادە بوون. سوفیزم خۆشی دینێکی ڕێکخراوی پلورال بووە و لە کوردستان زیاد لە تەریقەتێکی دینی و زیاد لە ڕێبازێکی سوفیزم ئامادە بووە. ئەم ڕێبازانە هەندێک جار لە دۆخی ململانێکردنی یەکتردا بوون و هەندێک جاریش بەئاشتی لەپاڵ یەکدا ژیاون، بەشێکیان چالاکانە بەشدار بوون لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیی میلەتی ئێمەدا و لەم ڕووەوە ڕۆڵی بەرچاو و گرنگیان لەو بزوتنەوەیەدا بینیوە، هەندێکی تریان گەر دژایەتی ئەو بزوتنەوەیەشیان نەکردبێت، ئەوا بێلایەن بوون و وەک ئەوەی بوونی نەبووبێت، جووڵاونەتەوە و مامەڵەیان کردووە.

## سەلەفیەت و نەوت، سەلەفیەت و سیاسەتی ئەمەریکا

وەک وتم، سەلەفیەت لە کۆمەڵگەی ئێمەدا مێژووی نییە، شانی دانەداوەتە سەر هیچ ڕەوت و کەلەپوورێکی دینیی ناوەکی لە کوردستاندا، نەک هەر ئەمە، بەڵکوو بەشێک لە نووسینەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە سەدەی نۆزدەهەمدا دژ بە ڕێبازی وەهابیزم نووسراوە، کە لە سەرەتای سەدەکەدا پەلاماری عێراقی داوە و هەڕەشەی لە شێوازەکانی تری ئامادەگیی ئیسلام لە ناوچەکەدا کردووە. ئیسلامی سەلەفی لە کوردستاندا گواستنەوە و کۆپیکردنێکی تازە و هاوچەرخی ئیسلامی وەهابیی سعودییە، بەشێکە لەو "پرۆسەی بەوەهابیکردنەی ئیسلام"، کە لەدوای شۆڕشی ئیسلامیی ئێرانەوە و لە ململانێیدا لەگەڵ ئێراندا، بە ناوچەکەدا بڵاو بۆتەوە. وەک لە شوێنێکی دیکەدا نووسیومە، ئەم بڵاوبوونەوەیەی ئیسلامی وەهابیی سەلەفی بە ناوچەکەدا، پەیوەندیی بە توانا دارایی و نەوتییەکەی سعودییەوە هەیە. ئەو دەستەواژەیەی لە زانستە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکاندا بۆ تێکەڵبوونی ئیسلامی سەلەفیی وەهابی بە پارەی نەوت بەکار دەهێنرێت، دەستەواژەی "پێترۆ ئیسلامە" Petro-Islam، پێترۆ لە پێترۆڵەوە (٢). لە ڕووی مێژووییەوە ڕەگەکانی تێکەڵبوونی پارەی نەوت بە ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەم، ئەودەم پادشای سعودیە لەگەڵ سەرۆکی ئەمەریکادا ڕێککەوتنێک ئیمزا دەکات، بەپێی ئەم ڕێککەوتنە، سعودیە نەوتەکەی بە ئەمەریکا دەفرۆشێت و ئەمەریکاش شانشینەکەی سعودیە لە هەموو هەڕەشەیەکی دەرەکی و ناوەکی دەپارێزێت. کێشەکە لەوەدایە، ئەو ئیسلامەی تێکەڵ بە پارەی نەوت و بە سیاسەتی ئەمەریکا لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبێت، ئیسلامی خەڵکە سادەکە و ئیسلامی خوێندەوارە دینییەکان و ئیسلامی سوفییەکان و ئیسلامی هێزە

عەقڵانییەکان و ئیسلامی فەیلەسوف و نووسەران و شاعیرەکان نییە، بەڵکوو ئیسلامی مناڵەکانی محەمەدی کوڕی عەبدولوەهابە، ئەو ئیسلامە سەلەفییەیە، کە لە سعودیەدا یەکێکە لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی پاراستنی سیستمە سوڵتانییە ستەمکەرەکەی سعودیە و لە دەرەوەشدا ئامرازێکی بەهێزی دەستی ئەو وڵاتەیە بۆ دروستکردنی پێگەیەکی بەهێز بۆخۆی لە ناوچەکەدا (٣).

تێکەڵبوونی ستراتیژیەتەکانی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا بە پرۆژەی پاراستن و بەهێزکردنی "سوڵتانیزمی سیاسی"ی سعودی ئەو ڕووبەرەیە، کە ئیسلامی وەهابیی سەلەفی بەدرێژاییی مێژووی سالانی هەشتا و نەوەدی سەدەی بیستەم و دەیەی یەکەم و دووهەمی ئەم سەدەیە کاری تێدا کردووە. لە سالانی شەست و هەفتادا، شتێک لەم ناوچەیەدا بە ناوی هێزی "چەپ" و "نیمچەچەپ" و "هێزی ڕاسترەویی نادینیی ناسیۆنالیستی" و "سۆسیالیستی" و "پێشکەوتنخواز" و "مۆدێرنیست" و "عەلمانی" لەم ناوچەیەدا هەبوو، کە وەک ڕێگر لە بەردەم پرۆژە وەهابییە سەلەفییەکەی سعودییە و لە بەردەم کاریگەرییە وێرانکەر و شێوێنەرەکانی تێکەڵبوونی وەهابیزم و بە دۆلاری نەوت، کاری دەکرد. لە دونیای عەرەبیدا، ململانێی نێوان "ناسریزم" و "وەهابیزم"، دیارترین دەرکەوتی ئەم ڕێگرە بوو لە بەردەم بڵاوبوونەوەی ئیسلامی سعودیدا. لەدوای بەرپابوونی شۆڕشی ئێرانی و هاتنی خومەینی لە ساڵی ١٩٧٩دا بە ناوی "ئیسلامێکی شۆڕشگێڕ"ەوە، کە تەماحی گۆڕینی ناوچەکە و هەموو دونیای هەبوو، شتێک بە ناوی پرۆژەی چەپ و نیمچەچەپ، یان پرۆژەی ڕاسترەویی عەلمانی لەم ناوچەیەدا نامێنێتەوە و ململانێی سەرەکییەکە دەکەوێتە نێوان "ئیسلامی خومەینی" و "ئیسلامی ئال سعود"ەوە. لەم ململانێیەدا هەم دۆلارەکانی نەوتی ئێرانی و هەم دۆلارەکانی نەوتی سعودیە بە ڕادەیەکی گەورە تێکەڵ بە ئیسلامی ناوچەکە دەبن و دەیەها

ڕێگە دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی کاریگەرییەکانی خۆیان لەسەر دەرکەوتە سیاسی و کۆمەلایەتی و دینییەکانی ناوچەکە بەجێ بهێلن. هەر لەم ماوەیەدا دۆلاری شێخنشینە نەوتییەکانی تری خەلیج دێنە ناو گەمەکەوە و ململانێکە توندترو خەستتر دەکەنەوە. ئەم هێزانە نەک تەنها بە دەیان گروپی ئیسلامیی سەلەفی و گروپی شیعیی جیاواز لە ناوچەکەدا بەهێز دەکەن، بەتایبەتی لە فۆرمی دروستکردنی گروپی خێرخوازی و مزگەوت و سێنتەری دینیدا، بەڵکوو ئیمپراتۆریەتێکی میدیاییی گەورەش دروست دەکەن، کە وەک ئامرازێکی سەرەکیی بلاوکردنەوەی ئیسلامی سەلەفی و ئیسلامی ئێرانیی شیعی بە ناوچەکەدا کار دەکەن. لە کۆتاییی هەفتاکانەوە ئەم ئیمپراتۆریەتە دینییە گەورەیە لە دۆخی جەنگێکی دەستەویەخەدایە لەگەڵ هەموو ئەو شێوازانەی تری دیندا کە سەر بەو شێوازە لە دین نین، کە سەلەفیەتی سعودی و خومەینیزیمی ئێرانی نوێنەرایەتیی دەکەن. ئەمە جگە لە بەگژاچوونەوەی هەموو ئەو شێوازانەی ژیانی کۆمەلایەتی و فەرهەنگی، کە نادینین. بەهێزبوونی گروپە شیعییەکان و بەهێزبوونی ئیسلامی سەلەفی لە ناوچەکەدا، بەرهەمێکی ڕاستەوخۆی ئەم ململانێ سیاسییەی نێوان ڕژێمەکەی خومەینی و ڕژێمەکەی ئال سعودە.

بەکورتی، کاریگەرییەکانی نەوتی سعودی و خەلیجی و نەوتی ئێرانی لەسەر ژیانی دینی و نادینی لەم ناوچەیەدا، کاریگەریی هێجگار نێگەتیڤ و شێوێنەرن، بەدرێژاییی سالانێکی درێژ ئەم دوو شێوازە لە ئیسلام قەلەو دەکرێن، کە تەواو دژەفیکر و دژەعەقل و دژەبیرکردنەوە و دژەئافرەت و دژەپێشکەوتن و دژەکرانەوە و دژەپلورالیزم و دژەڕۆشنبیر و دژەجوانی و دژەپێکەوەبوونێکی کۆمەلایەتیی هێمن و کراوەن. ئەم ئیسلامە تێکەلبووە بە پارەی نەوت، لە شوێنێکی وەک سعودیەدا بووەتە هۆی دروستبوونی یەکێک لە بەرخۆرترین و بێئیشترین و تەمەلترین کۆمەلگەکانی ناوچەکە، لە چوارچێوەی سیستمێکی سولتانیی تەواو داخراو و گەندەلکار و

کۆنەپارێزدا. ئیسلامی وەهابیی سعودی، ئیسلامێکی بەدەوی، خێڵەکی، بێڕۆح و بێقوڵاییە، لەسەر وێناکردنێکی هێجگار سادە و دۆگماییی دین و لەسەر وێنەیەکی تەواو ترسناکی خودا دروست بووە. ئەو خودایەی سەلەفیەتی وەهابی دروستی کردووە، ڕێک وەک ئەو "پۆلیسی ئەخلاق"ە وایە، کە لەسەر شەقامی شارە گەورەکانی سعودیە داخلەدڵانە بەدوای هەموو ئەو گەنجانەوەیە، کە بەدڵی ئەوان ناجووڵێنەوە. خودای ئەمانە ڕێک لەسەر وێنەی ئەو جیهازە پۆلیسییە دروست کراوە، کە لە سعودیەدا ئامرازی چاودێریکردن و دیسپلینکردنی هەموانە، دین خۆیشی وەک ئەو تێڵایەی لێ کراوە، کە پۆلیسەکانی ئەخلاق بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگە هەڵیان گرتووە. ئیسلامی سعودی وێنەیەکی هێجگار سادە و ترسناکیشی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگە و نێر و مێ هەیە، هەموو ئەمانە بوونەوەری گوناهبار و تاوانبارن و ئیشی دین ئەوەیە لەو گوناە و تاوانە گریمانکراوانە پاکیان بکاتەوە.

لە سی ساڵی ڕابردوودا ئەم مۆدێلە ترسناکەی ئیسلامی سعودی، لە فۆرمی دەیان شێواز لە سەلەفیەتی دینیدا، بە دونیادا بڵاو کراوەتەوە. وەک پێشتریش وتمان، هێزی پشتی ئەم بڵاوبوونەوەیە پارەی زەبەلاحی نەوتە. نەوت لێرەدا لەباتی ئەوەی هێزێک بێت بۆ بووونیادنانی کۆمەڵگە و دونیایەکی بەختەوەر، گۆڕاوە بۆ ئامرازێکی گەورەی کۆنترۆڵکردن بەدەست نوخبەیەکی سیاسیی سوڵتانیی داخراوی ستەمگەر و بەدەست نوخبەیەکی دینیی پاشکۆ و گوێڕایەڵ و دواکەوتووەوە. یەکێک لە نەخۆشییە گەورەکانی ئەم ناوچەیە، ئەم تێکەڵبوونە ترسناکەی ئابووریی نەوتە بە ئیسلامێکی دواکەوتوو و بەدەوییانە، ئیسلامێک، تووشی هیستریا و پەرگیرییەکی بێوێنە بووە لە هەموو شتێک لە خۆی ناچێت و وێنەی کافرێک لە هەموو مرۆڤێکی ناوەهابی و ناسەلەفیدا دەبینێت. ئەوەی ئەم نوخبە دینییە وەهابییە ئەنجامی داوە، دابڕانی دینە لە

هەموو دەسکەوتەکانی فیکری هاوچەرخ و لە هەموو تەوژمە کراوە و عەقڵانییەکانی ناو ئیسلام خۆی و لە هەموو ئەو ڕەهەندە مەدەنییانە، کە دەتوانێت بە مرۆڤ جگە لەشووناسی دینی، چەندان شووناسی دیکەش ببەخشێت، کە بەسەریەکەوە کاریان دەوڵەمەندکردنی ژیانی تاکەکەسی و دەستەجەمعییە. ئەم دیدە سەلەفییە وەهابییە، دیدێکە بەدیار چەند کتێب و فەتوا و حەدیس و ئایەتێکی کەمەوە دانیشتووە و دەیەوێت هەموو مێژووی مرۆڤایەتی لەناو ئەو چەند دێڕ و لاپەڕە کەمانەدا دیل بکات. نەوت هێزی سەرەکیی سەپاندنی ئەم دیدە ترسناکەیە.

بەکورتی، ئیسلامی وەهابی، چ وەک بیروبۆچوون و باوەڕی دینی، چ وەک هەڵسوکەوت و ئەخلاقی دینی، بەشێک نییە لە مێژووی دین لە دونیای ئێمەی بەر لە سالانی نەوەدی سەدەی بیستەمدا. بەدرێژاییی مێژوو، ناوە سەرەکییەکانی ئەم شێوازە لە بیرکردنەوەی سەلەفییانە ئامادەگییەکی فیکرییان لە کوردستاندا نەبووە، نە ئیبن تیمیە، نە ئیبن قەیوم، نە محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب، هیچیان بەشێک نەبوون لە کەلەپووری دینی و لە قوتابخانە و فێرگە دینییەکانی دونیای ئێمە و ئەو تەوژمە دینییانەی لە کوردستاندا ئامادە بوون لە زۆر ڕووەوە ناکۆک بوون بەم هێڵە سەلەفییەی ناو ئیسلام.

## ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا

کە ئیسلامی سیاسیش لە کوردستاندا دروست دەبێت، کەمتر ئیسلامێکی سەلەفی و زیاتر ئیسلامێکی ئیخوانی و "قوتب"ی بووە، مەبەستم لە "قوتب"ی سەید قوتبە. وەک پێشتر هێمام پێ کرد، بەرپابوونی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراندا، ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە مەسەلەی "بەشۆڕشگێڕکردنی ئیسلام" لە ناوچەکەدا. جگە لەمە، لە نەوەداکاندا

چەندان گروپی سەلەفیی جیهادیی تازە دروست دەبن، کە ئەندامەکانیان لە شەڕی "موجاهیدەکان"ی ئەفگانستاندا بەشدار بوون و ئەزموونی ئەفگانستان ئەو مۆدێلەیە، کە دەیانەوێت لە ناوچەکەدا دای بمەزرێنن و بیخەنە گەڕ. ئەم کردەی لاساییکردنەوەیەی ئەزموونی موجاهیدەکانی ئەفگانستان، سەرتای ڕاستەقینەی هاتنی سەلەفیەتە لە فۆرمە جیهادییەکەیدا بۆ کوردستان. ئیسلامی سیاسی لە سەرەتای نەوەدەکاندا لە کوردستاندا دیاردەیەکی پەراوێزی و لاواز بوو. کۆی ئەو دەنگانەی ئیسلامییەکان لە یەکەمین هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا لە ساڵی ١٩٩١دا هێنایان، ٤٩١٠٨ دەنگ بوو، کە دەیکردە نزیکەی ٥٪ سەرجەمی دەنگدەران لە کوردستاندا (٤). ئەم لاوازییە یەکێک لەو هۆکارانە بوو، کە بووە هۆی دروستبوونی چەندان گروپی ڕادیکاڵ، کە ئەزموونی جیهادکردنی ئەفگانستانیان هەبوو، لەوانەش، گروپی "حەماس" لەژێر سەرکردایەتیی عومەر بازیانی و گروپی "تەوحید" لەژێر سەرکردایەتیی ئەبوبەکر هەولێریدا. هەردوو گروپەکە لەژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژیای ئەلقاعیدەدا بوون و ئەو ئیسلامەی پڕوپەگەندەیان بۆ دەکرد، ئەو ئیسلامە سعودییە جیهادییەیە، کە بە ناوی "سەلەفیی جیهادی"یەوە لە ئەفگانستاندا ئامادە بوو. دواتر لە ساڵی ٢٠٠١دا گروپێکی سەلەفیی تر لەژێر سەرکردایەتیی عەلی باپیردا لە "بزوتنەوەی ئیسلامی" جیا دەبێتەوە و "کۆمەڵەی ئیسلامی" دروست دەکەن، لە هەمان ساڵدا گروپی تەوحید و حەماس لەژێر سەرکردایەتیی عەبدوڵڵای شافعیدا یەک دەگرن و ڕێکخراوی "جوندول ئیسلام" دروست دەکەن و لە ناوچەی هەوراماندا ئەو شێوازە لە دەسەڵاتداریتیی دینی پیادە دەکەن، کە کۆپییەکی تەواوی ئەزموونی تاڵیبان بوو لە ئەفگانستاندا. بەڵام لەدوای هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەر و بەرپابوونی جەنگی ئەمەریکا دژ بە ڕژێمەکەی سەدام حوسەین، "جوندول ئیسلام" گورزێکی کوشندەی پێ دەگەیەندرێت و

پاشماوەکانیان لەژێر سەرکردایەتیی مەلا کرێکاردا ڕێکخراوی "ئەنسار ئەلسونە" دروست دەکەن (٥). هەموو ئەم ڕووداو و گروپانە گوڕوتین و تەوژمێکی گەورەیان بە دیاردەی سەلەفیەت لە کوردستاندا بەخشی. ئەمەش نەک تەنها لە فۆرمی گواستنەوەی ئیسلامی سەلەفییانەی سعودیدا بەرجەستە بوو، بەڵکوو ئەو تۆڕە گەورەیەی پەیوەندی و پارە و کتێب و کاسێت و پڕوپاگەندەشیان هێنا، کە بەشێکە لە "مەجالێکی گشتی" سەلەفیی بەهێز لە ناوچەکەدا (٦).

بەم شێوەیە، هاتنی سەلەفیەت لە شێوە جیهادییە ڕێکخراوەکەیدا بۆ کوردستان دادەکەوێت بۆ سالانی نەوەد. بێگومان دروستبوونی ئەم هێز و گروپ و ڕێکخراو و کەسایەتییە سەلەفییانە، بەتەنها دیاردەیەکی دەرکی نەبوو، تەنها هاوردەیەکی دینیی جیهادی لە ئەفگانستان و سعودیەوە نەبوو، بەڵکوو بەشێکیش بوو لەو هەلومەرجە ناوەکییەی بەدرێژایی سالانی نەوەد لە کوردستاندا دروست کرا، لەوانەش مۆدێلی "حیزبی قائید"ی حکمڕانییە حیزبی و خێزانییەکەی یەکێتی و پارتی، دروستکردنی مۆدێلی دوو ئیمارەتی و دووئیدارەیی، مۆنۆپۆلیکردنێکی تەواوی سەرجەم بوارەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابوری و میدیایی و ئیداری، بەرپاکردنی جەنگی ناوخۆ و گوێنەدان بە دەرەنجامە وێرانکەرکانی، دروستکردنی گەمەیەکی درۆزنانەی ئاشتبوونە و یەکگرتنەوەی ئیدارەکان بەدیار چاوی کۆمەڵگەی کوردی و کۆمەڵگەی نێونەتەوەییەوە، تەشەنەکردنێکی سەرەتانییانەی گەندەڵی بە هەموو ئاڕاستەکاندا، بێدادییەکی کەموێنە لە ژیانی سیاسی و ئیداری و ئابووری و کۆمەلایەتیدا، تێکدانی سیستمی بەهاکان لە کۆمەڵگەی کوردیدا و جێگرتنەوەی بە کۆمەڵێک بەهای گونجاو لەگەڵ دونیا گەندەڵ و بێداد و وێرانەدا، کە دروستیان کردبوو، هتد... هەموو ئەمانە ئەو زەمینە ناوەکییەیان بۆ دروست بوون و بەهێز بوون و گەشەکردنی ئەم هێزە سەلەفییانە لە کوردستاندا خۆش کرد (٧).

## سەلەفیەتی ناجیهادی؟

ئێستا ئەوەی لە کوردستاندا بە ناوی سەلەفیەتەوە ئامادەیە، بە پلەی یەکەم سەلەفیەتی ناجیهادییە، سەلەفیەتێکی دینییە، کە نەک تەنها باسی جیهاد و پەلاماردانی دەسەڵاتداران ناکات، بەڵکوو باس لە تەڵاقدانی تەواوی سیاسەت دەکات و پڕوپاگەندە بۆ ئەخلاقیاتی گوێڕایەڵی و قبوولکردنی "وەلی ئەمر" دەکات. ئەم سەلەفیەتە نایەوێت لە ڕێگەی سیاسەت و دەزگاکانی دەوڵەتەوە حوکمڕانی بکات، بەڵکوو دەیەوێت لە ڕێگەی "کۆمەڵگەی مەدەنی" و "کولتوور" و "مەجالی گشتی" و "فەزا کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان"ەوە حوکمڕان بێت. ئەوەی لێرەدا گۆڕاوە، مەسەلەی بیرکردنەوە لە دەسەڵات و تەڵاقدانی سیاسەت نییە بەیەکجاری، بەڵکوو گواستنەوەیە لە ستراتیژیەتێکی "لینینی"یەوە بۆ ستراتیژیەتێکی "گرامشی"یانەی سیاسەتکردن و بیرکردنەوە لە دەسەڵات. بەڵام مەبەست لە "سترتیژیەتی لینینی" و "گرامشیی"یانە چییە؟ خوێنەران دەزانن لینین (١٨٧٠-١٩٢٤) سەرۆکی پارتی کۆمۆنیستی ڕوسیا بوو، لەژێر سەرکردایەتیی ئەودا لە ساڵی ١٩١٧دا "شۆڕشی ئۆکتۆبەر" ڕووی دا و ڕوسیا بوو بە وڵاتێکی سۆسیالیستی. لە ئەدەبیاتی سیاسیدا، "ستراتیژیەتی لینینی" بەو شێوازە لە کاری سیاسی دەگوترێت، کە خاڵی سەرەکی تیایدا پەلاماردانی سێنتەرەکانی دەسەڵات و گرتنەدەستی ڕاستەوخۆ و دەستبەجێی دەسەڵاتە. ئەمەش بە کردەوە مانای پەلاماردانی دەوڵەت و دەرکردن و لەناوبردنی ئەو هێزانەی تا ئەو ساتە دەوڵەتیان بەدەستەوە بووە و جێگرتنەوەیان بە هێزێکی نوێ. لینین و هاوڕێکانی لە ساڵی ١٩١٧دا ئەم کارەیان ئەنجام دا، ئەوان گروپێکی بچووک لە "شۆڕشگێڕی موحتەریف" بوون لەژێر سایەی "پارتێکی پێشڕەودا،" ئەم گروپە بچووکە بەبێ سلکردنەوە لە بەکارهێنانی توندوتیژی

شۆڕشیان بەرپا کرد و دەسەلاتیان گرتە دەست. بەکورتی، "ستراتیژیەتی لینینی" ئەو شێوازەیە لە کاری سیاسی، کە تیایدا پەلاماردانی ناوەندە سەرەکییەکانی دەسەلات و بەکارهێنانی توندوتیژی ڕۆڵی سەرکیی تێدا دەبینن (٨). هەرچی "ستراتیژیەتی گرامشی"یانەیە، ڕێک پێچەوانەی ئەمەیە. گرامشی (١٨٩١-١٩٣٧) فەیلەسوف و سەرکردەیەکی سیاسی و کۆمۆنیستێکی ئیتالی بوو. لە قۆناغێکدا سکرتێری گشتیی پارتی کۆمۆنیستی ئیتالی بوو. لای گرامشی کۆمۆنیستەکان لە ئەوروپای خۆرئاوادا بۆ ئەوەی بتوانن دەسەلات بگرنە دەست، ناتوانن وەک لینینیەکانی ڕوسیا ڕاستەوخۆ پەلاماری دەوڵەت و دەزگاکانی حوکمڕانی بدەن، بەڵکوو دەبێت بەوردی و لەسەرخۆ لەناو کۆمەڵگەدا کار بکەن و پێگەی خۆیان لەناو هێزە کومەلایەتییە جیاوازەکاندا بەهێز بکەن. ئەمەش لە ڕێگەی پەروەردەکردنی کۆمەڵگە بە بیروبۆچوونەکانی خۆیان و پڕوپاگەندەبۆکردن و بلاوکردنەوەیان تا ئەو شوێنەی کۆمەڵگە ئەم بیروبۆچوون و بەها و نۆرم و ڕوانینیە کۆمۆنیستییانە بە هی خۆیان بزانن و بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی قبووڵی بکەن. گرامشی لەباتی "پەلاماردانی دەوڵەت" باس لە دروستکردنی "هەیمەنەی کولتووری" دەکات لەناو کۆمەڵگەدا. بە بۆچوونی هێزە کۆمۆنیستەکان، دەبێت یەکەم جار هەیمەنەیەکی کولتووری و فەرهەنگییان لەناو کۆمەڵگەدا هەبێت، دوای ئەوە دەتوانن بەئاسانی دەزگاکانی حوکمڕانی بگرنە دەست (٩). بەکورتی، ئەگەر لە "ستراتیژیەتی لینینی"دا کاری "شۆڕشگێڕانە" و توندوتیژ و پەلامارئامێز مەسەلەی ژمارە یەک بێت بۆ گەیشتن بە دەسەلات، ئەوا لە "ستراتیژیەتی گرامشی"یانەدا کاری لەسەرخۆ و بەردەوامی فیکری و کولتووری و بەهاییی هەمەجۆر پێویستە. لە یەکەمیاندا پارتێکی سیاسی کە سڵ لە بەکارهێنانی توندوتیژی ناکاتەوە و لە دووهەمیاندا خەڵکێکی قسەزان و پڕوپاگەندەکەر پێویستن. لە یەکەمیاندا کاری حیزبیی نهێنی

پێویستە، لە دووهەمیان کەناڵی تەلەفزیۆنی و ڕادیۆ و گۆڤار و ڕۆژنامە و کۆڕ و کۆبوونەوەی جەماوەری پێوستن. بەڵام لە هەردوو دۆخەکەدا ئەوانەی کار دەکەن، کاری سیاسی دەکەن، بەڵام بە دوو شێوازی جیاواز و لە ڕێگەی دوو ستراتیژیەتی جیاوازەوە.

سەلەفییەکانی کوردستان و بەشێکی زۆری سەلەفیەکانی تری ناوچەکە، ئەوانەی کە سەلەفیی جیهادی نین، سەرقاڵی پیادەکردنی "ستراتیژیەتێکی گرامشی"یانەن. ئەوان ڕاستە باس لەوە دەکەن کە کاری سیاسی ناکەن، ڕاستە دەڵێن دین و سیاسەت بەیەکەوە ناگونجێن، ڕاستە دەڵێن پێویستە ئیسلام تێکەڵ بە سیاسەت نەکرێت، بەڵام هەموو ئەم قسانە بەشێکە لە ستراتیژیەتێکی سیاسیی تایبەت، نەک نەفیکردنی سیاسەت، جۆرێکی تایبەتە لە ئەنجامدانی کاری سیاسی، نەک تەلاقدانی سیاسەت. باشترین نموونەش بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە هەڵوێستی سەلەفییەکانی میسر بوو دوای ڕووداوەکانی بەهاری عەرەبی لەو وڵاتەدا. بەدرێژاییی زیاد لە بیست ساڵ سەلەفییەکانی میسر باسی ئەوەیان دەکرد، کە ئەوان کاری سیاسی ناکەن، جەختیان لەوە دەکردەوە، کە دینی ڕاستەقینە و سیاسەت بەیەکەوە ناگونجێن، کەچی لە یەکەمین هەلی مێژووییدا زیاد لە پارتێکی سیاسییان دروست کرد و چوونە گەمەی هەڵبژاردنەوە و خۆیان وەک یەکێک لە هێزە سیاسییە سەرەکییەکانی میسر نمایش کرد. لەمەشدا هەموو ئەو ژێرخانە دینییە گەورەیەی بەدرێژاییی زیاد لە بیست ساڵ دروستیان کردبوو، خستە خزمەتی کاری سیاسییەوە. ئەم نموونەیە نیشانمان ئەدات ئەو باڵەی سەلەفیەت کە جیهادی نییە، باڵێکی ناسیاسی نییە، دوور نین لە سیاسەت و سیاسەتکردنەوە، ئەوەی پێی هەڵدەستن و ئەنجامی ئەدەن، سیاسەتە، بەڵام سیاسەتە بە مانا گرامشییەکەی. ئەوان لەباتی ئەوەی پەلاماری دەوڵەت بدەن و "لە سەرەوەڕا" ڕوانینە سەلەفییەکانی خۆیان بەسەر کۆمەڵگەدا بسەپێنن، دەڵێم لەباتی پەیڕەویکردنی ئەم ستراتیژیەتە

لینینییە، سەرقاڵی "بەسەلەفیکردنی کۆمەڵگە"ن بۆ ئەوەی دوای ئەوە بگوازنەوە بۆ بەسەلەفیکردنی دەوڵەت و حوکمڕانی. بەکورتی، لەباتی ئەوەی لە دەوڵەتەوە بۆ ناو کۆمەڵگە دابەزین، لەناو کۆمەڵگەوە بۆ دەوڵەت سەر دەکەون. ئەم ستراتیژەش بە هەمان شێوازی ستراتیژیی پەلاماردانی دەوڵەت، ستراتیژێکی سیاسییە.

## سەلەفیەت: کام شێواز لە دین؟

ئەوەی سەرنجی گوتاری سەلەفییەکانی کوردستان بدات، بەئاسانی بۆی دەر دەکەوێت ئەو شێوازەی لە دین ئەوان سەرقاڵی بڵاوکردنەوەین، کۆمەڵێک ئاکاری هەیە کە دەشێت لەم چەند خاڵەدا کۆیان بکەینەوە.

یەکەم: ئەو شێوازە لە دین داخراوترین و دۆگماییترینن شێوازی ئیسلامە، هەڵگرانی نەک تەنها هێزێکی تەواو کۆنەپارێز و ڕابوردووپەرستن، بەڵکوو لەو ڕابوردووشەدا تەنها چەند ناوێکی کەمی لێ دەر بچێت، لەوانە بۆ نموونە، بوخاری و ئیبن تیمیە و ئیبن قەیوم و محەمەدی کوڕی عەبدول وەهاب، ئەوانی تر یان بە بێدین، یان بە بیدعەکار و تەنانەت بە کافر دەزانن. "سەلەفیی ساڵح"ی ئەم گروپە چەند ناوێکی کەمن، لە دەرەوەی ئەو چەند ناوەدا، هیچ کەس و گروپ و هێزێکی ناو مێژووی ئیسلام نە سەلەفە نە ساڵح.

دووهەم: هەموو ڕوانینێکی دەرەوەی ڕوانینەکانی ئەو سەلەفە ساڵحەی خۆیان نەک تەنها وەک لادان لە دین تا ڕادەی بەکافرکردن تەماشا دەکەن، بەڵکوو ئەوەی وەک ئەوان هەمان ڕابردوو نەپەرستێت و وەک ئەوان بەسەر چەند ناوێکی کەمی ناو مێژووی ئیسلامدا کڕ نەکەوێت، دیندار نییە و دەکرێت وەک کافر مامەڵە بکرێت. بەم مانایە سەلەفیەت جۆرێکە لە دینداری، کە دژ بە فیکر و ڕۆشنبیرییە و هەموویان وەک

ڕێگەیەک بەرەو گومڕایی دەبینێت، بۆیە تەنها لەگەڵ خوێندنەوەیەکی زۆر وشک و دۆگمایی تێکستە دینییەکاندایە.

سێهەم: بەم مانایە سەلەفیەتی دینی، هەموو دینەکانی تری وەک مەسیحیەت و جوولەکە و هیندۆس و یەزیدی و ئەوانی تر بە کەمتر دەزانێت و هەڵگرانیان بە پلەی جیاواز بە گومڕا و بێدین و کافر ناو دەبات. لەناو ئیسلام خۆشیدا ئەم سەلەفیەتە دژ بە "ئیسلامی ڕۆحانی" و "ئیسلامی سوفی" و "ئیسلامی شیعی"یە و دەسەڵاتی هەبێت، هەموویان بە خراپترین شێوە دەچەوسێنێتەوە، تا ڕادەی گرتن و ڕاونان و کوشتنیان. ئەمەش لە دۆخی ئەمڕۆکەی کۆمەڵگەی ئێمەدا مانای بە بێدین و کافرکردنی زۆربەی هەرە زۆری خودی دیندارەکان خۆشیان، ئەمە جگە لە بەکافرکردنی هەموو ئەوانەی دین بابەتی سەرەکیی ژیان و بوونیان نییە.

چوارەم: ئەو خاڵەی سەرەوە بەئاشکرا دەری دەخات، شتێک بە ناوی "هاووڵاتیبوونی خاوەن ماف" و "هاووڵاتیی یەکسان" لە ڕوانینی ئەم سەلەفیانەدا بوونی نییە. سەلەفیەتی دینی بەئاشکرا و بەنهێنی دژایەتیی بیرۆکەی هاووڵاتیبوونی یەکسان دەکات و لەباتی "مرۆڤی هاووڵاتی"، "مۆرڤی سەلەفی" بە تاکە مرۆڤێکی خاوەن ماف و بەرپرسیاریەت دەزانێت. غیابی بیرۆکەی "هاووڵاتیی خاوەن ماف و یەکسان" وا دەکات سەلەفیەت بە مافی خۆی بزانێت کەسانی ناسەلەفی بە مرۆڤی پلەدوو و پلەسێ دابنێن و کەسانی سەر بە دینەکانی تری وەک مەسیحیەت و جوولەکە وەک "ئەهلی زیمە" ببینن و لەسەر بنەمای ئەو بینینەش مامەڵەیەکی نایەکسانیان بکەن.

پێنجەم: لە ڕووی سیاسییەوە سەلەفیەت هەڵگری ڕوانینێکە تەواو دژ بە دیموکراسیەت و لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و لێپرسینەوە و چاودێریی سیاسیی دەسەڵاتداران. چەمکی "وەلی ئەمری" دینی و چەمکی

"ئیتاعەت" ئاراستەی ڕوانینە سیاسییەکانیان دەکات. سەلەفیەت ئەگەرچی ئامادەیە هەموو دەسکەوتێکی دیموکراسییانە بۆ پروپاگەندەکردن بۆ خۆی و بۆچوونەکانی بەکار دەهێنێت، بەڵام دیموکراسیەت بە کوفر و لادان لە ئیسلام دەزانێت.

شەشەم: سەلەفیەت لەپاڵ دوژمنە دینی و ئایدیۆلۆژییە زۆرەکانیدا دوژمنێکی تری هەیە، گەر لەوان گرنگتر و ترسناکتر نەبێت کەمتر نییە، ئەو دوژمنەش ژنانە. کۆنترۆڵکردنی ژن یەکێکە لە وەسوەسە سایکۆلۆژی و فەرهەنگییەکانی ئەم هێزە، بەتایبەتی کۆنترۆڵکردنی ئەو بەشە لە ژنان کە داوای مافەکانی خۆیان دەکەن و کۆشش بۆ ئەوە دەکەن وەک مرۆڤی خاوەن ماف و یەکسان بە پیاو مامەڵە بکرێن.

حەوتەم: سەلەفیەتی دینی دینێکی تەواو نارسیستییە، بە ڕادەیەک، عاشقی خۆی و وێنەکانیەتی، بە ڕادەیەک، خۆی بە ڕاست و پاک و بێگەرد دەزانێت، شتێک لە دونیای دەرەوەدا نامێنێتەوە وەک "پیس" و "گلاو" و "بۆگەن" مامەڵەی نەکات. سەلەفیەتی دینی هەستێکی فوتێکراو و ئاوساوی خۆبەگەورەزانینی تێدیە، کە هەموو کەس و هەموو شتێکی دەرەوەی خۆی وەک بچووک و بێنرخ مامەڵە دەکات.

هەشتەم: سەلەفیەت دینێکی عەبوس و تووڕە و غەمبار و ترساوە. لە سەرێکەوە نارسیسمێکی قەبە و لە سەرێکی دیکەوە وێناکردنی دونیا وەک ڕووبەرێکی گەورە بۆ کوفر و بێدینی و گومڕابوون، وای کردووە سەلەفیەت یەکێک لە عەبوسترین شێوازەکانی دین بێت لە دونیای هاوچەرخدا. شێوازێک بێت لە دین دژ بە پێکەنین و ژیان و بەختەوەری لە مانا هەرە سادە نادینییەکەیدا، ترس لە هەموو شتێک لە خۆی نەچێت هەموو چێژوەرگرتنێکی لە ژیان تیادا کوشتووە (١٠).

بێگومان لیستی ئاکارەکانی سەلەفیەت دەکرێت درێژتر بکرێنەوە و

شتی دیکەشیان بۆ زیاد بکرێت، بەڵام ئەو خاڵەی کە پێویستە ئاگاداری بین ئەوەیە مەرج نییە ئەم ئاکارانە هەموویان لەناو هەمو بزوتنەوەیەکی سەلەفیدا ئامادە بێت. سەلەفیەت یەک دەموچاو و یەک ڕووخساری نییە، دیاردەیەکی ئاڵۆزە، فرەدەرکەوت و فرەجۆرە. ئەو ئاکارانەی من لە سەرەوە باسم کردوون، بەشێکن لەو ئاکارانەی من لەناو سەلەفییەکانی کوردستاندا تێبینیم کردووە، بەتایبەتی لای ئەوانەی وەک نوێنەرە سەرەکییەکانی سەلەفیەت دەناسرێن. زۆربەی ئەوانەی لەسەر زانستی "کۆمەڵناسیی دین" کار دەکەن، ئەم شێوازە لە سەلەفیەتی وەهابیی سعودی بە "تێگەیشتنێکی بەدەوییانەوە" بۆ دین لێک ئەدەنەوە، سەلەفیەتی سعودی وەک دینی بیابان وێنا دەکەن و داخرانەکەشی بەو ژینگە داخراو و بەرتەسکەوە گرێ ئەدەن، کە خێڵە بەدەوییەکانی ناو بیابانەکانی سعودیە تیایدا ژیاون (١١).

بەکورتی، سەلەفیەت پڕۆژەی گۆڕینی دینە بۆ هێزێکی ئیهانەکەر، هێزێک سووکایەتی بە عەقڵ و توانا و خەیاڵی مرۆڤ بکات و هەموو ئاڵۆزییەکانی ژیانی ئینسان کورت بکاتەوە بۆ هەندێک ئەمر و نەهیی دینیی سادە. کێشەی سەلەفیەت لەوەدا کۆتایی نایەت کە تەنها تووڕە و عەبوس و نارسیستییە، لەوەشدا کۆتایی نایەت هیچ جۆر یەکسانییەکی نێوان مرۆڤە جیاوازەکانی قبووڵ نییە، تەنها ئەوەش نییە کە دژ بە بیرۆکە گرنگەکانی وەک هاوولاتیبوونی یەکسان و مرۆڤی خاوەن مافە، بەڵکوو لەوەشدایە کە دەتوانێت هێزی داعشئاسا، جانەوەرێکی ترسناک و کوشندەی وەک داعش و هاوشێوەکانی بەرهەم بهێنێت. داعش یەکێکە لە منداڵە شەرعییەکانی سەلەفیەت لە چاپە وەهابییە جیهادییە بەگلۆبالبووەکەیەدا. ڕاستە مەرج نییە هەموو سەلەفییەک داعش بێت، بەڵام هەموو داعشێک سەلەفییە.

## سەلەفیەتی دینی و داعش

ئاشکرایە داعش سەر بە هاوکێشە سیاسی و تەکنۆلۆژییە ئاڵۆزەکانی دونیای ئەمڕۆیە و کوڕی جیهانێکی بەگلۆبالبووە، بەڵام هاوکات کوڕی ڕوانین و ئایدیۆلۆژیا و لێکدانەوەیەکی دینییە کە تیایدا دین لە دۆخی بۆگەنبوونێکی ناوەکیی تەواوەتیدایە. داعش دۆخی بێنرخ و قێزەونکردنی هەمو شتێکە، مرۆڤ لە مێژووی خۆیدا بەرهەمی هێنابێت بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ کەسانی دەوروبەر و لە خۆی جیاوازدا، وەک مرۆڤ بژی و مامەڵە بکات. داعش دۆخی یەکسانکردنێکی تەواوەتیی ئیسلامە بە شمشێر، دۆخی دابڕان و ڕووتکردنەوەی ئیسلامە لە هەموو ڕەهەندێکی ڕۆحی و ویژدانی و ئینسانی و ئەخلاقی.

ئەوەی ئەمڕۆ لە سەلەفیەتی جیهادی و لە بەشێکی گەورەی سەلەفیەتی دینیدا دەیبینرێت، گۆڕینی دینە بۆ هێزێکی پەلاماردەر و وێرانکەر، هێزێکی هێرشبەر بۆ سەر هەموو شتێک لە خۆی نەچێت، پەلاماردانی دونیا و مرۆڤەکانی تر و وێرانکردنی هەموو پردێک بتوانێت دوو بوونەوەری جیاواز بەهێمنی و بەیەکسانی لەناو یەک ژینگەدا کۆ بکاتەوە. ئەم دارشتنەوە تازەیەی دین پێچەوانەی ئەو دیدە مارکسییەیە، کە پێی وایە "دین سەدای ئاهوناڵەی بوونەوەرێکی چەوساوەیە، هەستونەستی دونیایەکی بێڕۆحە، دین ڕۆحی ژینگەیەکی ڕۆحی تێدا نەمابێت، دین تلیاکی میلەتانە.» ئەم دیدە مارکسییە بۆ بەشێکی گەورەی مێژووی دین ڕاستە، دین وەک ڕۆحی ناو دونیایەکی بێڕۆح کاری کردووە، پەیوەستە بە ئاهوناڵەی مرۆڤێکی چەوساوەوە. بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ داعش نیشانمان ئەدات، دین نییە وەک دەنگی ناوەوەی بوونەوەرێکی چەوساوە، وەک ڕۆحانیەتی ناو دونیایەکی بێڕۆح، وەک بەشێک لە ویژدانی ناو دونیایەکی

بێویژدان، ئەوەی سەلەفیەتی دینی بەگشتی و هێزگەلی لە شێوەی داعش بەتایبەتی، نیشانمان ئەدات، دینە وەک هێزێکی شێوێنەر و توندوتیژ، وەک هێزێک بۆ ئیهانەکردنی مرۆڤ، وەک وزەیەک بۆ هەژارخستنێکی تەواوی ژیانی ڕۆحیی مرۆڤ و وەک ئامرازێکی ترسناک بۆ دروستکردنی دوژمنی بەردەوام. دینە وەک تەعبیرێکی نەخۆش لە سادەگۆییەکی گەورە و لە ڕستێکی درێژ لە ئەمر و نەهیکردنی فرەجۆر بۆ وێرانکردنی ژیان. ئەم سەلەفیەتە تازەیە دابڕاوە لە هەموو ڕێزێک بۆ مرۆڤ و بۆ ژیان، هێزی گۆڕینی دینە بۆ ئایدیۆلۆژیای بێنرخکردنی ئینسان تا ڕادەی کوشتن و سەربڕینی وەک ئاژەڵێکی بێماف، دینە لە فۆرمی شەقێکی گەورەدا لە هەموو شتێک ناوی ڕۆح و بۆنی ڕۆحانیەتی لێ بێت.

دین لەم دروستکردنەوە سەلەفییە جیهادییە داعشییەدا نەک ئەفیون نییە و مرۆڤ هێمن و لەسەرخۆ و مەست ناکات، بەڵکوو دەرمانی بێعەقڵکردن و بەدەعەجانکردن و سڕکردنی تەواوی ویژدانی مرۆڤانەیە. ئەم شێوازە لە ئیسلام کە ئەمڕۆ بڕێکی زۆر لە سەلەفیەت و هێزە داعشئاساکان نیشانی ئەدەن، تەواو جیاوازە لەو دینە کۆمەڵایەتی و میللی و فەرهەنگییەی خەڵکە سادەکەی کۆمەڵگەی ئێمەی لە مێژوودا وەک بوونەوەری ئیماندار دروست کردووە، ئەم دینە سەلەفییە، دینی دایک و باوکی بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگەی ئێمە نییە. هاوکات ئەو دینە ڕۆشنبیری و ڕۆحانییە نییە، کە داهێنەرە گەورەکانی وەک نالی و مەحوی و جزیری و خوێندەوارە گرنگەکانی وەک مەلای کۆیە و پیرەمێرد و مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و شێخ محەمەدی خاڵی دروست کردووە. ئەم ئیسلامە سەلەفییە داعشییە داخراوە، پڕیەتی لە هێرشکردنە سەر هەموو شتێک لە خۆی نەچێت، لە هێرشکردنەسەر دین خۆیەوە بۆ هێرشکردنە سەر ئەدەبیات، لە هێرشکردنە سەر مرۆڤەوە بۆ هێرشکردنە سەر زمان. ئەم ئیسلامە سەلەفییە داعشییە قەسوەت و دڵڕەقی، غەم و قورساییەکانی

ژیان لەسەر شانی مرۆڤەکان کەم ناکاتەوە، ئیسلامێک نییە لە هەوڵی دەستەبەرکردنی هێمنی و ئارامیی ئینسانی و کۆمەڵایەتیدا بێت، بەڵکوو ئیسلامێکە بە ملیۆنان پەناهەندە و بێماڵ و بێدەرەتان دروست دەکات، ژینگەی مرۆڤەکان وێران دەکات و دەست بۆ مێژووی هەزاران ساڵەی مرۆڤ دەبات و ڕەمزەکانی ناو ئەو مێژووە وێران دەکات. ئەوەی ئەمڕۆ لەپاڵ ئەم ڕوانینە سەلەفییە جیهادییەدا دەیبینین، دینێکی چەکدارە بە تازەترین تەکنۆلۆژیاکانی کوشتن، ئیسلامێکە مارە کراو لە چەکی ئەمەریکی و سۆڤیەتی، دینێکە هەڵگری قێزەونترین فەتوای سەلەفیی جیهادیی سعودی و غەیرەسعودی. ماشینێکی گەورەیە بۆ بەرهەمهێنانی ئازار و بەدبەختی.

ئەم ئیسلامە تازەیە، ئیسلامی ئیرهاب و کوشتن و تۆقاندنی مرۆڤە. ئیسلامێکە، ئیهانەکردنی مرۆڤ و بێنرخکردنی ژیان خاڵی هەرە سەرەکی و تەوەرە هەرە بنەڕەتییەکانیەتی. ترساندن و تۆقاندن و گرگنکردن کۆڵەکە پتەوەکان و شێوازە سەرەکییەکانی ئیشکردنیەتی. ئیرادەیەکی ڕووتی کوشتن لەناو ئەم ئیسلامە سەلەفییە جیهادییەدا ئامادەیە. ئینکارکردنی ئەوەی گوایە داعش هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە، یان داعش ئیسلام نییە، یان ئیسلام بێبەرییە لە داعش، هەڵەیەکی فیکری و سیاسی و دینیی گەورەیە. "هەڵەیەکی فیکری"یە چونکە ئەم ڕوانینە ئیسلام تەنها لە یەک شێوە و فۆرمدا دەبینێت، کە فۆرمە ناتوندوتیژ و هێمن و ئەخلاقییەکەیەتی، ئیسلام تەنها وەک هێزێک بۆ ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتی و بەدەمەوەچوونی ئینسانی و پەرەپێدان بە هاریکاریی کۆمەڵایەتی دەبینێت. ئەم ڕوانینە کۆی ئەو ئەگەرە وێرانکەرانە نابینێت، کە دەشێت ئیسلام بگۆڕن بۆ کارخانەیەک بۆ بەرهەمهێنانی ڕق و بوغز و ناشیرینی، بیگۆڕن بۆ هێزێکی کاریگەر لە پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگە و پارچەپارچەکردنی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی و کوشتن و

قێزەونکردنی ئینسـاندا. ئـەم دیـدە وێنەیەکی ئایدیالـی بـۆ ئیسـلام هەیـە، کـە ناتوانێـت ئەگـەری گۆڕانـی دیـن بـۆ هێزێـک بـۆ بەرپاکردنـی جەنـگ و خوێنڕشـتن و شـەڕی ئـەم بەشـی کۆمەڵگـە بەرامبـەر بـە بەشـەکانی تـری، ببینێـت. ئـەم نەبینینـە خـۆی یەکێـک لـە هۆکارەکانـی دروسـتبوونی ئـەو ئیسـلامییە سـەلەفییە جیهادییـە وێرانکـەرە. ئـەوەی ئەمڕۆ مرۆڤـە دینییـەکان و هێـزە دینییـەکان پێویسـتە بیزانـن، ئەوەیـە کـە دیـن دەشـێت بگۆڕێـت بـۆ هێزێکی وێرانکـەر، مێژووی دیـن خۆشـی پڕە لـە سـاتەوەختی تایبـەت، کـە ئـەم ئەگـەرە وێرانکـەرە باڵادەسـت بـووە. ئـەوەی پێویسـتە لـەم ئاسـەتدا ئەنجام بدرێت، ئـەوە نییە نکووڵـی لـە بوونـی ئـەم ڕەهەنـدە وێرانکـەرەی نـاو دین بکەیـن، پێمـان وا بێت دیـن هەمیشـە و هـەردەم پەیامێکی ئاشـتیئامێز و پڕڕەحمەتـە، ئـەوەی دەبێت ئەنجـام بدرێت، بینینی ئەم ڕەهەنـدە وێرانکەرەیە بۆ ئـەوەی بکرێت ڕێـی لـێ بگیرێـت و نەهێڵدرێت دیـن بکات بـە ماشـینێکی ترسـناکی کوشـتن و بڕیـن.

ئینکارکردنی پەیوەندیی داعش بـە ئیسـلامەوە، "هەڵەیەکی سیاسـی"یشـە، چونکـە ڕێ لـەوە دەگرێـت، هەمـوو ئـەو هێزانـەی کـە دینیـان بەسیاسـی کـردووە، یـان بـە نـاوی دینـەوە سیاسـەت دەکـەن، یـان دیـن بنەمـای بیرکردنـەوەی سیاسییانە، کردەیەکی قووڵـی بەخۆداچوونـەوە ئەنجام بـدەن و ئـەو میکانیزمانـە لەنـاو بیرکردنـەوە و کارکردنـی خۆیانـدا بسـڕنەوە، کـە دەبنـە هـۆی دروسـتبوونی هێـزی داعشئاسـا و بەرپاکردنـی دۆخـی جەنـگ و پێکدادانـی دینی و کۆمەڵایەتیی ترسـناک. بینینی پەیوەندیی نێوان داعش و ئیسـلام، دەشـێت هاریکاریـی ئـەم هێزانـە بکات بۆ ئـەوەی هەمـوو ئـەو شـتانە لەنـاو خۆیاندا گەشـە پێ بدەن و بەهێز بکـەن، کە ڕێ لـەوە دەگرێت ئەوانیـش بـە هەمـان ڕێگـە و بـە هەمـان ئاراسـتەی داعشـدا بـڕۆن. یـان هەوادارانێـک دروسـت بکـەن، کـە پڕ بـن لـە ڕەگـەز و ئەگـەری داعشـیانە. داعـش بەشـە هـەرە ناشـیرین و هـەرە ترسـناکەکەی ئیسـلامی سیاسـییە،

بێدەنگبوونی ئیسلامی سیاسیی ناداعشی لەم ناشیرینیانە و ئینکارکردنی پەیوەندیی ئیسلام بە داعشەوە، بەشێکە لە پرۆسەی دروستکردنەوەی بەردەوام و بەهێزکردنی فرەلایەنەی داعش خۆی.

هەروەها ئینکارکردنی پەیوەندیی داعش و ئیسلام "هەڵەیەکی دینی"شە، چونکە ئەم ئینکارکردنە ڕێ لە ریفۆرمکردنێکی ڕاستەقینەی دین دەگرێت و ناهێڵێت پەیوەندیی نێوان دین و کۆمەڵگە و دین و تاکەکەس و دین و دەوڵەت بچێتە سەر سکەی ڕاستەقینە و هێمنی خۆی. پیاچوونەوە بە ئەحکامە دینییەکان و بە تێکستە دینییەکان و بە قوتابخانە فیقهیەکاندا، لەژێر ڕووناکیی دروستبوونی ئیسلامی داعشدا، ئەرکی هەموو کەس و هێزێکە دین بەجیدی وەر گرتبێت و ئیسلام وەک بەشێکی گرنگی شووناسی خۆی وێنا بکات. گونجاندنی دین لەگەڵ دونیادا، نەک گونجاندنی دونیا لەگەڵ دیندا، ئەو پرنسیپەیە کە دەبێت ئەم کردەی ڕیفۆرمکردنەی دین بەڕێوە ببات. گونجاندنی دین لەگەڵ دونیادا کردەیەکی عەقڵانی و ویژدانی و ئەخلاقیی گرنگە، هێمایە بۆ پێشکەوتنی بیرکردنەوە و قووڵبونەوەی بەرخورد و فروانبوونی ئاسۆکانی ڕوانین لای ئیمانداران، بەڵام گونجاندنی دونیا لەگەڵ دیندا، کردەیەکی توندوتیژ و کارەساتاوییە، دەشێت بە ئیهانەکردنی تاکەکەسێک دەست پێ بکات کە دینی نییە، بەڵام بە کارەساتی پەلاماردانی هەموو ئەو دیندارانەش کۆتایی دێت، کە هەڵگری ئەو ڕوانینە بۆ دین نین. داعش بەشێکە لە هێزی سەپاندنی وێنەیەک لە وێنە زۆرەکانی دین بەسەر دین و بەسەر دونیادا، ئەمەش هەمیشە بەشێک بووە لە دۆخ و لە ئیرادەیەکی ترسناک بۆ جەنگ. ئەوەی ئەمڕۆ ئەم ئیرادە جەنگاوەرییەی ترسناکتر کردووە، ترسناکبوونی جەنگەکانی دونیای مۆدێرن و فراوانبوونی تواناکانی کوشتن و بەراوانبوونی ڕووبەری وێرانکارییەکانە. لێکدانەوەی جەنگاوەرانەی ئیمان، تێکەڵکردنێکی ترسناکی جیهاد و تەکنۆلۆژیای کوشتن، سڕینەوەی

سەرجەمی بنەما ئەخلاقی و ڕۆحانییەکانی دین، گۆڕینی ژمارەیەکی زۆر ئیمانداری سادە بۆ گومڕا و ژمارەیەکی گەورە لە مرۆڤ بۆ مرۆڤی پلەدوو و پلەسێی بێماف، کوشتنی هەموو قولاییەکی کولتووری و مەعریفی، دژایەتیکردنێکی بەرفراوانی ئازادی و پێشکەوتنی ژنان، بڕێک لەو کێشانەن کە سەلەفیەت بەگشتی و سەلەفیەتی جیهادی بەتایبەتی ڕووبەڕووی هەمووومانی کردۆتەوە، بە دیندار و بێدین و موسڵمان و ناموسڵمانەوە.

ئەمستردام

نیسانی ٢٠١٥

# سەرچاوەکان

(١). بۆ بوونی سەلەفیەت بە واقیعێکی بەرجەستە، بڕوانە ئەم وتارەی من: مەریوان وریا قانع (٢٠١٥)." مەجالێکی گشتی" سەلەفی. ڕۆژنامەی ئاوێنە. ڕۆژی بڵاوبوونەوە ٢٠١٥/٣/١٧.

http://www.awene.com/opinion/2015/03/17/39793

(٢). بڕوانە: مەریوان وریا قانع (٢٠١٥). ئیسلام و نەوت. ڕۆژنامەی ئاوێنە، ١٧ی شوباتی ٢٠١٥.

http://www.awene.com/opinion/2015/02/17/39132

(٣). بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ڕۆڵی پیترۆئیسلام و پرۆسەی بەوەهابیکردنی ئیسلام لەم ناوچەیەدا، بڕوانە کتێبە گرنگەکەی ئیسلامناسی فەرەنسی، جیل کەپێل.

Kepel, Gilles (2003). Jihad: The Trail of Political Islam. Belknap Press.

(٤). بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم گروپانە، بڕوانە:

Radical Islam In Iraqi Kurdistan: The Mouse That Roared?. ICG Middle East Briefing, 7 February 2003. ل٣.

(٥). هەمان سەرچاوی پێشوو ل٣-٤.

(٦). بۆ سەرهەڵدانی "مەجالێکی گشتی"ی سەلەفی لە ناوچەکەدا، بڕوانە: مەریوان وریا قانع (٢٠١٥). مەجالێکی گشتیی سەلەفی. ڕۆژنامەی ئاوێنە.

(٧). بۆ خوێندنەوەیەکی وردی ئەم دیاردەیە، بڕوانە:

مەریوان وریا قانع (٢٠١٢). ئایا جوندول ئیسلام کۆمەڵێک ڕێبوار و کۆچبەری ئایینی و ئایدیۆلۆژین؟ شووناس و ئاڵۆزی. چاپخانەی ئەندێشە. ل١٩٧-.٢٠٨

(٨). لینین ئەم ستراتیژییە لە کتێبی "دەبێ چی بکەین؟"دا بەوردی شی دەکاتەوە، بڕوانە:

:?Lenin. What is to be Done

خوێنەر دەتوانێت دەقە ئینگلیزییەکەی ئەم کتێبە لەسەر ئەم سایتە بە ناوی "ئەرشیفی مارکسیزم" دابگرێت:

https://www.marxists.org/archive/lenin/works/download/what-itd.pdf

(٩). دەربارەی فیکرەی "هەیمەنە" لای گرماشی بڕوانە:

Heywood, Andrew (1994) Political Ideas and Concepts: An Introduction, London, Macmillan.

(١٠). بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر پەیوەندیی نێوان سەلەفیەت و ترس، بڕوانە ئەم کتێبەی "ڕول مایەر" کە بە یەکێک لە کتێبە هەرە گرنگەکانی

بـواری سـەلەفیەت بـە زمانـی ئینگلیـزی دادەنرێت:

Global Salafism: Islam's New Religious Movement,edited by Roel Meijer. London, Hurst, 2009, 463 pp., ISBN: 978-1-85065-980-8. بەتایبەتی بڕوانە ل ١٠

(١١). بۆ گرێدانی سەلەفیەت و بەداوەت بەیەکەوە، بڕوانە:

Gauvain, Richard (2010). SALAFISM IN MODERN EGYPT: PANACEA OR PEST?. Political Theology (online) ISSN 1473-1719 ل٨٠٤-٨٠٥.

# دیموکراسیەت و فەتوا... عێراق و سیستانی

هەموو سیستمێکی دیموکراسی، دەبێت وەڵامی سێ پرسیاری سیاسیی گرنگ بداتەوە، کە بریتین لە: کێ دەسەڵات بگرێتە دەست و حوکم بکات؟ دەسەڵاتداران پێویستە گوێ لە کێ بگرن؟ دەسەڵات دەبێت بەرگری لە سوود و قازانجی کام هێز بکات؟

زانایانی بواری سیاسەت و کەسانێک کە خۆیان بە فەلسەفەی سیاسییەوە سەرقاڵ کردووە، ئەم دوو وەڵامە جیاوازەیان بەم پرسیارانە داوەتەوە:

یەکەم: لە دەستنیشانکردنی ئاکاری سەرەکیی سیستمی دیموکراسیەتدا، پێ لەسەر حوکم یان دەسەڵاتی زۆرایەتیی کۆمەڵگە دادەگرێت و دەسەڵات وەک "دەسەڵاتی زۆرینە"ی کۆمەڵگە وێنا دەکات. لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە دەپرسێت "کێ حوکم بکات؟" دەڵێت ئەوانەن کە زۆرینەی دەنگەکانیان لە هەڵبژاردندا بردووەتەوە، ئەوانن دەبێت حوکم بکەن. واتە دەسەڵات دەبێتە دەسەڵاتی زۆرینە، واتە هی ئەو لایەنە بێت، کە زۆربەی دەنگەکانی بەدەست هێناوە. لە وەڵامی پرسیاری "دەسەڵاتداران پێوسیتە گوێ لە کێ بگرن؟" جەخت لەوە دەکات، دەسەڵات دەبێت گوێ لەو زۆرینەیە بگرێت، کە بووەتە زۆرینەی دوای هەڵبژاردنەکان و بڕیارەکانی ئەو زۆرینەیەش جێبەجێ بکات. لە وەڵامی پرسیاری "ئایا دەسەڵات دەبێت گوێ لە قازانجی کام هێز بگرێت؟" دەڵێت ئەو دەسەڵاتەی دوای

هەڵبژاردن حوکم دەکات، بەرگری لە سوود و قازانجی ئەوانە دەکات، کە دەنگیان بۆ داوە و وایان کردووە هێزێک لە هێزەکان زۆرینەی دەنگەکان بهێنێت. لەم مۆدێلەدا، ئەوانەی کە زۆربەی دەنگەکان ناهێنن، ئەوانە دەبن بە کەمینە و دەچنە دۆخی ئۆپۆزسیۆنەوە، تا ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی دیکە، ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆن دەبینن و بە شێوەیەکی بەردەوام و بەوپەڕی ئاگاداربییەوە چاودێریی هەڵسوکەوت و جووڵانەوە و بڕیاردانی ئەو زۆرینەیە دەکەن، کە حوکم دەکەن. ئەم تێگەیشتنە بۆ دیموکراسیەت، سادەترین و بەربڵاوترین و ناسراوترین تێگەیشتنێکە لە زۆر شوێندا لەئارادا بێت. لە ئەدەبیاتی سیاسیدا، بەم مۆدێلە لە دیموکراسیەت دەگوترێت "مۆدێلی زۆرینە،"(Majoritarian Model).

دووهەم: وەڵامی دووهەم بۆ ئەو پرسیارانەی سەرەوە، وەڵامێکە کە پێ لەسەر زۆرینەی دەنگەکان داناگرێت، بەڵکوو لەسەر مەسەلەی ڕێککەوتن، تەوافق، دادەگرێت. لەم مۆدێلەدا، وەڵامی پرسیارەکانی سەرەوە لە چەند ئاستێکدا جیاوازیی گەورەی لەگەڵ وەڵامەکانی پێشوودا هەیە. ئەم مۆدێلە لە وەڵامدانەوەی پرسیاری یەکەمدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە دیموکراسیەت ناتوانێت تەنها لە ئاستی کەمایەتی و زۆرایەتیدا بمێنێتەوە، ڕاستە بەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکان بۆ دەستنیشانکردنی براوەی هەڵبژاردنەکان گرنگە، بەڵام دەستنیشانکردنی براوە، مانای ئەوە نییە لە پرۆسەی حوکمکردندا کەمینەکان پەراوێز بخرێن و تەنها ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆنیان بۆ بمێنێتەوە. بۆیە هەڵگرانی ئەم مۆدێلە، لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا بەوە ڕازی نابن تەنها زۆرینە حوکم بکات، بەڵکوو داوای بەشداربوونی کەمینەکانیش لە بڕیاردان و حوکمکردندا دەکەن. ئەمە وا دەکات لە وەڵامدانەوەی پرسیاری دووهەمدا هەنگاوێک زیاتر بچنە پێشەوە و داوای گوێگرتن هەم لە زۆرینە و هەم لە کەمینە، لە یەک کاتدا، بکەن و ئەم داوایەش بکەنە ستراتیژیەتی سەرەکیی کارکردنی

سیستمی دیموکراسی. ئەمەش مانای ئەوەی سیستمی دیموکراسی بۆ ئەوەی بتوانێت دیموکراسیەتێکی ڕاستەقینە بێت، نابێت تەنها بەوە ڕازی بێت گوێ لە زۆرینەی دوای هەڵبژاردنەکان بگرێت.

لە وەڵامی پرسیاری سێهەمیشدا، هەڵگرانی ئەم مۆدێلە پێیان وایە ئەو بڕیارانەی کە دەسەڵاتداران دەیدەن، دەبێت لە قازانج و سوودی گەورەترین ژمارە لە خەڵکدا بن، نەک تەنها لە قازانجی ئەوانەدا، کە دەنگیان بۆ زۆرینە داوە. لە ئەدەبیاتی سیاسیدا، ئەم مۆدێلە لە دیموکراسیەت، پێی دەگوترێت "مۆدێلی ڕێککەوتن" یان تەوافوق، (Consensus Model).

ئاشکرایە هەردوو مۆدێلەکە لە ڕێی دەنگدانەوە کار دەکەن، لە هەردووکیشیاندا دروستبوونی زۆرایەتی مەرجێکی گرنگی ئیشکردنی دیموکراسیەتە. لە هەموو هەڵبژاردنێکدا، دەبێت ئەو ڕاستییە دەر بکەوێت، هەر هێزە چەندە دەنگی هێناوە، بەشی زۆری خەڵک متمانەی خۆیان بە کێ و کام هێز بەخشیوە. بە مانایەکی دیکە، جیاوازیی نێوان ئەم دوو مۆدێلە لە بوون، یان نەبوونی دەنگدان و بوون یان نەبوونی زۆرینەی هەڵبژاردندا نییە، بەڵکوو لەوەدایە، لە مۆدێلی یەکەمیاندا بە دەرکەوتن و دروستبوونی زۆرایەتی، پرۆسەی دیموکراسیەت کۆتایی پێ دێنێت، بەلام لە مۆدێلی دووهەمدا، دیموکراسیەت بە دەرکەوتن و دروستبوونی ئەو زۆرایەتییە تەواو نابێت. لە "مۆدێلی ڕێککەوتن"دا، بۆ ئەوەی سیستمێکی دیموکراسیمان هەبێت، ئەوەندە بەس نییە هێزێک لە هێزەکان زۆرایەتیی دەنگەکان بهێنێت و حکومەت دروست بکات و ئەوانی تریش هەموویان ببنە هێزی ئۆپۆزسیۆنی دەرەوەی دەسەڵات و نەتوانن بەشدار بن لە بڕیاردانی سیاسیدا. لە مۆدێلی ڕێککەوتندا، بەدەستهێنانی زۆربەی دەنگەکان لانی کەمی ئەو مەرجانەیە، کە دەبێت ئامادە بن بۆ حوکمکردن، بەڵام هەموو مەرجەکانی حوکمکردن نییە.

ئەگەر "مۆدێلی زۆرینە" هەموو دەسەڵاتەکان دەخاتە دەستی

زۆرینــەوە، ئـەوا "مۆدێلـی ڕێککەوتــن" مــەودا و ڕەهەنـدی بەشـدرابوون لـە دەسـەڵاتدا بـە لایـەن و هێـزی دەرەوەی زۆرینـەش دەبەخشـێت. ئەگـەر مۆدێلـی یەکەمیـان کەمینـەکان تـوورڕ دەداتـە دەرەوەی بڕیاردانـەوە، واتـە "دیموکراسـیەتێکی تـووڕدەرە،" یـان "پەراوێزخـەرە،" ئـەوا دووهەمیـان کەمینـەکان دەهێنێتە نـاوەوە و دەیانکات بـە بەشـێک لـە پێکهاتـەی دەسـەڵات، واتـە "دیموکراسیەتێکی ئاوێزانکـەرە،" ئەگـەر یەکەمیان مۆدێلی ڕاسـتەوخۆ و یەکلایەنـەی بڕیاردانـی زۆرینەیـە، ئـەوا دووهەمیـان مۆدێلی ڕاپرسـیی بەردەوامـی نێوان زۆرینـە و کەمینەکانـە. ئەگـەر لـە یەکەمیانـدا کەمینـەکان دەبـن بـە ژێـرەوە، ئـەوا لـە دووهەمیانـدا ئـەو کەمینانـە بەشـدار دەبـن لـە پراکتیککردنـی دەسـەڵاتدا. بـا ئـەم سـەرەتا تیۆرییـە گشـتییە بەجـێ بێڵیـن و بـۆ هەریەکێـک لـەو دوو مۆدێلـە، نموونـە بهێنینـەوە.

## دیموکراسیەتی زۆرینە

وەک گوتمـان، لـەم مۆدێلـەدا ئـەو هێـزەی کـە زۆربـەی دەنگـەکان دەهێنێت، دەسـەڵات دەگرێتـە دەسـت و حوکـم دەکات. زۆربـەی جـار ئـەم حوکمـە لـە فۆرمـی ئامادەگیـی دەوڵەتێکـی ناوەندیـدا بەرجەسـتەیە، ئـەو هێـزەی زۆرایەتـی دەهێنێـت، دەزگاکانـی ئـەم دەوڵەتـە بەڕێـوە دەبـات. دەوڵەتـی ناوەندییـش، نـەک تەنهـا دەزگاکانـی دەوڵـەت لـە مەرکـەزدا کۆنتـرۆڵ دەکات، بەڵکـوو دەزگاکانـی دەرەوەی مەرکەزیـش، دەزگاکانـی نـاو پارچـە و بەشـە جیاوازەکانـی دیکـەی وڵاتەکـە، کۆنتـرۆڵ دەکات. ئەمەیـە وا دەکات مۆدێلی دیموکراسـیەتی زۆرینـە، هـەم مۆدێلـی دەسـەڵاتێکی یەکپارچەیـی دابەشـنەبووە، هـەم مۆدێلـی دەسـەڵاتێکی مەرکەزیشـە. دەسـەڵاتی زۆرینـە زۆر جـار دەسـەڵاتێکە لـە ناوەنـدەوە بڕیـار بـۆ هەمـوو بەشـەکانی وڵات دەدات و لـە ناوەنـدەوە پرۆسـەکان کۆنتـرۆڵ دەکات.

لە مێژووی دیموکراسیەتدا، ئاشکراترین نموونەی مۆدێلی دەسەڵاتی زۆرینە، سیستمی پەرلەمانی بریتانییە. لە بریتانیا، زۆربەی دەسەڵاتی راپەڕاندن دەکەوێتە دەستی ئەو حزبەوە، کە هەڵبژاردنەکان دەباتەوە و زۆرایەتیی دەنگەکان دەهێنێت و ئەوەشی لە هەڵبژاردندا دەدۆڕێت، دەچێتە ئۆپۆزسیۆنەوە. حزبی براوە، کابینەی حکومەت پێک دەهێنێت و لە سەرجەمی ولاتەکەدا حوکم دەکات. پەرلەمانیش، کە کاری چاودێریکردن و کۆنترۆڵکردن و لێپرسینەوەی کابینەی حکومەتە، دیسانەوە لە زۆرایەتیی ئەو حزبە دروست دەبێت، کە زۆرترین دەنگی هێناوە. ئەمە وا دەکات لەنێوان کابینە حکومییەکە و پەرلەماندا کێشەی گەورە دروست نەبێت. بریتانیا دوو حزبی سەرەکیی هەیە، کە هەرجارە یەکێکیان هەڵبژاردنەکان دەباتەوە و دەسەڵات دەگرێتە دەست، بۆیە هەندێک نووسەر ئەم سیستمە بە سیستمی دووحزبی ناو دەبەن. ئەم سیستمە دووحزبییە سیستمێکی سادە و ئاسانە، خەڵک دەتوانن بەئاسانی لەنێوان یەکێک لە دوو حزبە سەرەکییەکەدا هەڵبژێرن. ئەو کابینە حکومیانەش کە دروست دەبن، چونکە لە یەک حزب پێکدێن، جێگیرتر و بێ کێشەتر و هێمنتر کار دەکەن، تا ئەو کابینە حکومییانەی کۆمەڵێک حزب پێکەوە دروستی دەکەن.

بێگومان دیموکراسیەتی زۆرینە لە هەندێک ولات و ژینگەی سیاسیی تایبەتدا، دەتوانێت زۆر بەباشی کار بکات، بەلام ئەم سیستمە بۆ ئەوەی بتوانێت بەباشی کار بکات، بوون و ئامادەگیی کۆمەڵێک مەرجی تایبەتیی پێویستن. دەکرێت ئەو مەرجانە بەم شێوەیە دەستنیشان بکەین:

١. ئەم سیستمە زۆر جار لەو شوێنانەدا ئامادەیە، کە دانیشتووان و ناوچەکانی لە رووی کولتوورییەوە هاوشێوەن و گرووپ و دەستە و تاقمی دینی و ئەتنی و نەتەوەییی جیاواز و ناکۆکیان تێدا نییە.

٢. ئەو حزبە سیاسییانەی ئامادەن، حزبی سەرتاسەری هەموو ولاتەکە

و لەناو هێز و گروپ و ناوچە جیاوازەکان و لە هەموو بەشەکانی ئەو وڵاتەدا ئامادە بن. واتە ئەو حزبانەی لێرەدا ئامادەن، حزبگەلێک نین تەنها تەعبیر لە ویست و قازانجی بەشێکی وڵاتەکە بکەن، یان بە ناوی گروهێکی ئەتنی، و دینی و کولتووریی تایبەتیی ناو وڵاتەکەوە بدوێن.

٣. لەنێوان حزبە سیاسییەکاندا، جیاوازیی ڕیشەیی و گەورە و بنەڕەتی نییە و حزبەکان لەسەر مەسەلە گشتی و ستراتیژییەکان لەگەڵ یەکدا تەبان.

٤. لەنێوان بەشە جیاوازەکانی وڵاتەکەدا، جیاوازیی گەورە و هەمەلایەن نییە، یان گەر هەشبن، زۆر بچووکن، ئەوە نییە بەشێکی وڵاتەکە زۆر دواکەوتوو یان هەژار و نەدار بێت و بەشەکەی دیکە یان بەشەکانی دیکەیان زۆر پێشکەوتوو و دەوڵەمەند بن.

هەموو ئەم مەرجانە وا دەکەن ئەو حزبەی هەڵبژاردنەکان دەدۆڕێنێت و بۆ ماوەیەک دەچێتە دەرەوەی بازنەی حوکمکردنەوە، لەوە نەترسێت حزبەکەی دیکە وڵاتەکە بە شێوەیەک ڕێک بخات و ببات بە ڕێوە، کە لەگەڵ بۆچوون و ویست و داخوازی و پێدراوە فیکری و ئایدیۆلۆژییەکانی ئەو بە شێوەیەکی گەورە و بەرفراوان ناکۆک بێت. گەر جارێکی دیکەش ئینگلتەرە بە نموونە بهێنینەوە، دەبینین زۆر گرنگ نییە داخۆ "حزبی کار" هەڵبژاردن دەباتەوە یان "حزبی موحافیزکاران،" چونکە ئەم دوو حزبە لە زۆر ڕووەوە لێک نزیکن و بەرنامەکانیان بە شێوەیەکی ڕادیکاڵ و گەورە و بنەڕەتی لێک جیاواز نین. ئەوە نییە، بۆ نموونە، یەکێکیان باوەڕی بە عەلمانیەت بێت و ئەوی دیکەیان خوازیاری تێکەڵکردنێکی تەواوی دین و سیاسەت بێت بە یەکتری، یان ئەمیان باوەڕی وا بێت کە دەبێت سیستمی سیاسیی ئینگلیزی ببێت بە سیستمێکی فیدراڵی و ئەوی دیکەیان دژ بەمە بێت. بەکورتی، لەم سیستمەدا، هەردوو حزبەکە لەسەر مەسەلە و پرنسیپە سەرەتایی و گشتییەکان ڕێکن و ناکۆکییەکی قابیل بە باسکردن لەنێوانیاندا نییە.

بەلام ئەی ئەگەر ئەم مەرجانە ئامادە نەبوون؟ بێگومان ئەودەم لە بەردەم دۆخێکی دیکەداین. بۆیە لە دۆخی نائامادەییی ئەو مەرجانەی سەرەوەدا، ناکرێت بیر لە پیادەکردنی مۆدێلی "دەسەلاتی زۆرینە" بکەینەوە. لە کومەلگەیەکدا، زیاد لە دوو حزبی گەورە و سەرەکیی تێدا بوو، لە ڕووی ئەتنی و زمان و کولتوور و دینەوە جیاواز بوو، ئەم جیاوازییانەش لە فۆرمی حزب و دەزگا و ویستی سیاسیی تایبەتدا بەرجەستە بووبن و چەندان دەنگ هەبن، کە بە ناوی شووناسی ناوچەیی و تایبەتییەوە بدوێن، ولاتێک، زمانی جیاواز و نەتەوەی جیاوازی تێدا بێت، چ مۆدێلێکی دیموکراسی دەتوانێت کار بکات؟ بەکورتی، ئەگەر هەلومەرجی ئینگلتەرە لەئارادا نەبوو، بەلکوو بۆ نموونە، هەلومەرجی بەلجیکا لەئارادا بوو، کە زمان و ناوچە و گروپی ئەتنی جیاوازی تێدایە، ئەودەم چی بکەین؟ لەو دۆخەدا، کام مۆدێلی دیموکراسیمان پێویستە؟ ئەی ئەگەر ئێمە لە ئەورووپادا نەژیاین و لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بووین، ئەگەر لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا لە یەکێک لە ئالۆزترین ولاتەکانیدا بووین، واتە لە عێراقدا، چۆن و چی بکەین؟

دوای چاوپۆشین و خۆلادان لە حیسابکردن بۆ کومەلێک جیاوازیی گەورە، دەتوانین بلێین عێراق لە ڕووی پێکهاتەی ئەتنی و کولتووری و زمان و دینەوە، بەلجیکای ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە. عێراق وەک بەلجیکا ولاتێکە پڕیەتی لە کێشەی ئەتنی و دینی و کولتووری و زمانەوانی و ئەم کێشانەش لەدایکبووی ئەمڕۆ نین، بەلکوو هی سەرەتاکانی دروستبوونی ئەم دەولەتەن و سەردەمانێکی درێژیشە مانای سیاسییان وەرگرتووە و بەشێکیشیان لە فۆرمی بزووتنەوەی سیاسیدا ئامادەن و داواکاریی سیاسیی تایبەتیشیان هەیە. بەکورتی، عێراق کە نە بریتانیایە و نە ئەمەریکا، کە هەردووکیان دوو ولاتی دووحزبین، بەلکوو ولاتێکە بە دەیان حزبی تێدایە و حزبەکانیش لەسەر بنەمای ئەتنی و دین و کولتوور

و زمانی بە یەک جیاواز و بە یەک ناکۆک دروست بوون، نەک لەسەر بنەمای هاوولاتیبوون لە یەک وڵاتدا. عێراق کە وڵاتێکە مێژوویەکی دوورودرێژی نایەکسانی و چەوساندنەوە و هەڵاوێردنی سیاسی و ئەتنی و دینیی تێدایە، نەک مامەڵەکردنی هەموو پێکهاتەکانی بە برێکی ماقوڵ لە یەکسانی، ئەم مێژووەش یاداوەرییەکی برینداری لای چەندان هێز و گروهی جیاواز دروست کردووە، نەک یادەوەرییەکی هاوشێوە و وەک یەک، دەڵێم گەر ئێمە لە بەردەم ئەم ئاڵۆزییە مێژووییە گەورەیەدا بین، دەبێت چۆن و چی بکەین؟

یەکەمین شتێک دەبێت دەستبەرداری بین، مۆدێلی دیموکراسیەتی زۆرینەیە، واتە وازهێنانە لەو مۆدێلەی کە هەموو دەسەڵاتەکان دەخاتە دەستی زۆرینەی هەڵبژاردنەوە. لە عێراقدا، نابێت بیر لەوە بکرێتەوە کێ زۆربەی دەنگەکانی هەڵبژاردنی هێنا، ئەو بێتە سەر حوکم و کێش ئەو زۆربەیەی بەدەست نەهێنا، لە ئۆپۆزسیۆندا بمێنێتەوە. هەمووومان دەزانین هاوکێشەی زۆرینە و کەمینە لە عێراقدا، هاوکێشەیەکە پڕیەتی لە گرێ و ئاڵۆزی و ناکۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریی گەورە. مەسەلەی زۆرینە و کەمینە لە عێراقدا، مەسەلەیەکی ماتماتیکی نییە، بەڵکوو مەسەلەیەکی سیاسیی گرنگە و پێویستی بە چارەسەری عاقڵانە هەیە. پێکهاتی ئەتنی و دینی و کولتووریی عێراق بە جۆرێکە، هەندێک هێز بە بەردەوامی لە بەردەم ئەگەری بەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکاندان و هەندێکی دیش لە بەردەم ئەگەری هەتاهەتاییی کەمینەبووندان. زۆرینەی وڵات شیعە یان عەرەبە و کەمینەش هەمیشە کورد و تورکمان و لایەنە ئەتنییەکانی ترن. ئەگەر ئیسلام زۆرایەتیی گەورە بێت، ئەوا مەسیحی و سائیبی و یەزیدی کەمینەی هەمیشەیین. ئەم دابەشبوونە تایبەتە وا دەکات، هەندێک هێز بە حوکمی ئەوەی زۆرینەن، هەمیشە دەسەڵاتدار بن و هەندێکی تریش، بە حوکمی ئەوەی کەمینەن، هەمیشە لە دەرەوەی

دەسەلاتدا بن. ئەم دۆخەیە وا دەکات بەجێهێشتنی مۆدێلی دیموکراسییەتی زۆرینە، هەنگاوی یەکەم و هەرە سەرەتایی بێت لە عێراقدا.

بەلام جێهێشتنی مۆدێلی دیموکراسیەتی زۆرینە، مانای گەڕانەوە نییە بۆ دەسەلاتێکی دیکتاتۆریی مەرکەزی لە عێراقدا. ئەوەی لەو ولاتەدا پێویستە، کارکردنە بۆ هێنانەکایەی هەلومەرجێکی گونجاو بۆ پیادەکردنی ئەو مۆدێلەی دیکەی دیموکراسیەت، "مۆدێلی ڕێککەوتن" یان تەوافوق. ئەوەی دەبێت لای هەمووان ئاشکرابێت ئەوەیە عێراق لە دەرەوەی دیموکراسییەتدا هیچ ئایندەیەکی نییە، هەموو ئەو لەتە - سیاسیی ولەتە - نووسەر و لەتە. فەیلەسوفانەش کە بانگەشە بۆ حوکمی دینی دەکەن، دژایەتیکردنی دیموکراسییەت ڕادەگەیەنن و خوازیاری ئەوەن کە مەعریفەی سیاسیی مۆدێرن و مۆدێلەکانی دیموکراسییەت، بە مەعریفەی حەوزە دینییەکان و حوکمی عاریفان بگۆڕنەوە، دەیانەوێت ئەم ولاتە لە کارەسات و تاریکییەکەوە بۆ کارەسات و تاریکییەکی دیکە بگوێزنەوە.

## دیموکراسیەتی ڕێککەوتن

ئەگەر یەکێک لە ئاکارە سەرەکییەکانی مۆدێلی "دیموکراسییەتی زۆرینە" بریتی بێت لە ناچارکردنی کەمینەکان بە ڕۆلی ئۆپۆزسیۆن و ڕێگرتن لە بەشداربوونیان لە بڕیاردانی سیاسیدا، ئەوا ئاکاری سەرەکیی "مۆدێلی ڕێککەوتن" بریتییە لە بەخشینی هەلی بەشداربوونی سیاسی بە هەموو ئەو هێز و گروپ و لایەنانەی بڕیاردانی سیاسی لە ولاتەکەدا کاریگەریی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی دەبێت بۆ سەر ژیانی تاکەکەسی و کومەلایەتییان. بە مانایەکی دیکە، کێ لە ولاتدا بڕیاردانی سیاسیی کاریگەری بۆ سەر ژیانی هەبێت، دەبێت ڕا و دەنگ و بەشداربوونی لە دەرکردنی ئەو بڕیارانەدا هەبێت، گەرچی لە هەلوێستی کەمینەشدا

بێت. واتە زۆرینە لە وڵاتدا ناتوانێت بڕیارێک دەر بکات، کاریگەریی بۆ سەر ژیانی گروپەکانی دیکە هەبێت، بەبێ ئەوەی ئەو گروپانە بتوانن کاریگەریی خۆیان لەسەر ئەو بڕیارە بەجێ بهێڵن، یان ئەو بڕیارە تەواو لە دەرەوەی ئیرادەی ئەواندا بدرێت و ئەمان هیچ ڕێگەیەکیان لە بەردەمدا نەبێت بۆ کارکردنەسەر ئەو بڕیارە.

لێرەدا کە دەستەواژەی کەمینە بەکار دەهێنین، دەبێت لەو ڕاستییە ئاگادار بین، کە جۆرەکانی کەمینەبوون جیاوازن. هەندێک کەمینە هەن، کاتین، واتە ئەمڕۆ کەمینەن، بەڵام دەشێت سبەینێ ببن بە زۆرینە، وەک حزبی کاری بریتانی و حزبی موحافیزین، هەرجارەی یەکێکیان دەبێتە کەمینە و ئەوی تریان دەبێتە زۆرینە. بەڵام هەندێک کەمینە هەن، هەرگیز ناتوانن ببن بە زۆرینە، وەک فەرەنسییەکانی ناو بەلجیکا، یان کورد لە عێراقدا، یان موسوڵمانەکان لە هیندا. ئەمانە لە ڕووی ژمارەوە لە زۆرایەتیی خەڵکی ئەو وڵاتە کەمترن، بۆیە هەرگیز ناتوانن لەسەر بنەمای شووناسی ئەتنی، یان دینیی خۆیان، هەرگیز ببنە بەشێک لە دەسەڵات گەر هات و بەردەوام زۆرینە دەسەڵاتی گرتە دەست. ئەم جیاکارییە لەنێوان "کەمینەی کاتی" و "کەمینەی هەمیشەیی"دا گرنگە بۆ بیرکردنەوە لە فۆرمی ئەو دیموکراسیەتەی دەبێت لە وڵاتێکدا هەڵبژێردرێت.

لەناو ئەوروپا خۆیدا، نموونەیەکی گرنگی کەمینەیەکی هەمیشەییمان لە بەردەستدایە، کە بە هۆی کەمینەبوونیەوە بەردەوام هەموو هەڵبژاردنەکانی دۆڕاندووە، مەبەستم کاتۆلیکەکانی ئیرلەندایە. لە ئیرلەندادا، چونکە پرۆتستانەکان زۆرینەن، بۆیە بەردەوام هەڵبژاردنەکانیان بردووەتەوە، ئەمەش وای کردووە کاتۆلیکەکان ئەو هەستەیان لا دروست ببێت، کە هەمیشە و هەردەم لەدەرەوەی دەسەڵاتدا دەمێننەوە و هەرگیز ناتوانن هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی ئەو وڵاتە هەبێت، کە تیایدا دەژین. ئەم دۆخە، کە مایەی ناڕەزاییدەربڕینی بەردەوام و

دەستەجەمعیی کاتۆلیکەکان بووە، وای کردووە کاتۆلیکەکان لە سالآنی شەستەوە دەست بدەنە بەرگریی چەکداری بۆ گۆڕینی ئەو دۆخە. ئەو پێکدادانە چەکدارییەی لەو کاتەوە لەنێوان پرۆتستانت و کاتۆلیکییەکانی ئیرلەنداد ئامادەیە، دەرەنجامی ئەم دۆخەیە. ئاشکرایە لە دۆخێکی لەو بابەتەدا، "دەسەلآتی زۆرینە" هەموو ئاکارێکی دیموکراسییانەی لەدەست داوە و لە ڕاستیشدا گۆڕاوە بۆ "دیکتاتۆریەتی زۆرینە،" دیکتاتۆریەتێک، بەردەوام بەشێک لە خەڵکی وڵاتەکە دەر دەکاتە دەرەوەی هەر پرۆسەیەکی بڕیاردانەوە لەسەر چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی ئەو وڵاتە. بۆیە ئەو ڕێککەوتنە سیاسییەی لە ساڵی ١٩٩٨دا لەنێوان کاتۆلیک و پرۆتستانەکانی ئیرلەندادا ڕووی دا، لەسەر پرنسیپی دابەشکردنی دەسەلآت لەنێوانیاندا دروست بوو، بەبێ گوێدانە مەسەلەی زۆرینە و کەمینە لە هەڵبژاردنەکاندا.

بە شێوەیەکی گشتی، "مۆدێلی ڕێککەوتن" لەو وڵاتانەدا ئامادەیە، کە لە ڕووی ئەتنییەوە ئاڵۆز و لە ڕووی کولتوور و دین و زمانەوە جیاوازیی گەورە لەنێوان بەش و گروپە جیاجیاکانیاندا لەئارادایە، کۆمەڵگەکانیان لەباتی کۆمەڵگەیەکی ئامێزان و وێکچوو، کۆمەڵگەیەکی فرەکولتوور و فرەزمان و فرەدین و فرەئەتنییە، لەباتی ئەوەی حزبی سیاسیی سەرتاسەریی شێوازی سەرەکیی خۆڕێکخستنی سیاسی بێت، حزبی لۆکاڵی و ئەتنی و دینی ئەم ڕۆڵە دەبینێت. هەر بۆیە ئینتیمای تاکەکەکان زیاتر ڕووی لە هێزە دینی و ئەتنی و ڕەگەزی و ئایدیۆلۆژی و کولتوورییە ناوچەییەکانە، نەک ڕووی لە هێزگەلێک، بە ناوی هەموو وڵاتەکەوە قسە بکات، بە ناوی بەشە جیاوازەکانی وڵاتەکەوە. لەم جۆرە وڵاتە فرەکولتوور و فرەدین و فرەزمان و فرەئەتنییانەدا، زۆر جار گروپە جیاوازەکان حزبی سیاسیی تایبەت بە خۆیان هەیە و خۆیان لە چوارچێوەی ڕێکخراوی تایبەت بە خۆیاندا کۆ کردۆتەوە، هەروەها خاوەنی میدیا و بۆنە و چاپەمەنی تایبەت بە خۆیانن و یادی ئەو بۆنە

و جەژنانەش دەکەنەوە، کە بە ترادیسیۆن و کولتوور و جیهانی ڕەمزی خۆیانی دەزانن.

لە ئەوروپادا، بەلجیکا و سویسرا نموونەی ئەم جۆرە ولاتانەن. لەم دوو ولاتەدا، سیستمی دیموکراسی لەسەر بناغەکانی "مۆدێلی ڕێککەوتن" کار دەکات، نەک لەسەر پرەنسیپەکانی "مۆدێلی زۆرینە." لە بەلجیکا، فلامییەکان زۆرینەن و فەرەنسییەکان کەمینەن، ئەگەر سیستمی سیاسیی ئەم ولاتە لەسەر مۆدێلی دەسەلاتداریتیی زۆرایەتیی دەنگدەران کار بکات، مانای ئەوەیە فەرەنسییەکان هەموو هەلبژاردنێک لەو ولاتەدا دەدۆڕێن و دەبێت بەردەوام ڕۆلی ئۆپۆزسیۆن ببینن. ئەمەش مەسەلەیەکە، هەم فەرەنسییەکانی ئەو ولاتە پێی ڕازی نابن، هەم لە دیدی "مۆدێلی ڕێککەوتنەوە" ئاکار و هەلسوکەوتێکی دیموکراسییانە نییە. بەپێچەوانەوە، مامەلەکردن بە لۆژیکی زۆرینە لەو جۆرە ولاتانەدا دەبێتە هۆی خۆشکردنی هەلومەرجی تەقینەوەی کۆمەلایەتی و سیاسیی و ئەتنی، وەک لە ئیرلەندادا. بۆیە دیموکراسییەتی بەلجیکی، بەپێچەوانەی دیموکراسیەتی ئینگلیزییەوە، دیموکراسیەتی زۆرینە نییە و پەیڕەوی "مۆدێلی زۆرینە" ناکات، بەلکوو لەسەر "مۆدێلی ڕێککەوتن" دامەزراوە و کار دەکات. لە بەلجیکادا، لەباتی ئەوەی یەک حزب بە ناوی زۆرینەوە حوکم بکات، زۆربەی کات کۆمەلێک حزب لە کابینەیەکی حکومیدا پێکەوە و لەسەر بنەمای ڕێککەوتن حوکم دەکەن. ئەو کابینە حکومییانەی لەم ولاتەدا دروست دەکرێن، چەند وەزیریان هەبێت کە بە هۆلەندی قسە بکەن و فلامبن، ئەوەندەش وەزیریان هەیە کە بە فەرەنسی قسەدەکەن و ڤالۆنن. واتە پێشوەخت ڕێککەوتنێک هەیە لەسەر ژمارەی ئەو وەزیرانەی کە هەریەکێک لەم دوو گروهە ئەتنییە لە حکومەتی مەرکەزیدا هەیانبێت، بەبێ گوێدانە ئەوەی کێ زۆربەی دەنگەکان دەباتەوە و کێ دەبێتە کەمینە.

وەک دەبینین، "مۆدێلی ڕێککەوتن" کەمینەیەک بە کەمینەبوونی ئەبەدی

ناچار ناکات، بەڵکوو کەمینەکان دەکات بە بەشێک لە دەسەڵات و بەم کارەشی قەبارەی ئەو زۆرینەیەی کە حوکم دەکات، گەورەتر دەکات، لە سنووری ئەو زۆرینەیەدا نایهێڵێتەوە، کە نایەکسانی لە ژمارەی دانیشتواندا لە وڵاتێکدا دەشێت دروستی بکات.

## عێراق و دیموکراسیەت

دوای ئەو سەرەتا تیۆری و ئەو نموونانەی لە سەرەوە باسم کردن، ئاشکرایە وڵاتیکی وەک عێراق، گەر بیەوێت ببێتە وڵاتێکی دیموکراسی، مۆدێلی دیموکراسیەتی زۆرینە بەو شێوەیەی لە ئینگلتەرە یان لە ئەمەریکادا هەیە، بەکەڵکی نایەت. چونکە زۆربەی هەرەزۆری ئەو مەرجانەی ئەم شێوازە لە دیموکراسیەت خوازیاریەتی، لەم وڵاتەدا بوونیان نییە. بۆ نموونە، زۆربەی هەرە زۆری پارتە سیاسییەکانی عێراق، بەتایبەتی ئەو پارتانەی قورساییەکی سیاسیی بەرچاویان هەیە، پارتی ئەتنی و دینین و لەسەر ئەم دوو بنەمایە دروست بوون، هەموو حزبە کوردییەکان بە هەردوو حزبە گەورەکەشەوە، هێزە شیعەکانی وەک مەجلیسی ئەعلا، حزبی دەعوە و ئەوانی تریش، هەموویان حزب و دەستە و ڕێکخراوی ناوچەیی و ئەتنی و دینین. عێراق خۆشی لە ڕووی ئەتنی و نەتەوەیی و زمانەوە، دابەشە بەسەر چەندان ئەتنی و نەتەوە و زمانی جیاوازدا، زیاد لە بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستانە بە زیاد لە خەیاڵ و چاوەڕوانییەکی سیاسییەوە لەم وڵاتەدا ئامادەیە، لانی کەمی کۆدەنگیی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریی تێدا نییە، مێژوویەکی درێژی هەڵاوێردن و پێکدادانی خوێناوی و توندوتیژی هەیە، یادەوەرییەکی بریندار بەشە جیاوازەکانی ئەم وڵاتە بەیەکەوە گرێ دەدات، شووناسی عێراقیبوون لە ئاستێکی زۆر لاوازدایە، بیرۆکەی هاووڵاتی یەکسانی تێدا نییە و

تێدا نەبووە. بەکورتی، عێراق "جوگرافیایەکی سیاسییە، " بەبێ بوونی "نەتەوەیەکی سیاسی." کۆی ئەم شتانەش بەسەریەکەوە، هەلومەرجێکیان دروست کردووە، ناکرێت بازی بەسەردا بدرێت و وا بزانرێت بیرۆکەی هاوولاتیبوون لەم ولاتەدا هەموو لایەنەکان لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە و کۆتایی بە کێشە سیاسی و کولتووری و زمانی و دینی و ئەتنییەکان دەهێنێت. بۆیە بیرکردنەوە لە پیادەکردنی مۆدێلی دیموکراسیەتی زۆرینە لەم ولاتەدا، یان بیرکردنەوە لەوەی جارێکی دیکە لە ناوەندەوە بڕیار بۆ هەموو بەشەکانی عێراق بدرێت و هێزێک یان چەند هێزێک سەرتاسەری ولاتەکە کۆنترۆڵ بکەن و کەمینەکان بە بەردەوامی بە کەمینەیی بهێڵنەوە، جگە لە قووڵکردنەوەی کێشە کۆنەکان و دروستکردنی دەیەها کێشەی نوێ و زەمینەخۆشکردن بۆ تازەبوونەوەی پێکدادانە خوێنینەکان، هیچی دی لێ سەوز نابێت.

ڕەنگە خاڵی دڵخۆشکەر لە ئێستای عێراقدا ئەوە بێت، کە زۆربەی زۆری گەمەکەرە سیاسییەکانی عێراق، ئەم ڕاستییانە دەزانن و دەرکیان بە مەترسییەکانی کردووە، بۆیە بڕیاری فیدراڵیبوونی عێراق بڕیارێکە، وەک دەگوترێت، هەمووان لەسەری تەبان. (گەرچی بەردەوام چەندان دەنگ دەبیسترێن، کە دەڵێن تا ئێستا ئەوەی لەبارەی فیدراڵییەتەوە گوتراوە و دەگوتێرێت، وادە و بەڵێنی زارەکییە و هیچی نەخراوەتە سەر کاغەز).

بەکورتی، ئەو مۆدێلەی بشێت بەکەڵکی عێراق بێت و هاریکاریی ئەم ولاتە بکات بۆ دەرچوون لە کێشە گەورەکانی، مۆدێلی دیموکراسیەتی ڕێککەوتنە. بەلام ئەو پرسیارەی لێرەدا دەبێت لە خۆمانی بکەین، ئەوەیە: داخۆ ئەم مۆدێلە چ بناغەیەکی لە ئێستای سیاسەتی عێراقیدا هەیە؟ شانسی پیادەکردنی چەندە؟ با لەو خاڵەوە دەست پێ بکەین، کە بەپێی پێویست فۆرمی دیموکراسیەتی ڕێککەوتن لە عێراقدا، فۆرمێکی

فیدراڵی دەبێت، چونکە نەک تەنها لە زۆربەی زۆری وڵاتەکانی دنیادا فۆرمی دیموکراسیەتی ڕێککەوتن فۆرمێکی فیدراڵییە، بەڵکوو فیدراڵیەت داوای خەڵکی کوردستانە و بڕیارێکی پەرلەمانی کوردستان شەرعیەتی پێبەخشیوە و تا ئەم ساتەش هیچ ئاماژەیەک لە ئارادا نییە نیشانیبدات دوو حزبە گەورەکەی کوردستان لەم داوایە پەشیمان بووبنەوە. فەلسەفەی فیدراڵیزمیش فەلسەفەی دابەشکردنی دەسەڵات و سەروەرییە، واتە فیدراڵیزم دێت بۆ ئەوەی بەسەر بەشە جیاوازەکانی وڵاتێکدا دەسەڵات دابەش بکات و بە هەر بەشێکیش بڕێک لە سەروەری ببەخشێت. هەم دابەشکردنی دەسەڵات و هەم دابەشکردنی سەروەری، دوو پرۆسەی سیاسین. ئەمەش مانای ئەوەی کۆمەڵگەیەک، بۆیە بیر لە بنیادنانی سیستمی فیدراڵی دەکاتەوە، چونکە کێشەی سیاسیی هەیە و فیدراڵیزم دێت بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە سیاسییە. کاری فیدراڵیزم ئەوە نییە وا بکات وڵاتێک بتوانێت لەڕووی ئیداری و عەمەلییەوە کارەکانی ئاسانتر و باشتر بەڕێوە ببات، فیدراڵیزم فەلسەفەیەکی ئیداری نییە کە پرنسیپی چالاکبوونی ئیداری بەڕێوەی ببات. واتە مەرج نییە فیدراڵیزم لە ڕووی چۆنیەتیی ڕاپەڕاندنی کاروباری ئیدارییەوە کارئاسانی بکات، یان فیدراڵیزم بۆ پیادەکردنی ئەم کارئاسانییە ئیدارییە بنیاد بنرێت. فیدراڵیزم، وەک وتم، وەڵامێکی سیاسییە بە کێشەیەکی سیاسی. ئەم ڕاستییەیە وا دەکات هەندێک وڵات بوونیادی ئاڵۆزی سیستمی فیدراڵی قبوڵ بکەن، لە کاتێکدا ئەم بوونیادە فیدراڵییە کێشەی ئیداریی زۆر بۆ ئەو وڵاتە دروست دەکات. بەلجیکا خۆی نموونەی ئەم ئاڵۆزییە ئیدارییەیە. کە لە کەنەداشدا ناوچەیەکی وەک کوبیک دەبێتە ناوچەیەکی فیدراڵ، لەبەر ئەوە نییە ئەم بەفیدراڵبوونە بۆ باشتر بەڕێوەبردن و ڕاپەڕاندن و چوستوچالاککردنی کارە ئیدارییەکانی ئەو وڵاتە باشە، بەڵکوو لەبەر ئامادەگیی هەست و سۆز و ویست و هێزی لۆکاڵییە،

کە خۆیان بە هەڵگری شووناسێکی کولتووری و سیاسی و زمانەوانیی جیاواز دەزانن و لەسەر ئەم بناغەیەش داوای پاراستن و سەربەخۆیی و سەروەریی تایبەت دەکەن. لە ئیسپانیاش، هەمان مەسەلە بە نیسبەت کاتالان و باسکەوە هەر ڕاستە، داخوازییە سیاسی و کولتوورییەکانی ئەم ناوچانەیە، کە بنەمای دابەشکردنی دەسەڵاتە لە فۆرمی فیدراڵیدا، نەک داواکارییەکی ئیداری بۆ باشترڕاپەڕاندنی کارەکان. بە واتایەکی دیکە، دەشێت بە فیدراڵیکردنی سیستمێکی سیاسی، کۆمەڵێک کێشەی ئیداریی گەورە و بەردەوام دروست بکات، بەڵام کۆتایی بە کێشە سیاسییەکان دەهێنێت. بۆیە هەڵەیەکی گەورەیە لە دیدی ئیدارییەوە، تەماشای بەها و نرخی سیستمی فیدراڵی بکەین.

ئەو خاڵەی سەرەوە بەرەو ئەوەمان دەبات، کە بڵێین بە فیدراڵیکردنی عێراق، بڕیارێکی سیاسییە و بە پلەی یەکەمیش وابەستەی ئیرادە و داخوازیی سیاسیی هێزەکانی کوردستانە. بێگومان فیدراڵیزم جیاوازە لە کۆی ئەو شێوە تایبەتانەی ئۆتۆنۆمی و لامەرکەزیی، کە لە هەشتا ساڵی ڕابووردوودا لەم وڵاتەدا بە کورد درابوو. ئەم جیاوازییەش پێویستی بەوەیە عێراق لەڕووی پێکهاتی دەزگایی و سیاسیی و کولتووری و دەستوورییەوە گۆڕانی گەورەی بەسەردابێت. عێراق پێویستی بە دروستکردنی پێکهاتێکی دەزگاییی کراوە و ئاڵۆز هەیە، کە پەیوەندیی نێوان بەشە فیدراڵەکان لەگەڵ مەرکەزدا و لەگەڵیەکدا بەیەکەوە ڕێک بخات، پێویستی بە کولتوورێکی سیاسیی نوێیە، ڕێککەوتن بنەماکەی بێت و ڕاپرسی و دیالۆگ و دانوسانی بەردەوام بەڕێوەی ببات. پێویستی بە دابەشکردنێکی ئاشکرای دەسەڵات و سەروەری هەیە لەنێوان ناوەند و ناوچە فیدراڵییەکاندا، کە دەستوور ڕێکی بخات و کەس بۆی نەبێت بە ئارەزووی خۆی دەستکاریی بکات. هەموو ئەم شتانەش ئەو هۆکارانەن، کە فیدراڵیزم لە ئۆتۆنۆمی، یان حوکمی زاتی جیا دەکاتەوە. لە دۆخی

ئۆتۆنۆمی، حوکمی زاتیدا، دەوڵەتی ناوەندیی بڕێک سەربەخۆییی تایبەت بە ناوچە ئۆتۆنۆمەکان دەدات، بەڵام خۆی وەک گرنگترین بکەرێکی سیاسی لەو ناوچانەدا دەمێنێتەوە. لە دۆخی فیدراڵیزمدا، ناوچەی فیدراڵ هەم لە ڕووی ئۆتۆنۆمییەوە ئۆتۆنۆمتر و هەم خاوەنی حکومەتێکی ناوچەییشە، کە لە چەندان بواری جیاوازدا توانای بڕیاردانی سەربەخۆی هەیە، ئەمە جگە لەوەی ئەم حکومەتە ناوچەیییە، لە ڕێگەی هەندێک دەزگای تایبەتەوە دەتوانێت کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر بڕیاری حکومەتە مەرکەزییەکەش هەبێت. هەموو ئەمانەش پێویستیان بە گۆڕان و پێداچوونەوەی کۆی ئەو دید و وێنە و دەزگا و عەقڵیەت و پەیوەندییانە هەیە، کە عێراقی وەک دەوڵەت و وەک کۆمەڵگە لە هەشتا ساڵی ڕابردوودا لەسەر دروست کرابوو.

## فەتوا و سیاسەت

ئەگەر هەنگاوی یەکەمی دیموکراسیەت لە عێراقدا، بەو مانایەی لە سەرەوە باسمان کرد، پێویستی بە کۆتاییهاتنی ئەو دیدە ناسیۆنالیستییە عەرەبییە بێت، کە خەڵکی وڵاتەکە بە عەرەب دەزانێت و لە دیدێکی "پان-عەرەبیست"یشەوە سەیری عێراق دەکات، کە بەعس هەڵگری بوو، ئەوا لە هەمان کاتدا پێویستی بە کۆتاییهاتنی هەموو ئەو شێوە تایبەتانەی کارکردنی سیاسەتە، کە ئامادە نییە بچێتە ناو ئەو ئاڵۆزییانەوە، کە باسم کردن. یەکێک لەو شتە گرنگانەی سیاسەتکردن لە عێراقدا دەبێت وازی لێ بێنێت، گەڕانەوەیە بۆ فەتوا و بۆ عەقڵەیەتی فەتوایی. فەتوا کە دەربڕی حوکمێکی دینییە و لەلایەن "لێزان،" یان "شارەزا"یەکی دینییەوە دەر دەچێت، باز بەسەر کولتووری سیاسیی کراوە و دیالۆگ و دابەشکردنی دەسەلات و دابەشکردنی سەروەری و بەدەزگاییکردنی پەیوەندییەکاندا،

ئـەدات. فەتـوا، دەروازەی گەڕاندنەوەیەکـی بەهێـز و فرەلایەنـی نوخبـەی ئاینییـە بـۆ نـاو گەمـە سیاسـییەکان، تـا ئـەم سـاتەش، گەڕاندنـەوەی ئـەم نوخبەیـە بـۆ نـاو سیاسـەت لـە ناوچەکـەدا لـە قازانجـی هیـچ ئەزموونێکـی دیموکراسییانەدا نەبووە. لە ڕاستیدا ئـەم گەڕاندنـەوە گەورەیـەی دین بۆ نـاو سیاسـەت لـە ناوچەکـەدا، زۆر جـار مانـای داخسـتنی دەرگای دیالـۆگ بـووە بـە ڕووی هەمـوو ئـەو دید و بۆچوون و تێڕوانینانـەدا، کە ئـەو دیدە دینییەیان قبـوڵ نییـە، ئیدی لـەو گروپە دینییانەوە بیگرە کە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئـەو فەتوایـەدا نین، تـا بـە هەمـوو ئـەو گروپانـەی دیکە، کە لـە دەرەوەی دینـدا دەیانەوێت سیاسـەت بکـەن. بێگومـان نوخبـەی دینـی دەتوانێـت سیاسـەت بکات، دەتوانێت حزب دروست بکات و بەرنامـەی سیاسیی خـۆی هەبێت، بـەڵام ئـەوەی کـە نابێـت بیـکات، تێکەڵکردنـی ڕەهەنـدە میتافیزیکییەکانـی دینـە بـە سیاسـەت، وازهێنانـە لـە قسـەکردن بـە نـاوی خـودا و پێغەمبـەر و پیرۆزییـە ئایینییەکانـەوە. بەکورتـی، وازهێنانـە لـە سیاسـەتی فەتوادەرکـردن و لەباتـی ئـەوە دابەزینـە بـۆ سـەرزەمینی واقیـع و هاوکێشـە دنیایـی و ناپـاک و ناموقـەدەس و ئاڵۆزەکانـی.

خاڵێکـی دیکـەی زۆر گرنـگ، کـە دەبێـت لـە عێراقـدا بـەر لـە هەمـوو شـتێکی دی وازی لـێ بهێنیـن، داواکردنـی "دیموکراسـیەتی زۆرینەیـە،" بـەو مانایـەی لـە سـەرەوە باسـم کـرد، کـە کەمینەکانـی نـاو عێـراق بـە کەمینەبوونـی هەمیشـەیی مەحکـوم دەکات. بـەڵام ئـەم داواکارییـە بـۆ وازهێنـان لـە دیموکراسـیەتی زۆرینـە، ڕێـک پێچەوانـەی ئـەو فەتوایـەی ئایەتوڵـڵا سیسـتانییە، کـە بـۆ نووسـینەوەی دەسـتووری عێراقـی داوای دروسـتکردنی لیژنەیـەک دەکات لـە ڕێگـەی هەڵبژاردنـەوە دروسـت ببێـت. هەرکەسـێک کەمتریـن زانیاریـی لەسـەر عێـراق هەبێـت، ئـەو ڕاسـتییە دەزانێت کـە ئەنجامدانـی هەڵبژاردن لەمڕۆکـەی عێراقدا، مانـای بردنـەوەی ئـەو هەڵبژاردنـە لەلایـەن زۆرایەتیـی شـیعەوە. ئەمـەش، لـە پەیوەندیـدا

بە دیدی کەمینەکانی ناو عێراقەوە، نەک پرۆسەیەکی دیموکراسییانە نییە، بەڵکوو نموونەیەکی ئاشکرای گۆڕانی "دیموکراسیەتی زۆرینەیە" بۆ "دیکتاتۆریەتی زۆرینە." لە ڕاستیدا ناکرێت بوونی دۆخێکی وەک دۆخی سیستانی و سیستمی دیموکراسیەت، لە فۆرمە فیدراڵی و ڕێککەوتنخوازەکەیدا، پێکەوە کۆ بکەینەوە. واتە ناتوانین سیستانی وەک سەرچاوەیەکی سەرەکیی دەرکردنی فەتوا بخەینە شوێنی کۆمەڵێک دەزگا و ناوەند و میکانیزمی بڕیاردانی دیموکراسییانەی ئاڵۆزەوە، کە ئەمڕۆ عێراق لە هەموو کات زیاتر پێویستی پێیەتی.

باشترین شتێک لە کۆتاییی ئەم نووسینەدا باسی بکەین، گەڕانەوەیەکی خێرایە بۆ فەیلەسوفی گەورەی ڕۆشنگەری، ئیمانوێل کانت. ئەم فەیلەسوفە لە قسەکردنیدا لەسەر مەسەلەی ئەگەری دروستبوونی ئاشتییەکی جیهانی بەردەوام و پایەدار، باس لە گرنگی ئەوە دەکات، ئینسان دەرس لە مێژوو وەر بگرێت و لە مێژووەوە فێر ببێت. بە بۆچوونی کانت، مرۆڤ کاتێک بە چاوی خۆی دەبینێت جەنگ چ ماڵوێرانی و کوشتن و وێرانکارییەکی لێ دەکەوێتەوە، ئەوکات زۆر بەجیدی بیر لەوە دەکاتەوە، چۆن ڕای بگرێت و نەهێڵێت ڕوو بدات. کانت لە هەمان کاتدا دەڵێت کۆتاییی جەنگ و سەقامگیربوونی ئاشتی، بەبێ بوونی مێژوویەکی درێژی شەڕوشۆڕ و کوشتن و بڕین، دروست نابێت، ئەوە تەنها ئەزموونکردنی وێرانکاری و کابوس و ترسە بێ ئەندازەکانی جەنگە، ئینسان عاقڵ دەکات و لەو ڕاستییەی ئاگادار دەکاتەوە، کە بەکارهێنانی توندوتیژی و بەرپاکردنی جەنگ، کارێکی هەڵەیە. هەر ئەمەش لەدایکبوونی ئاشتییەکی بەردەوام و سەقامگیر مەیسەر دەکات. کاتی ئەوە هاتووە عێراق و عێراقییەکانیش لە مێژووی خۆیان و دەوڵەتەکەیانەوە فێر ببن. مێژووی ئەم وڵاتە یەکێکە لە ناشیرینترین مێژووەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە سێ

سـاڵی ڕابووردووشـدا بووتـه یەكێـك لـه ناشـیرینترین مێژووەكانـی جیهـان. سـڕینەوەی ئـەم ناشـرینییه بـه ئامادەگییـەوه بـۆ فێربـوون لـەو مێژووەوه گرێ دراوه: هەنـگاوی یەكەمـی ئـەو فێربوونـەش، دامەزراندنـی دیموكراسیەتێكی ڕاستەقینەیە، كه پێویستی بـه فەتوا و عەقڵیەتی فەتوایـی نەبێـت.

# عێراق و هێزە ئیسلامییەکانی

ڕەنگە هیچ شتێک لە عێراقدا ئەوەندە ڕوون نەبێت، وەک ئەوەی کە لانی کەم لە دە تا پازدە ساڵی داهاتوودا، هێزە دینییەکانی ئەم وڵاتە هێزی باڵادەستیی ناو کایەی سیاسی دەبن. چ لە ناوچە شیعەنشینەکاندا و چ لە ناوچەی سوونەکاندا، ئەوانەی دەستنیشانی گەمە سیاسییەکان دەکەن و ئەنجامەکانی بەلادا دەخەن، هێزە دینییەکانن. لە ئاستی کۆمەڵایەتی و کولتووریشدا، دین ئامادەگییەکی هێجگار گەورە و هەمەلایەنی هەیە، بە ڕادەیەک، دەتوانم بڵێم بەدرێژاییی مێژووی خۆی، عێراق بەقەد ئەمڕۆ دینی تێدا نەبووە. دین لە شێوازی جیاجیادا لەم وڵاتەدا ئامادەیە، لە دەزگا و ڕێکخراو و حزبی دینییەوە بیگرە، بۆ ژمارەیەکی زۆری سیمبۆلی دینی و کەلەپوورێکی زیندووکراوەی دوورودرێژی دین و ژیاندنەوە و دروستکردنی دەیان بۆنەی دینی و پەیدابوونی لەپڕ و سەرسووڕهێنەری سەدان و هەزارەها کەسایەتیی دینی و ئینجا دروستبوونی ماشینێکی هێجگار گەورەی میدیای دینی. لە ڕاستیدا ئەوەی پرۆسەی عەلمانیەت، یان بەعەلمانیکردن، بەدرێژاییی سەدەی بیستەم لەم وڵاتەدا بەرهەمی هێناوە، لەدوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدامەوە، لە دۆخی لەبەریەکهەڵوەشاندنەوە و سەرلەنوێ-بنیادنانەوەیدایە لەسەر بنەمایەکی دینی. ئەگەر مێژووی سەدەی بیستەمی دەوڵەت و کۆمەڵگەی عێراقی، بە مانایەک لە ماناکان، مێژووی سەرلەنوێ-داڕشتنەوەی شوێن و جێی دین بێت لە دەرەوەی ڕۆڵە

سیاسی و کولتووری و ڕەمزییە گەورەکەیەدا، واتە مێژووی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دین و گۆڕینی ئاڕاستەکانی کارکردنی دین بێت، ئەوا مێژووی دوای کەوتنی ڕژێمەکەی سەدام، مێژووی بەدینیکردنەوەیەکی خێرا و هەمەلایەنی سەرجەمی ژیانی سیاسی و کومەلایەتی و کولتووری و ڕەمزییە لەو ولاتەدا. ئەم پرۆسەی بەدینیکردنەی گشتیتیی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووری، سەرەتا لەلایەن سەدام و حزبی بەعسەوە لە سەرەتای نەوەدەکانەوە دەست پێ دەکات و لە ئێستادا هێزە دینییەکان بە بالاترین دۆخی دەگەیەنن. بە جۆرێک، ئەوەی ئەمڕۆکە کۆمەلگە و دەولەت و سیاسەت و کولتوور لە عێراقدا قسەی پێ دەکات، زمانێکی دینییە کە بەردەوام واقیعێکی دینیی سیاسیی پڕمەترسی و پڕچەپاندن و پەراوێزخستن بەرهەم دەهێنێت.

لە ناوچە کوردییەکانیشدا، دین هێزێکی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووریی بەهێزە، ئەگەرچی بەو ئەندازەیە بەهێز نییە وەک لە بەشەکانی دیکەی عێراقدا، بەلام ئەگەری گەورەبوونی هێزە دینییەکان لە کوردستاندا، ئەگەرێکی داخراو نییە، ئەوەشی ئەم ئەگەرە گەورە دەکات، بەردەوامیی ئەو گەندەلییە ئیداری و سیاسی و داراییە گەورەیەیە، کە کوردستانی تێدا نوقم بووە، بەردەوامیی ئەو شێوازە پڕناعەدالەتییەیە، کە لە دابەشکردنی سامان و پێگە و هەلی پێشکەوتنی کۆمەلایەتیدا پیادە دەکرێت، چ لە شێوە مادییەکەیدا و چ لە شێوە ڕەمزییەکەیدا. بە جۆرێک، تیایاندا پیاوانی هەلقەی یەکەمی حزب، دۆست و خزم و کەسوکاری بەرپرسان، ئینجا ئەوانەش کە بێ هیچ مەرجێک، لە سات و ناساتدا، ئامادەن چەپلە بۆ سەرۆکەکان لێبدەن و بە دیپلۆماتی لێهاتوو و سەرکردەی بێوێنە و پیاوی دادپەروەر لەقەلەمیان بدەن، سوودمەندن. مۆنۆپۆلکردنی کۆی ئەم شتانە لەلایەن ئەو نوخبە سیاسییە بچووکەوە ئەگەری ئەوە گەورەدەکات، لە ساتێکی چاوەڕواننەکراودا سیناریۆی سەرکەوتنەکانی

حەماسی فەلەستینی لە هەولێر و سلێمانیدا دووبارە ببێتەوە. ئەگەر ٤٠ ساڵ خەبات و تێکۆشان و شەهیدبەخشین لە فەلەستیندا فریای هێزێکی وەک فەتح نەکەوتبێت و نەیتوانیبێت گەندەڵییەکانیان داپۆشێت، ئەوا خەبات و تێکۆشان و شەهیدانی ڕابووردووی پارتی و یەکێتیش ناتوانن ئەم کارە بکەن و ڕێ لەوە بگرن، هێزە دینییەکان بتوانن لەو قەبارە بچووکەی ئێستایان تێبپەڕن و ببنە هێزی گەورە، یان سەرەکیی ناو کایەی سیاسیی کوردی.

بێگومان کێشەکە لە بوونی گروپ و هێز و حزبی دینیدا نییە. من باوەڕم وایە وەک چۆن هێزێک دەتوانێت عەلمانی بێت و شووناسی سیاسیی خۆی لەسەر عەلمانیەت بینا بکات، بە هەمان شێوە هێزی دی دەتوانن دینی بن و شووناسی سیاسیی خۆیان لە خوێندنەوەیەکی تایبەتیی ئایینەوە وەر بگرن. بە بۆچوونی من، دینیبوون بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی مانای نادیموکراتیبوون ناگەیەنێت، هێزی دینی مەرج نییە هەمیشە و هەردەم هێزی ستمگەر و دیکتاتۆر بێت. بەڵام ئەوەی مایەی مەترسی و دوودڵییە، بەتایبەتی لە وڵاتێکی وەک عێراقدا و بە کوردستانیشەوە، دروستبوونی هێزی دینییە لەسەر مۆدێلی بەعس و لەپاڵ کولتووری سیاسیی بەعسدا. وەک چۆن بەشێکی بەرچاوی کولتووری بەعس لە بواری شێوازی کارکردن و ئیدارەدان و ڕێکخستنی ئابووری و دەستنیشانکردنی پەیوەندیی نێوان حزب و کۆمەڵگە و حزب و دەوڵەتدا، لای پارتی و یەکێتی بەئاسانی دەدۆزرێنەوە، بە هەمان شێوە، مۆدێل و کولتووری بەعس لە هەناوی هێزە دینییەکانیشدا جێگیرە. موقتەدا سەدر تێکەڵەیەکە لە عودەی کوڕی سەدام و شێخ زانا، ئیسلامی سیاسی لە عێراقدا دەشێت ببێتە تێکەڵەیێکی ترسناکی عەقڵیەتی سەدام حوسەین و بن لادن، یان تێکەڵێک لە بیرکردنەوەی عەلی حەسەن مەجید و زەرقاوی بە یەکدی. بە مانایەکی دیکە، مەترسیی سەرەکیی هێزە دینییەکانی ناو

عێراق، لە تێکەڵکردنی ڕووە ناشیرینەکانی دین و ڕووە ناشیرینەکانی بەعسدایە بە یەکدی، تێکەڵکردنی ڕقی دینییە بە فاشییەتی مۆدێرن. ئەوەشی ئەم ترسە گەورەتر دەکات، تەنها ئەزموونی جوندول ئیسلام و لەشکری مەهدیۆ و میلیشیاکانی بەدر نین، کە لەدوای کەوتنی سەدامەوە زیاد لە جارێک ئاکاری تۆقێنەرانەی خۆیان بە خەڵکی عێراق نیشان داوە، بەڵکوو بوونی ئەو کەلەپوورە ناشیرینەشە، کە ئیسلامی سیاسی لە سەردەمی شۆڕشی ئێرانییەوە تا ئەمڕۆ لە ناوچەکەدا بەرهەمی هێناوە، کەلەپوورێک ڕقێکی گەورەی لە مۆدێرنە تێدایە و لە پەلاماردانێکی بەردەوامیشدایە بۆ ڕووەکارە گرنگەکانی مۆدێرنە لەمڕۆدا. بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە ئەم هێزانە خۆیان هێزی مۆدێرن نین، لەناو مۆدێرنەدا، چەندان شێواز و ئاراستەی بیرکردنەوە هەیە، کە دژ بە مۆدێرنە خۆیەتی. لەو ناوچەیەی ئێمە تێیدا دەژین، ئەزموونی ئیسلامییەکانی تورکیا لە دەرەوەی ئەو نەخشە دینییە سیاسییەدان، کە من لێرەدا باسی دەکەم.

هەموومان لەیادمانە یەکەم پەلاماری شۆڕشی ئێرانی بۆ سەر دەرکەوتەکانی مۆدێرنە، بە پەلامار بۆ سەر ئافرەتان دەستی پێ کرد. سێ هەفتە بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی ئێرانی، ئایەتوڵڵا خومەینی داوای لە ئافرەتانی ئێران کرد پەچە بپۆشن. دوای شۆڕش، ئەم داوایە گۆڕا بۆ سیاسەتی بەزۆرپەچەپۆشکردنی هەموو ئافرەتانی ئێران، بە ئافرەتە مەسیحییەکانیشەوە و بە منالانی ئەو وڵاتەشەوە. گۆڕینی یاسای کاروباری کەسیەتی و دانانی شەریعەت لە شوێنی ئەو یاسایانە، یەکێک بوو لە کارە سەرەتاییەکانی تری ئەو "کولتووری ڕەسەنە"ی خومەینی و شۆڕشی ئێرانی لەگەڵ خۆیاندا هێنایان و خستیانە شوێنی ئەوەی لە ئێراندا کۆمەڵێک ڕۆشنبیری کەلەپوورپەرست و ڕەسەنگەرا ناویان نابوو "غەربزەدەیی." دەرکردنی داوەرە ژنەکان، دابەزاندنی تەمەنی شووکردن سەرەتا بۆ سیازدە ساڵ و دواتر بۆ نۆ ساڵ، لە دەسکەوتە گرنگەکانی

تری ئەم ئەزموونە "ڕەسەنە"ی شۆڕشی ئیسلامی بوو لە ئێراندا. ئەم سیاسەتی "ڕەسەنایەتییە" بە ئاستێک گەیشت، دەوڵەت دەستی خستە ناو سەرتاپای ژیانی تایبەتیی ئینسانەکانەوە، خەڵکی ناچار کرد بە شێوەیەکی تایبەت سەریان بتاشن، بە شێوەیەک، کە لەگەڵ زەوقی ئایەتوڵڵاکاندا بگونجێت، جلی تایبەت لەبەر بکەن و بۆیان نەبێت هەندێک یاریی تایبەت بکەن. هەموو ئەمانە لەپاڵ لەناوبردن و ڕاوەدوونان و بێدەنگکردنی دەنگە سیاسی و کولتووری و فیکرییە جیاوازەکان لە ئێراندا. بێگومان ئەم ئەزموونەی باڵە شیعییەکەی ئیسلام، تاقە ئەزموونی دەسەڵاتی دینی نییە لە ناوچەکەدا، ئەزموونی ئیسلامی سونی لە سوداندا هەمان تراژیدیای ئێرانی دووبارە کردەوە. جگە لە کوشتن و بڕین و ڕاوەدوونانی نەیارە دینی و سیاسییەکانیان، ئەم ئەزموونە دینییەی تر درێژەی بەو فۆبیای جنس و فۆبیای تێکەڵبوونەی نێر و مێیە دا، کە کاراکتەری سەرەکیی گروپە ئیسلامییەکانە لە زۆر شوێنی ناوچەکەدا هەیانبوو. جیاکردنەوەی نێر لە مێ لە سوداندا بە ڕادەیەک گەیشت، کە دەبووایە پیاوان بە پاسێک و ژنان بە پاسێکی دی هاتووچۆ بکەن، بەڕەسمی سەما و ئاهەنگگێڕان یاساغ بکرێت و لە ساڵی ١٩٩١یشەوە وەک هاوڕێ شیعەکانیان لە ئێراندا یاسای کاروباری کەسێتی بگۆڕن و شووکردنی منداڵانی ١٠ ساڵان حەڵاڵ بکەن.

عێراقی ئەمڕۆکەش سەروکاری لەگەڵ کۆمەڵێک هێزی ئیسلامیدایە، کە لەو هێزانە باشتر نین، کە لە ئێران و سوداندا ئامادە بوون.

# ئیسلام و ڕۆژئاوا

بڵاوکردنەوەی چەند وێنەیەکی کاریکاتێری لە ڕۆژنامەیەکی دانیمارکیدا لەسەر پێغەمبەری ئیسلام و دوای ئەویش بە چوار مانگ، دروستبوونی ئەو کاردانەوە توندانەی لە هەندێک لە دەوڵەتە موسڵمانەکاندا هاتە کایەوە، بۆ جارێکی تر زۆر بەتوندی مەسەلەی پەیوەندیی نێوان "ڕۆژئاوا" و "ئیسلام"ی هێنایەوە کایە. بێگومان ئەمە یەکەمین جار نییە ڕووداوی لەم جۆرە لە دنیای ئەمڕۆدا ڕوو بدات و ببێتە هۆی ئەوەی بابەتی سەرەکیی میدیا و سیاسەت و گفتوگۆکان لەدەوری ئەو پەیوەندییە بسووڕێتەوە، کە لەنێوان "ڕۆژئاوا" و "ئیسلام"دا لەئارادایە. لە ڕاستیدا کەم بابەت هەیە لە چارەکە سەدەی ڕابوردوودا ئەوەندەی پەیوەندیی نێوان "ڕۆژئاوا" و "ئیسلام"ی لەسەر نووسرابێت و بەشێوەی جیاواز باس کرابێت. کەچی لە هەمان کاتدا کەم بابەت هەیە ئەوەندەی ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی ناڕاست و ناماقوڵ قسەی لەسەر کرابێت و بۆ مەبەستی سیاسیی خراپ و ناشیرین خرابێتە گەڕ. بڕێکی زۆری ئەو باسکردنە ناماقوڵ و هەڵەیەش بووەتە هۆی دروستبوونی هەلومەرجێکی پڕتوندوتیژی و پڕڕق و پڕتووڕەبوونی کۆنترۆڵنەکراو. ئەو هێزانەش کە لە دروستکردنی ئەو هەلومەرجە توندوتیژ و گرژاوییەدا سوودمەند بوون، هێزە ئوسوڵی و توندڕەو و ڕاستڕەوەکان بوون، چ لە دنیای موسڵمانان و چ لە کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوادا. لە هەردوو دۆخەکەشدا بچووککردنەوە و

بەرتەسککردنەوەی پانتاییی ئازادیی کۆمەلایەتی و ئازادیی تاکەکەسی و ئازادیی ڕادەربڕین ئەو ئەنجامە بووە، کە ئەو دۆخە پڕ لە کێشمەکێشە دروستی کردووە.

لە سەرێکی دیکەوە، سروشتی سەرەکیی بەشێکی گەورەی ئەو نووسینانەی لەسەر پەیوەندیی نێوان "ڕۆژئاوا" و "ئیسلام" نووسراون، هێما بۆ بەدحاڵیبوونێکی گەورە و دووبارەکردنەوەیەکی ئینشاییی بێلەزەتی کۆمەڵێک پێشداوەریی ناڕاست و ترسناک دەکەن. ئەمەش وەک چۆن بە نیسبەت بەشی هەرە زۆری نووسینی ئیسلامچی و ناسیۆنالیست و ڕۆشنبیرە "ڕەسەنچی"یەکانی جیهانی موسڵمانانەوە ڕاستە، ئاواش بە نیسبەت بڕێکی بەرچاوی نووسەر و ڕۆژنامەنووس و ئەکادیمییە ڕۆژئاواییەکانیشەوە ڕاستە، بەتایبەتی بەشە ڕاستڕەو و کولتوورگەراکانی ڕۆژئاوا. سەرەڕای جیاوازیی زۆری نێوان ئەم دوو بەرەیە، بەلام هەردووکیان خاوەنی یەک ستراتیژین، ئەویش ستراتیژیەتی ترساندنی بەردەوامی کۆمەڵگەکانیانە. هەردوو بەرە، شووتی خەتەر بۆ کۆمەڵگەکانیان لێئەدەن، هاونیشتمانی و هاودینەکانیان لەو پیلان و مەترسی و پەلامارە دەرەکییانە ئاگادار دەکەنەوە، کە گوایە لایەنەکەی دیکە دەیەوێت بیکاتە سەریان. هەردوو بەرە باس لە پیلانی نهێنی بۆ لەناوبردنی یەکتری دەکەن، لانی کەم بۆ لەناوبردن و وێرانکردنی کولتوور و کەلەپوور و دین و بەها و ئەخلاق و هەموو ئەو شتە ڕەمزییانەی تریش، کە بە کۆمەڵگەکان شووناسێکی تایبەتی دەبەخشن.

لە بەرەی ڕۆژئاوادا، هێزە ڕاستڕەوەکان پەیوەندییەکی کاریکاتێری لەنێوان نەبوونی دیموکراسیەت و بوونی تیرۆر و بالادەستیی توندوتیژی لەنێو ئیسلامدا دروست دەکەن. دواکەوتنی کومەلایەتی، ڕێزنەگرتنی تاکەکەس، بەتایبەتی ڕێزنەگرتنی ئافرەت، دژایەتیکردنی جنس و جەستە و چێژ و ئازادی، پاراستنی هیرارکیەتی کۆمەلایەتی، بەهێزکردنی پاتریارکیەتی

خێزان، لاوازیی سیستمی پەروەردە، باڵادەستیی دیکتاتۆریەتی سیاسی و زۆر دیاردەی تریش ئەدەنە پاڵ ئیسلام وەک دین و وەک کولتوور. واتە ئیسلام لەم خوێندنەوە سادەیەدا دەبێتە ئەو هێزە ئەفسانەییەی تەفسیری کۆی قەیرانە جیاوازەکانی ئەو کۆمەڵگەیانە دەکات، کە زۆرایەتییان لە موسڵمان پێک دێن. لەم دیدەدا، ئیسلام هۆکاری هەموو نەخۆشی و خراپەکارییەکانە لەو کۆمەڵگەیانەدا.

ئیسلامییەکان، بە دیوی ئەودیودا، ڕۆژئاوا بە سەرچاوەی هەموو بەڵاکانی دونیا دەزانن، ڕۆژئاوا وەک هێزێک دەبینن، کە بە جیهاندا بەدئەخلاقی بڵاو دەکاتەوە، جیهان لە ڕۆح و ڕۆحانیەت دادەماڵێت، موقەدەس دەکوژێت و پەیوەندیی نێوان خوداوەند و کۆمەڵگە و خوداوەند و ئینسان تێک دەدات. ئەمە جگە لەوەی کە بە هێزێکی دادەنێن، کاری سەرەکی و یەکەمیی وێرانکردنی ئیسلام و پەکخستنی بەها دینی و کولتووری و ڕۆحییەکانیەتی. بەکورتی، ئەگەر هەندێک لە ڕۆژئاواییەکان جیهانی ئیسلام وەک کەمپێکی گەورەی پێگەیاندنی تیرۆریست و فەزایەکی پڕ فاناتیزمی دینی و سیاسیی و کولتووری وێنا بکەن، ئەوا ئیسلامییەکان ڕۆژئاوا وەک کارخانەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی بەدئەخلاقی و هەڕەشە و فشار و هێرش و پیلانی کولتووری و دینی و ئیمپریالی وێنا دەکەن. کێشەی ئەم دوو دیدە لەوەدایە، کە هەردووکیان تا ڕادەیەکی ترسناک لەسەر سادەکاری و گشتگیری و جەوهەرگەرایی دەژین. هەردووکیان یەکتری وەک دوو گشتی ناکۆک و پێچەوانە و دژ بە یەک دەبینن. دوو گشت، کە لەناو خۆیاندا هیچ جیاوازییەکیان تێدا نییە و هەریەکێکیان یەک شووناس و یەک لۆژیک و یەک عەقڵیەت و یەک خەیاڵ دەیبات بەڕێوە. لای بەرە ڕۆژئاواییەکە، ئیسلام گشتێکی هاوشێوە و وێکچوو بێ جیاوازییە، لای ئیسلامییەکانیش، ڕۆژئاواش، گشتێکی یەکڕەنگ و یەکدەنگ و یەکشێوەیە. ئەو پەیوەندییەشی ئەم دوو گشتە بەیەکەوە کۆ

دەکاتـەوە، ڕق و پیـلان و فشـار و هێرشـی بەردەوامـی ئەمیانـە بـۆ سـەر ئـەوی تریـان. هـەر لـەم دیدەشـەوە، مێژووی پەیوەندیـی نێوان ئـەو بەشـە جیاوازانـەی دونیـا دەخوێننـەوە و وەک مێـژووی جەنگێکـی دووروودرێـژی خاچپەرسـتی و ئیمپریالـی وێنـای دەکـەن، دوادەرکەوتـی ئـەم دیـدە ئـەو شـەڕە شارسـتانییەیە، کـە سـامۆیل هینگتینتـۆن لـە کتێبـە بەناوبانگەکەیـدا لەسـەر پێکدادانـی شارسـتانییەتەکان باسـی دەکات.

ئاشـکرایە ئـەوەی لـەم وێناکردنـە سـادەیەدا دەکوژرێـت، بیرۆکـەی جیاوازییـە، ئـەوەی وەلا دەنرێـت، ئـەو ڕاسـتییەیە، کـە ئیسـلام زیـاد لـە ئیسـلامێکە و ڕۆژئـاواش زیـاد لـە ڕۆژئاوایەکـە. هیـچ یەکێکیـان کـورت نابنـەوە بـۆ تاقـە شووناسـێک و بەهیـچ شـێوەیەکیش لەنێـوان ئـەو دوو بەشـەی دونیـادا، جەنـگ و پێکدادانێکـی "ئەنتۆلـۆژی" و شارسـتانی و کولتووریـی بێبڕانـەوە بوونـی نییە. ئەوەی لەم سـادەگۆییەدا دەمرێت، ئەو دیدەیـە کـە ئەمیـان ناکاتـە ئـەڵ تەرناتیڤـی ئـەوی دیکەیـان و بەمیـان ناڵێت "شارسـتانیەتێکی شـاقوڵی" و بـەوی دیـان "شارسـتانیەتێکی ئاسـۆیی،" کـە نەکرێـت و نەشـێت پێکـەوە بژیـن و لـە یەکـدی فێـر ببـن.

هـەر تێڕوانینێـک کەمێـک ڕێـزی مێـژوو و ڕێـزی ئینسـان و ڕێـزی کۆمەڵگـەکان بگرێـت، دەزانێـت نـە ئیسـلام یـەک ئیسـلامە و نـە ڕۆژئـاواش یـەک ڕۆژئاوایـە. نـە دونیـای ئیسـلام کارخانەیەکـی گـەورەی کۆپیکردنـی ئینسـان و کۆمەڵگـە و کولتـوورە، کـە هەموویـان وەک یـەک بـن و هیچیـان لەگەڵ ئەوی دیاندا جیاواز نەبێت، نە ڕۆژئـاواش ئەو کارخانە گەورەیەیە، کـە کۆمەڵگـە و ئینسـان و بەهـا و ئەخلاقـی وێکچوو دروسـت بکات. ئیسـلام لـە سـەرەتای دروسـتبوونیەوە، ئیسـلامێکی فرەجـۆر و فرەمانایـە، هێـزی جیـاواز و ناکۆکـی وەک سـونە و شـیعە، موعتەزیلـە و خەوارجـی دروسـت کـردووە، دیـدی جیـاوازی وەک سـۆفیزم و دۆگماتیـزم، فەلسـەفە و عیلمـی کەلامـی بەرهـەم هێنـاوە، هـەم پیاوکوژێکـی وەک حەجـاج و هـەم هیومانیسـت

یـان ئینساندۆسـتێکی وەک حـەلاج و ئیبن عەرەبی بەرهـەم هێنـاوە.

ڕۆژئـاواش لـە چەنـدان هێز و دەوڵـەت و میللـەت و کولتـووری جیـاواز پێـک هاتـووە. نـە لـە ڕووی سیسـتمی سیاسـیی و کۆمەڵایەتـی و ئابـووری و دەوڵەتییـەوە، نـە لـە ڕووی پێکهاتـی دینـی و پاشـخانی مێژوویـی و فەلسـەفی و ڕۆحییـەوە وەک یەکن. تەنانـەت لـە ئاسـتی مەسـەلەی دینداری و چۆنیەتیی ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان دین و سیاسـەت و دین و ژیانی گشـتیدا، جیاوازیـی گـەورە و بەرفـراوان لـە نێـوان وڵاتـە ڕۆژئاواییەکانـدا هەیـە. کورتکردنـەوەی ئـەم هەمـوو جیاوازییـە بۆ گشتێکی یەکڕەهەندی و یەکپێناسی، کورتکردنەوەیەکی نابەرپرسیار و ئایدیۆلۆژیی بەزۆر و ناڕاستە. تـەواو وەک جیهانـی ئیسـلام، جیهانـی ڕۆژئـاواش شـەڕەکانی ناوخۆی خۆی لـە شـەڕەکانی لەگـەڵ دەرەوەی خۆیـدا گەورەتـر و خوێناویتربـووە. وەک چۆن لە ئیسـلامدا هـەم خوێنڕێژ و هـەم ڕۆحانـی گـەورە هەبووە، ئـاوا لـە ڕۆژئاواشـدا، هـەم ڕۆحانییەکـی گـەورەی وەک گۆتـە و کیرکیجـارد هـەن و هـەم خوێنڕێژێکـی بێوێنـەی وەک هیتلـەر.

ئـەو وێنـە کاریکاتۆرییـەی کادرەکانـی ئیسـلامی سیاسـی و ڕۆشـنبیرە ڕەسـەنچییەکانی بۆ ڕۆژئـاوای دروسـت دەکـەن و ئـەو وێنەیـەش کـە هێـزە ڕاسـترەوەکانی ڕۆژئـاوا بـۆ ئیسـلامی دروسـت دەکـەن، وەک وتـم، لەسـەر سـادەکردنەوەیەکی ترسـناک و سـڕینەوەیەکی نابەرپرسـانەی هەمـوو ئـەو ئاڵۆزییانـە دەژیـی، کـە هـەم لـە هەنـاوی ئیسـلام و هـەم لـە هەنـاوی ڕۆژئـاوادا ئامادەیـە. کێشـەکەش لەوەدایـە، هەمـوو سـادەکردنەوەیەکی جیهـان و هەمـوو سڕینەوەیەکی نابەرپرسـانەی ئاڵۆزییەکانـی بـەم شـێوەیە، جگە لە گەورەکردنی ئەگـەری بەرهەمهێنانـی فاشیزم، هیچ شـتێکی دیکـەی لێ چـاوەڕوان ناکرێـت.

بـە بۆچوونـی مـن، باشـترین دروشـمێک بکرێـت لـەم سـاتەوەختە پـڕ هەڵبەزودابـەز و ڕق و پـڕ گرژییـەدا بەرزبکرێتـەوە، ئەمەیـە: "لێگەڕێـن بـا

کێ چی دەڵێت، بیڵێت و کێ چی دەنووسێت، بینوسێت." لە بەرەی ئیسلامەوە ڕاستییەک هەیە، هەموو موسڵمانێک لێی ئاگادارە، دینێک تەمەنی ١٤٠٠ ساڵ بێت و لە ئێستادا زیاد لە ملیارێک باوەڕداری هەبێت، بە نووسینی کتێبێک یان بڵاوکردنەوەی کاریکاتێرێک، لەناو ناچێت. وەک چۆن لە بەرەی ڕۆژئاوادا هەموو کەسێک دەزانێت، شارتانیەتێکیش کە تەمەنی مۆدێرنە لەناویدا زیاد لە سێ سەد ساڵی پڕ گۆڕان و قەیران و تازەبوونەوەی بەردەوام بێت، بە چوونەسەرجادەی چەند سەد، یان چەند هەزار کەسێک لە بەشێکی دیکەی دنیادا، لەناو ناچێت.

# گەڕانەوەی سانسۆری دینی

کێشـەی ئـەم دواییـیـەی نێـوان "مەریـوان هەڵەبجەیـی" و نووسـەر و ئیسـلامییەکان، دەرگا لەسـەر بابەتی سانسۆرکردن لە کوردستاندا دەکاتەوە، کـە یەکێکە لـە پڕمەترسـیترین بابەتەکانـی ئەمڕۆکـەی کۆمەڵگـەی کـوردی. سانسۆر لـە هەمـوو شێوەکانیدا، ئامێرێکی گەورەی بەرهەمهێنانی بێدەنگییە. هێزێکـە، کاری داخسـتنی دەم و عەقـڵ و خەیاڵـی ئینسـانە، سـتراتیژێکە، لەسـەر پەکخسـتنی توانـای بیرکردنـەوە و تێڕامـان و لێکدانـەوەی ئازاد کار دەکات. لەسـەر شـانۆی هـەر سانسـۆرێک، موقەدەسـێک ئامادەیـە، هەندێـک جـار ئـەو موقەدەسـە، نـاوی موقەدەسـی نەتەوەییـە، هەندێـک جـار نـاوی موقەدەسی چینایەتییە و هەندێک جاریش، ناوی موقەدەسی دینییە. بـەڵام لەپشـتی هەریەکێـک لـەم موقەدەسانەوە، گرووپێکی کۆمەڵایەتی هەیـە، کـە لـە ڕێگـەی بەرگریکـردن لـە موقەدەسـەوە، بەرگـری لـە دەسـەڵاتی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و ڕەمزیـی خـۆی دەکات.

لـە قووڵاییـی هەمـوو سیسـتمێکی سانسۆریشـدا، دیدێـک بـۆ هەقیقـەت ئامادەیـە، کـە لەسـەر لەناوبردنـی ئەگـەری بەرهەمهێنانـی هەقیقەتـی دیکـە کار دەکات. بێگومـان ئـەو هەقیقەتـەی لـە ڕێگـەی سانسـۆرەوە خـۆی دەپارێزێت، هەمیشـە هەقیقەتـی گروهێکـی کۆمەڵایەتیی دیاریکـراوە، کـە لـە ڕێگەی چەندەهـا کەناڵی جیاوازەوە بەسـەر کۆمەڵگـەدا سـەپێنراوە. بێگومـان پاراسـتنی مانـا باوەکانـی هەقیقـەت و موقـەدەس و شـیاو و نەشـیاو لـە

ڕێگەی سانسۆرەوە، پاراستنی نەخشەیەکی دیاریکراوی دەسەلاتە. وەک وتم، هیچ سیستمێکی سانسۆر نییە بە ناوی موقەدەسێکەوە کار نەکات. سۆسیالیزمی ستالینی موقەدەسی پرۆلیتاریای هەبوو، کە دەبووایە لە دەستدرێژیکردن و سووکایەتیپێکردنی نووسەرە بۆرجوازییەکان بپارێزرێت. بەعس خاوەنی سانسۆرێکی ناسیۆنالیستییانەی فاشییانە بوو، کە هەموو گومانکردنێکی لە موقەدەسەکانی بەعس، واتە گومانکردن لە "وەحدە و حوریە و ئیشتراکیەتی" بەعسییانەی وەک تاوانێکی گەورە وێنا دەکرد. لەمڕۆشدا هێزە دینیەکان، وەک ستالینییەکان و بەعسییەکان، دەیانەوێت بە ناوی پاراستنی موقەدەسی دینییەوە، پانتاییەکی گەورەی بێدەنگکردن و ترساندن و سزادان دروست بکەن. ئەگەر قۆناغی سانسۆری ستالینی لە ڕووسیادا هەژارترین قۆناغی داهێنان بێت لە مێژووی ئەو وڵاتەدا، ئەگەر قۆناغی سانسۆری بەعس قۆناغی زاڵبوونی "کولتووریی نائیب عەریفەکان" بێت بەسەر ژیانی فەرهەنگی و کولتووریی عێراقدا، ئەوا قۆناغی ئەم هێزە دینییانەی ئەمڕۆ، بێگومان قۆناغی زاڵبوونی هێزە "نیوەخوێندەوارەکانی" کۆمەڵگە دەبێت بەسەر ژیانی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری و ڕەمزیی ئێمەدا.

ئەگەر سیستمی سانسۆری بەعسییانە و ستالینیانە، ناهاوڕاکانیان بە ناپاک و خیانەتکردن لە نیشتیمان و نەتەوە و چین تاوانبار کردبێت، ئیسلامییەکانی ئەمڕۆ هەموو ڕەخنەکردنێکی موقەدەسی دینی وەک کوفر وێنا دەکەن. ئەگەر بەعس لە بەشێک لە ڕۆشنبیرانی نابەعسی ناسنامەی عێراقیبوونی سەندبێتەوە و ئەگەر ستالین بڕێکی زۆر لە نووسەرە ڕەخنەگرەکانی کوشتبێت، یان لە وڵات دەر کردبێت، ئەوا ئیسلامییەکان دینداری لە ڕەخنەگرانی خۆیان دەسێننەوە و لەسەر هەمان مۆدێلی ستالین و بەعس، سووک و ئاسان تەکفیریان دەکەن، ئاشکراشە نیازی ئەودیوی هەموو تەکفیرکردنێک، کوشتنە.

هەمووان دەزانن، سانسۆری دینی مێژوویەکی درێژی هەیە و هەریەکێک لە دینەکان بەپێی بەهێزی و لاوازیی دەسەڵاتی پیاوانی ئایین و دەسەڵاتی "فەرمانبەرانی کاروباری موقەدەس،" ئەم سانسۆرەیان پیادە کردووە. سووتاندنی کتێب یەکێکە لە سیاسەتە هەرە سەرەکییەکانی سانسۆری دینی لە مێژووی ئیسلامدا، ئەم سیاسەتە لەمڕۆشدا هەوادار و پیادەکەری هەر ماوە. دیارترین نموونەیەکی ئەم سیاسەتە، سووتاندنی کتێبەکانی سەلمانی ڕوشدی بوو لە کۆتاییی ساڵانی هەشتادا. سانسۆری دینی شتێک نییە تەنها لە ئیسلامدا هەبووبێت، لە مێژووی مەسیحیەتدا ئەم سانسۆرە زۆر جار شێوەیەکی وا پەرگیری گرتۆتە خۆی، تەنانەت ئەو چاپانەی ئینجیلیش یاساغ کراوە، کە لەلایەن پاپا خۆیەوە بڕیاری چاپکردنی نەدراوە. لە سەدەی شازدەهەمدا، پاپا لیستێک بە ناوی کتێبە یاساغەکانەوە بڵاو دەکاتەوە، کە تیایاندا ٦٠ چاپی جیاوازی ئینجلیشی تێدا بووە. ئەم لیستە، سەدە دوای سەدە ماوەتەوە و لە هەر سەدەیەکیشدا کتێبی تازەی خراوەتە سەر، تا لە ساڵی ١٩٦٦دا کەنیسەی کاسۆلیکی بڕیار ئەدات لیستەکە لا ببات و واز لە یاساغکردنی ئەو کتێبانە بهێنێت.

زانکۆی ئەزهەریش ساڵانە سەدان کتێب یاساغ دەکات و بڕێک لە نووسەرەکانیشیان دووچاری لێپرسینەوە و فشاربۆهێنان دەکات. تەنها لە ساڵی ١٩٩٦دا، ئەزهەر ٧٣ کتێبی یاساغ کردووە، کە دەکاتە یاساغکردنی نزیکەی دوو کتێب لە هەفتەیەکدا. ئەمە لە کاتێکدایە، کە ژمارەی ئەو کتێبانەی لە هەموو جیهانی عەرەبدا لە ساڵێکدا چاپ دەکرێن، بەقەد ئەوە نابێت کە دەوڵەتێکی بچکۆلەی وەک ئیسرائیل لە ساڵێکدا چاپی دەکات. بەشی هەرە زۆری ئەو کتێبانەش کە لە جیهانی عەرەبدا چاپ دەکرێن، کتێبی دینین و لەمانیش، بڕێکی گەورەیان کتێبی دینیی بێناوەڕۆک و پڕخورافەتن، کە گەشە بە عەقڵیەتی غەیبی و بیرکردنەوەی نالۆژیکی ئەدەن. سەیر لەوەدایە، ئیسلامییەکان بڵاوبوونەوەی ئەو هەموو کتێبە

دینییە بێناوەڕۆک و خورافییە بە مەترسی بۆ سەر تەندروستیی عەقڵی و ئاستی وشیاریی ئینسان لە وڵاتەکانی خۆیاندا نازانن، کەچی ئیخوانەکانی میسر، ڤیدیۆ کلیپەکانی نانسی عەجرەم و ئەلیسا و نەجلە بە مەترسی بۆ سەر ئەمنیی نەتەوەییی عەرەب لەقەڵەم دەدەن و داوای یاساغکردن و بڵاونەبوونەوەیان دەکەن. جگە لەمەش، ئیسلامییەکان خۆیان بە دەیان کتێب بڵاو دەکەنەوە، کە بەشێکی زۆریان گاڵتەکردنێکی تەواوە بە عەقڵ و خەیاڵ و تواناکانی بیرکردنەوە لە ئینساندا و بەشێکی تریشیان گاڵتەکردنە بە مافەکانی مرۆڤ و یەکسانیی نێوان ژن و پیاو، مسوڵمان و غەیرە مسوڵمان و باوەڕدار و بێباوەڕ. بەڵام کاتێک کەسێکی دی کتێبێک چاپ دەکات کە لەگەڵ دونیابینییە دینییەکانی ئەواندا یەک ناگرێتەوە، فەتوای تەکفیرکردنی دەر دەکەن و خەڵکی بۆ دەهێننە سەر جادەکان.

بێگومان هەموو جۆرە سانسۆرێک، دیاردەیەکی ترسناکە، بەڵام ترسناکیی سانسۆری دینی لەمڕۆکەی کوردستاندا، زۆر ترسناکترە. ئەم ترسناکییەش وابەستەی بنەما کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سانسۆرەیە لە کوردستاندا. ڕەگوڕیشە کۆمەڵایەتییەکانی سانسۆری دینی لای ئیسلامییەکان لە کوردستاندا لەناو ئەو بەشەی کۆمەڵگەی کوردیدایە، کە دین بە مانا هەرە تەقلیدی و دۆگمایی و چەپێنەرەکەی وەر دەگرێت. هێزگەلێک، کە لە لادێکاندا دەژین یان لە لادێکانەوە هاتوون و لە قەراغی شارە گەورەکانی کوردستاندا نیشتەجێ بوون. ئەمانە ئەو بەشەن لە کۆمەڵگەی ئێمە، کە دیدێکی هێجگار خورافییان بۆ دونیا هەیە و تێگەیشتنێکی نزیک بە فاشییەتیشیان بۆ دین هەیە. ئەم بەشە لە کۆمەڵگەی ئێمە، ئەو بەشەیە کە ئوسوڵییەکان لە مزگەوتەکاندا دەیانکەنە گریان، ڕیشیان وەک سونەتێک پێ دەهێڵنەوە و ژیانیان لە بەرچاو دەکەنە چاوەڕوانییەکی درێژ و بەردەوامی مردن. ئەمە ئەو بەشەی کۆمەڵگەی ئێمەیە، کە خوتبە سەرچاوەی تێگەیشتنیانە لە هەقیقەت، دەنگبەرزکردنەوە و هاوارکردن

و قیژاندنی خوتبەدەران، کاردانەوە سایکۆلۆژییەکانیان دادەڕێژێت و بەئاسانی بەو ئاقارانەدا دەبرێن، کە سووکایەتی بەرامبەر بەو کەسانە بکەن، کە وەک بێدین پێیان دەناسرێن. لە ڕاستیدا، بڕێکی بەرچاوی هێزە دینییەکان لەسەر هەژاریی ڕۆشنبیری و هەژاریی کۆمەلایەتیی ئەم هێزانە کار دەکەن و تۆوی توندڕەویی دینی و کۆمەلایەتییان تێدا دەچێنن.

ئەمڕۆکە ڕادەیەکی بەرچاو لە ئازادیی نووسین و بلاوکردنەوە و ڕادەربڕین لە کوردستاندا لەئارادایە، ئەم ئازادییەش وای کردووە لە دە سالی ڕابردوودا کۆمەلێک تێکست و کتێب و گۆڤاری گرنگ، لە کوردستاندا چاپ و بلاوبکرێتەوە. بەلام سانسۆری دینی دەیەوێت ئەو بێدەنگییەی لە کوردسستاندا لە دەرگاوە کراوەتە دەرەوە، لە پەنجەرەکانەوە بهێنێتەوە ژوورەوە. بۆیە بەگژاچوونەوەی سانسۆری دینی، ئەرکێکی گرنگی هێزە خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکانی کوردستانە. بەلام بۆ ڕێگرتن لە گەڕاندنەوەی سانسۆر، ئەوە بەس نییە یاسایەک هەبێت بەڕەسمی سانسۆر قەدەغە بکات، بەلکوو پێویستی بە کۆمەلگەیەکیشە، بوێرێت باسی خۆی بکات، دیاردەکانی هەناوی خۆی نەشارێتەوە و لە پەیوەندییەکی ڕەخنەییدا بێت لەگەل موقەدەس و ئەوانەی بە ناوی موقەدەسەوە قسە دەکەن.

# ئیسلامییەکان و شەریعەت و یاسا

ئیسـلامییەکانی کوردسـتان، ڕازی نابـن بـە دەسـتوورێک بـۆ کوردسـتان، تیایـدا شـەریعەت سـەرچاوەی سـەرەکیی یاسـادانان نەبێت، ڕازیـش نابـن بەوەی کە دەستووری کوردستان کەمتر لە دەستووری عێراق قورسایی بە دین لە دەستنیشانکردنی ماهیەتی دەستوورەکەدا بدات، داوای ئەوەش دەکەن، هیـچ یاسـایەک دەر نەچێت ناکۆک بێت بـە "حوکمـە نەگۆڕەکانـی ئیسـلام." بێگومـان ئـەم داواکارییانـەی ئیسـلامییەکانی کوردسـتان، جێگای سەرسوورمان نییـە، چونکـە تـا ئەمڕۆش، پـرۆژەی ئیسـلامییەکانی وڵاتـی ئێمـە، پرۆژەی بەئیسـلامیکردنی سـەرجەمی ژیانـی سیاسـی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی کوردستانە، پرۆژەی کردنی دینـە بە تاقە موقەدەسی کۆمەڵگە و پرۆژەی دروستکردنی نوخبەیەکە، کە بە نـاوی ئـەو موقەدەسـەوە داوای دەسـەڵاتی سیاسـی بـۆ خـۆی و داوای گوێڕایەڵـی لـە هەمـوو ئەوانـی تـر بـکات.

ئیسـلامییەکانی کوردسـتان، تـا ئـەم سـاتەش هەڵگری دیدێک نیـن لـەو ڕاستییە سـادەیە تێبگات، کە کۆمەڵگە نـەک یـەک موقەدەس، بەڵکوو چەندان موقەدەسـی هەیـە، هەروەهـا لـەوەش تێبگات، ئـەوەی کۆمەڵگە ڕادەگرێت و وای لـێ دەکات پارچەپارچـە نەبێت، یـان لانـی کەمـی یەکدیقبوڵکردنـی تێدا بێت، موقـەدەس نییـە، بەڵکوو کۆمەڵێک میکانیزمـی سیاسـی و کۆمەڵایەتی و دەزگاییـە، کە لـە فۆرمـی یاسـا و ڕێککەوتنـی سیاسـی و دەزگای پاراسـتنی

ئاسایش و ئامرازی سزادان و ئامێزانکردنی کۆمەڵایەتیدا بەرجەستەیە. واتە ئەوەی کۆمەڵگە دەکات بە کۆمەڵگە، ئەوەی لانی کەمی یەکدیقبوڵکردنی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەیەکدا دروستدەکات، ئەوەی وادەکات ئینسانەکان یەکتریان قبوڵ بێت، هێزی موقەدەسی دینی نییە، بەڵکوو کۆمەڵێک ئامرازی دیکەیە، کە سەرچاوەیەکی نادینییان هەیە. بەشێکی ئەو سەرچاوانە، پەیوەندیی بە ناچارییەوە هەیە، واتە جۆرێک لە ناچاری هەیە، وا دەکات ئینسان کۆمەڵگە دروست بکات، ئینسان لەپێناوی موقەدەسدا کۆمەڵگە دروست ناکات، بەڵکوو لەپێناوی ئەوەدا دروستی دەکات، کە بتوانێت ژیانی خۆی بپارێزێت. ئینسان بوونەوەرێکە بۆ مانەوەی خۆی پێویستی بە هاریکاریی ئینسانەکانی دیکە هەیە و ناتوانێت بەتەنها بژیی. بەشێکی دیکە لە خولیای ژیان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا لە حەزی پێکەوەبوونەوە لای ئینسان هاتووە، حەزی پێکەوەبوون حەزێکی ئینسانییە و لە توانای ئینسان بۆ خۆشەویستییەوە سەرچاوە دەگرێت. بەشێکی تری ویستی دروستکردن و پاراستنی کۆمەڵگە، پابەندی ترسە، ئینسان سەرەڕای حەزی بۆ دروستکردنی کۆمەڵگە لەبەر ئەو هۆیانەی باسم کرد، خۆشی سەرچاوەی مەترسییە بۆ کۆمەڵگە. بۆیە بۆ ئەوەی کەسانێک نەیەن بیانەوێت کۆمەڵگە لەناو ببەن، هەموو کۆمەڵگەیەک کۆمەڵێک دەزگای سەربازی و پۆلیس و ئاسایش و بەڕێوەبردنی هەیە، کاریان سزادانی ئەوانەیە، کە دەیانەوێت کۆمەڵگە لاواز یان لەبەریەک هەڵبوەشێننەوە. بەشێکی دیی مانەوە و پاراستنی کۆمەڵگە، پابەستی ئامادەیی دەزگاکانی ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتییە، کە وا دەکات ئینسان و گروپی جیاجیا لە یەک چوارچێوەی کۆمەڵایەتیدا کۆ ببنەوە و بڕیار بدەن پێکەوە بژین، لەوانەش، دەزگاکانی خوێندن و میدیا و پەروەردە و زمان و بەرهەمهێنانی ڕەمزی. بەشێکی تریش لە میکانیزم، یان ئامرازەکانی پاراستنی کۆمەڵگە، لەیەکهەڵنەوەشاندنەوە پابەستی دروستکردنی کۆمەڵێک بۆنەی سیاسی و

فەرهەنگی و وەرزشی و کۆمەڵایەتیی جیاوازە، کە تیایاندا ئینسانەکان کۆ دەبنەوە و هەم موونافەسەیەکی ڕەمزییان لەنێواندا دروست دەبێت، وەک لە وەرزشدا، هەم ڕۆحی هاریکاری، وەک لە یادکردنەوەی جەژنەکاندا. واتە ئەوەی کۆمەڵگە ڕادەگرێت، ئەو شتانەی سەرەوەن.

موقەدەسی دینی دەشێت بەشێکی بچووک بێت لەم گشتە گەورەیە، کە بەشدارە لە کۆکردنەوەی کۆمەڵگەدا بەیەکەوە، موقەدەسی دینی هەرگیز تاقە هێز نەبووە و نییە و نابێت لە کۆکردنەوەی پارچە جیاوازەکانی کۆمەڵگەیەکدا بەیەکەوە. کۆمەڵگەیەک نییە لە دونیادا بەتەنها موقەدەسی دینیی ئینسان و گروپە جیاوازەکانی ناوی پێکەوە کۆ کردبێتەوە. لەمەش بترازێت، موقەدەسی دینی وەک چۆن دەتوانێت هێزێک بێت ڕۆڵی هەبێت لە ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتی و کۆکردنەوەی بڕێک لە هێزەکان لەدەوری کۆمەڵێک باوەڕ، بە هەمان شێوە، دەشتوانێت هێزێک بێت ببێتە مایەی پارچەپارچەبوون و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوە و تێکچوونی ئارامی و ئاسایش و لاوازبوونی هاریکاریی کۆمەڵایەتی. موقەدەسی دینی دەتوانێت ببێتە پرۆژەی جەنگ و شەڕ و پێکدادانی نێوان خوێندنەوە و تێگەیشتن و دیدە جیاوازەکانی ناو هەمان موقەدەس، چ لەگەڵ یەکدا و چ لەگەڵ موقەدەسە دینی و نادینییەکانی دەرەوەی خۆشیدا. بە مانایەکی دیکە، ئەگەر دین یەکێک بێت لەو هێزانەی بتوانێت ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ لە کۆکردنەوەی هەندێک گروپ و دەستەی جیاوازی ناو کۆمەڵگەدا ببینێت، ئەوا دەتوانێت هێزێکیش بێت کۆمەڵگە بەشبەش بکات و نائارامی و بێمتمانەیی و ڕقی کۆمەڵایەتی گەورە بکات. هێزێک بێت، ئینسان بکاتە دوژمنی ئینسان و خوێن و سەربڕین و سووکایەتی بکاتە سروشتی ئەو پەیوەندییەی ئینسان بە ئینسان و گروپ بە گروپ و ئەم بەشی کۆمەڵگە بەو بەشی کۆمەڵگەوە، گرێبدات. مێژووی دین، کە بریتییە لە مێژووی دابەزاندنی موقەدەسی دینی بۆ ناو مێژوو، مێژوویەکە، ئەوەندەی شەڕوشۆڕ و

پەلامار و قڕکردنی ئینسانی لەلایەن ئینسانەوە تێدا بووە، سەدیەکی ئەوە مێژووی مەحەبەت و خۆشەویستی و ڕێزی ئینسان بۆ ئینسانی تر نەبووە. بۆیە هەموو ئەوانەی باس لە کردنی موقەدەسی دین بە بنەمای کۆکردنەوەی بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگە دەکەن، جگە لە درۆیەکی ئایدیۆلۆژی، شتێکی دیکەمان پێ ناڵێن. لە هەمان کاتدا، کردنی موقەدەسی دینی بەو "خوانەی گوایە کۆمەڵگەی لەسەر کۆ دەبێتەوە، " پرۆژەی تەسلیمکردنی سەرجەمی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ڕەمزییە بەو نوخبەیەی خۆی بە دەمڕاست و قسەکەر و وەکیل و عارفی ئەو موقەدەسە دینییە دەزانێت. بە هەمان شێوە، دروشمی کردنی شەریعەت بە سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانان لە دەستووری کوردستاندا، هەڵگری ئەو ستراتیژەیە، کە دەیەوێت سەرجەمی ژیانی یاسایی لە کوردستاندا بدرێتە دەستی ئەو نوخبە دینییەی کە بە ناوی شەریعەت و بە ناوی شتە نەگۆڕەکانی ناو دینەوە، بەدوای دەسەڵاتی سیاسیی خۆیدا دەگەڕێت.

بێگومان زیاد لە هێزێک لە ناوچەکەدا داوای بەدینیکردنی سیاسەت و بەشەریعەتکردنی یاساکان دەکەن و هەریەکێکیشیان بۆ مەبەستێکی تایبەتی ئەم داوایە بەرز دەکەنەوە. هێزە کۆنەپارێزەکان، بەتایبەتی بڕێکی گەورە لە پیاوانی ئایین، باس لە دەسەڵاتی شەریعەت دەکەن لەپێناوی بەدەستهێنانەوەی ئەو شوێن و جێ و مەوقیعە کۆمەڵایەتییانەدا، کە لە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتیدا لەدەستیان داوە. ڕۆشنبیرە کۆنزەرڤاتیڤە ڕۆمانسییەکان، لە دین و شەریعەتدا بەدوای "فەزیلە" و "حیکمەت" و "موتەعالی"دا دەگەڕێن و ئەم گەڕانەشیان دەشێت دەربڕی قەیرانێکی ڕۆحی بێت، بەڵام پەیوەندییەکی هێجگار ڕاستەوخۆشی هەیە بە گەڕان بەدوای دروستکردنی دەسەڵاتێکی ڕەمزیدا. بڕێک لە ناسیۆنالیستەکان لە شەریعەتدا بەدوای ڕەگوڕیشە و شووناس و

ڕەسانەیەتیدا دەگەڕێن، هێزە حاکم و گەندەڵەکانیش کە باس لە حوکمی شەریعەت دەکەن، بەدوای بەخشینی شەرعیەت بە دەسەڵاتی سیاسیی خۆیاندا دەگەڕێن، کە لە دەرەوەی باسکردنی دیندا زەحمەتە بتوانن ئەو شەرعیەتە بەدەست بهێنن. واتە هەریەکێک لەم هێزانە لەپشتی بەرزکردنەوەی دروشمی پیادەکردنی شەریعەت، یان کردنی شەریعەت بە سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانان، مەبەست و داواکارییەکی سیاسیی تایبەتی هەیە. ئەمەش نیشانی دەدات، کە بەرزکردنەوەی ئەم دروشمانە داواکارییەکی دینی نییە و پەیوەندیی بە خوداناسی و ڕێزگرتنی تێکستە دینییەکانەوە نییە، واتە مەسەلەیەکی فیقەهی و تیۆلۆژی نییە، بەڵکوو داواکارییەکی سیاسییە و پەیوەندیی بە چۆنێتیی داڕشتنی پەیوەندییەکانی دەسەڵات و سەرلەنوێ-دابەشکردنەوەی پایەکانی ئەو دەسەڵاتەوە هەیە.

لەمەش بترازێت، شەریعەت وەک پانتاییەکی یاسایی، بە پلەی یەکەم خەریکی ڕێکخستنی ئەو مەسەلانەیە، کە دەکرێت پێی بڵێین "ڕێکخستنی ژیانی تایبەت،" کە یاساکانی خێزان و ویراسەت و بازرگانی و شتی دیکەی لەم بابەتە دەگرێتەوە. مەسەلە گشتییەکانی ژیانی ناتایبەت، یان ژیانی گشتی و ژیانی سیاسی، مەسەلەیەک نین شەریعەت قسەی زۆر و وردی لەسەر کردبن. ئەو بەشەی شەریعەتیش کە باس لە مەسەلەکانی ژیانی تایبەت دەکات، بەتایبەتی باس لە مەسەلەی پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو و شوێنی ئافرەت لەناو خێزان و کۆمەڵگە و یاسا و دیندا دەکات، یان باسی شوێن و جێ و مافی کەسانی نادینی و غەیرە دین دەکات، هەڵگری کۆمەڵێک ئەحکامە، تەواو ناکۆکە بە سەرەتاکانی مافی مرۆڤ و بەشێکی گەورەی ئەو دەسکەوتانەی مرۆڤایەتی لەم چەند سەدەیەی ڕابردوودا بەدەستی هێناون.

# ترس لە عەلمانیەت

دیسانەوە بە بۆنەی نووسینی دەستووری داهاتووی کوردستانەوە، پرسیارێک کە پێویستی بە وەڵامدانەوە هەیە، پرسیاری شوێنی ئایینە لە ناو دەستووردا، بەتایبەتی شوێنی ئیسلام وەک ئایینی بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستان لە دەستووردا. ئایا وەزیفە گشتییەکانی دین چین لە واقیعی ئێمەدا؟ ئایا دین دەشێت بکرێت بەو چوارچێوە گشتییەی لەناویدا سەرجەمی شووناسە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگەی ئێمە جێگەیان ببێتەوە و لە پەیوەندییەکی یەکدیقبوڵکەر و هاوئاهەنگ و ئاشتیخوازدا بن لەگەڵ یەکدا؟ ئایا کردنی دین بە سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانان و کردنی بە "جەوهەری" گریمانکراوی "کولتووری کوردی" و کردنی بە "نەگۆڕێک، کە هیچ هێز و گروپ و لایەنێک بۆی نەبێت لێی لا بدات، کۆمەڵگەی ئێمە بەرەو کوێ دەبات و چ جۆرە کێشەیەک دروست دەکات؟ یەکێک کەمێک شارەزای پەیوەندیی نێوان دین و سیاسەت و دین و ژیانی گشتی بێت، دەزانێت کردنی ئەم پرسیارانە ڕاستەوخۆ دەمانخاتە بەردەم کێشەی عەلمانیەت لە کوردستاندا.

بەداخەوە، سەرباری گرنگیی عەلمانیەت وەک بابەتێکی تیۆری و سیاسی و فەلسەفیی گرنگ، کەچی بەدەگمەن نەبێت، لە کوردستاندا نووسینێکی زانستیمان لەسەر ئەم بابەتە نییە. ئەوەی هەیە، شەڕە دەنووکێکی بێ فیکر و بێ قووڵاییی نێوان ئەو دوو بەرەیەیە، کە لە

کوردستاندا بە ناوی بەرەی ئیسلامی و بەرەی عەلمانیەتەوە ئامادەن. لە سەریکەوە بەرەی ئیسلامییەکان عەلمانیەت لەژێر ناوی جیاوازدا وەک چەمکێکی شەیتانی و وەک لادان لە دین و وەک کوفر و دۆڕاندنی ڕەسەنایەتی و غەربزەدەیی ناو دەبەن، دەیکەنە چەمکێک دژ بە خودا و دژ بە پێغەمبەر و دژ بە موقەدەسی دینی، هەندێک جاریش ئەوەندە ناماقوڵ و توندڕەو و نەخوێندەوارانە ئەدوێن، عەلمانیەت بە "گەنوگوو" ناو دەبەن. لە سەرێکی دیکەوە، بەرەی عەلمانییە سادەدید و سادەفیکر و سادەگۆکان، مەسەلەی عەلمانیەت وەک ئامرازێک بۆ دژایەتیکردنی دین دەبینن و وای نیشان دەدەن، گوایە عەلمانیەت دوژمنی هەموو ڕۆڵێکی کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی دینە. بە مانایەکی دیکە، عەلماینەت وەک پرۆژەی دەرکردنێکی ڕادیکاڵی دین لە مەجالی گشتی و گێڕانەوەی بۆ مەجالی تایبەت، وێنادەکەن. ئەگەر ئیسلامییەکان دین بەسەرچاوەی هەموو شتێک بزانن و وەک ژێرخانی کۆمەڵگە و سیاسەت و ئەخلاق و فیکر و فەرهەنگ و بەهاکان مامەڵەی بکەن، ئەوا عەلمانییەکان دەیکەنە ڕەگەزێک، کە نابێت هیچ ئامادەگییەکی ئاشکرای لە ژیانی گشتی و کۆمەلایەتی و سیاسیدا هەبێت. لە ڕاستیدا هەردوو بەرەکە لەسەر نەناسینێکی ترسناک و خراپبەکارهێنانێکی گەورەی چەمکی عەلمانیەت دەژین، هەردووکیان هەڵوێست لە عەلمانیەت بە شێوەیەکی زۆر خراپ بۆ مەبەستی سیاسی و ئایدیۆلۆژیی تایبەت بەکاری دەهێنن و بەم بەکارهێنانەشیان، هەڕەشەیەکی گەورە لە ئارامی و ئاسایشی کۆمەلایەتی و سیاسیی کۆمەڵگەی ئێمە دەکەن.

ڕاستە تیۆرە تەقلیدییەکانی عەلمانیەت باس لە دابڕانی دین لە سیاسەت دەکەن، باس لەوە دەکەن، کە مۆدێرنە و دین بەیەکەوە ناگونجێن، پێیان وایە چەند پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەلایەتی بەرەو پێشەوە بڕوات، ئەوەندە دین لاواز و کەنارگیر و پەراوێز دەبێت. ڕاستە بەشێکی دیاریکراو

له سۆسیۆلۆژیای دین لەسەر ئەم گریمانە تەقلیدییە دەژیی، بەلام ئەم دیدە بۆ عەلمانیەت و ڕۆڵی دین، زۆر لە زووەوە لەلایەن دەیان و سەدان لێکۆڵەرەوە و نووسەر و زانای سیاسیی و کۆمەلایەتییەوە ڕەخنەکراوە. بەشی هەرەزۆری ئەم ڕەخنەگرانەش کەسانی عەلمانین و باوەڕیان بە سیستمی سیاسیی دینی نییە، بەلام لە هەمان کاتدا، نیشانی دەدەن کە مێژووی مۆدێرنە، مێژووی بێ ئیشکردنی دین یان بەتاڵکردنەوەی لە ڕۆڵی سیاسی و کۆمەلایەتی نییە، یاخود بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەلایەتی مانای پاشەکشەی دین لە ژیانی گشتیدا ناگەیەنێت. ڕەخنە لە تیۆرە تەقلیدییەکانی عەلمانیەت، ڕەخنەیە لە نەبینینی ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگە مۆدێرن و هاوچەرخەکاندا. تەمەنی عەلمانیەت لە ڕۆژئاوادا زیاد لە سێ سەدەیە، لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا عەلمانیەت نزیکەی سەدە و نیوێکە لەئارادایە، چ لەو سێ سەدەیەی ڕۆژئاوادا و چ لەو سەدە و نیوەی ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، دین بێ وەزیفە نەبووە، بوونێکی لاوەکی و پەراوێزیی نەبووە، هەم لە ژیانی تاکەکەسی و هەم لە ژیانی گشتیدا ڕۆڵی جیاواز و بەرچاوی بینیوە. بەلام نە بەو مانایەی کە دینییەکان و نە بەو مانایەش کە عەلمانییە توندڕەوەکان باسی دەکەن. واتە دین نە ئەوە بووە هەموو شتێک دەستنیشان بکات، نە ئەوەش بووە هیچ ئەرک و ڕۆڵێکی نەبووبێت.

بەکورتی، گەر عەلمانیەت یەکسان نەبێت بە پەراوێزکردنی دین، گەر دین تا ئێستاش وەزیفەی گشتی و کۆمەلایەتی و ڕەمزیی هەبێت، گەر تازەبوونەوەی کۆمەلایەتی مانای کەنارگیرکردنی دین نەبێت لە ژیانی کۆمەلایەتیدا، ئەی کە وا بوو عەلمانیەت چ مانایەکی هەیە؟ ئایا دەکرێت عەلمانیەت مانایەکی دیکەی هەبێت، بەدەر لە دابڕانی دین لە سیاسەت، یان لە گەڕاندنەوەی دین بۆ مەجالی تایبەت و دەرکردنی لە مەجالی گشتیی کۆمەلگە؟

وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بە بەڵێیە. بەڵێ، دەکرێت عەلمانیەت مانای دیکەی هەبێت، ئەم مانایەشی دەرەنجامی ئیشکردنی ئەو مێژووەیە، کە پرۆسەی بەعەلمانیکردنی کۆمەڵگەکان و پرۆسەی بەعەلمانیبوونی وشیاری لەم چەند سەدەیەی دواییدا هێناویەتە کایەوە. عەلمانیەت لە ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، هەوڵدانە بۆ دروستکردنی چوارچێوەیەکی گشتی، کە کەس تیایدا هەڵگری هەقیقەت و ڕاستی موتڵەق نەبێت. وەک چۆن لە ئاستی وشیاریشدا هەوڵدانی بەرهەمهێنانی عەقڵیەتێکە، کە لە ڕێژەییبوونی چەمک و پێدراو و بۆچوونەکانی خۆی ئاگادار بێت. لێرەدا عەلمانیەت مانای ئامادەگیی هێزەکانە بۆ چوونە ناو پەیوەندییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە لەگەڵ یەکدا لەسەر بنەمای ڕێژەییبوونی بۆچوونەکانی خۆیان و ڕێککەوتن لەسەر ئەو مانایانەی کە دەشێت پێکەوە بەرهەمی بهێنن. ئەمەش مانای ئەوەی هەر هێزێکی کۆمەڵایەتی، چ هێزە دینی و چ هێزە نادینییەکان، ئامادەبێت ڕێژەییبوونی دید و بۆچوون و تێگەیشتنەکانی خۆی قبوڵ بکات، ئامادە بێت بچێتە پەیوەندییەکی بەردەوامی دانوسانەوە لەسەر مانا و ناوەڕۆکی هەقیقەتەکانی لەگەڵ هێزەکانی تردا، هەقیقەت وەک دەرەنجامی دیالۆگ و گۆڕینەوەی ئەرگومێنت ببینێت، نەک وەک هەقیقەتێکی ئەزەلی و هەتاهەتایی، کە هێزێک هەڵگریەتی و هێزەکانی دیکە دەبێت گوێی لێ بگرن و قبوڵی بکەن، دەڵێم لە دۆخێکی لەو بابەتەدا، دین دەشێت خاوەنی پرۆژەی سیاسیی خۆی بێت، دین دەشێت بەشێک بێت لە سیستەمی سیاسی و بەشێک بێت لە دیالۆگ و بەرخوردەکانی ناو مەجالی گشتی کۆمەڵگە.

ئەم دیدە بۆ عەلمانیەت، نکوڵی لەوە ناکات دین ببێتە یەکێک لە گەمەکەرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕەمزییەکان لەپاڵ کۆمەڵێک گەمەکەری دیکەدا. ئەوەی عەلمانیەت دەیخوازێت، ڕێزگرتنی ئەو پرنسیپانەیە، کە ڕێژەییبوونی بۆچوونەکان دەپارێزێت و ڕێ لە

خۆبەموتڵەقکردنی هەر دیدێک لە دیدەکان دەگرێت. بەم مانایە، دەستووری عەلمانی دەستوورێک نییە ڕێگەی سیاسەتکردن لە هێزە دینییەکان بگرێت، بەڵکوو دەستوورێکە لەسەر دروستکردنی چوارچێوەیەکی سیاسی و یاسایی و فەرهەنگی کار دەکات، کە تێیدا ململانێی نێوان بۆچوونە جیاوازەکان لە ڕێگەی وشیاربوون بەڕێژەییبوونی هەریەکێکیانەوە ڕێک بخرێت. دەستوورێکی لەم بابەتە دەکرێت لەسەر ئەوە ڕازی بێت، کە دەوڵەت ئایینی ڕەسمی هەبێت، بەڵام دەبێت لە هەمان کاتدا ئازادیی ئەوەش دەستەبەر بکات، کە کەسێک بتوانێت بێدین بێت، یان لە دیندا بەدوای بەها و ئەخلاق و بنەماکانی ڕێکخستنی ژیانیدا نەگەڕێت، بەبێ ئەوەی ئەمە هیچ دەرەنجامێکی بۆ ماف و ئەرکەکانی هەبێت. دەستوورێکی لەو بابەتە، دەبێت بە دیندارێک و بێدینێک، بە موسوڵمانێک و مەسیحییەک، بە ئیسلامییەک و عەلمانییەک، یەک ماف و ئەرک ببەخشێت. دەکرێت دەوڵەت دینێکی ڕەسمیی هەبێت، بەڵام نابێت دەوڵەت ئەو دینە ڕەسمییە بەسەر هیچ گروپ و تاکەکەس و لایەنێکدا بسەپێنێت، وەک چۆن نابێت بوونی ئەو دینە ڕەسمییە ببێتە مایەی ئەوەی گروپێک لە گروپێکی دیکە مافی زیاتری هەبێت. لە ڕاستیدا ترس لە عەلمانیەت، ترس لە کافربوون و بێدینی نییە، بەڵکوو ترسی گروپێکی تایبەتە لە ڕێژەییبوونی هەقیەت و دەسەلات، گروپێک، هەموو شتەکانی بە موتڵەقی دەوێت.

١

# عەلمانیەت و دین

لە هەر تێگەیشتنێکی ڕاستەقینەدا بۆ عەلمانیەت، دەبێت دوو مەسەلە لە یەکدی جیا بکەینەوە. یەکەمیان ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەتە، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت "سیکیولاریزم." دووهەمیان پرۆسەی بەعەلمانیکردنە، کە بەرامبەرە ئینگلیزیەکەی "سیکیولاریزەیشن"ە. لە زمانی عەرەبیدا، بە یەکەمیان دەگوترێت "العلمانیة" و بە دووهەمیان دەگوترێت "العلمنة." واتە ئەوەی دەبێت لە یەکدی جیا بکرێتەوە، "ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەتە" لە "پرۆسەی بەعەلمانیبوون." ئەم جیاکردنەوەیەش جیاکردنەوەی ئایدیۆلۆژیایە، کە وێناکردنێکی تایبەتی بەرامبەر بە چۆنیەتیی ڕێکخستنی دین لە کۆمەڵگە و چۆنیەتیی ئامادەبوونی دین لە مەجالی گشتی و کایەی سیاسی و فەرهەنگیدا هەیە، لە ئامادەگیی کۆمەڵێک پرۆسەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵگەوە هەیە.

عەلمانیەت لە مانا تەقلیدیەکەیدا بەو ئایدیۆلۆژیایە دەگوترێت، کە تیۆریزەی پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی دەکات، یان بۆ تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی، چوارچێوەیەکی تیۆری پێشنیار دەکات، یان کۆمەڵێک ڕێگەی حەتمی بۆ شێوازی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی پێشنیار دەکات. بەکورتی، عەلمانیەت لە مانا سونەتی و تەقلیدییەکەیدا، دەیەوێت ئایدیۆلۆژیای چۆنیەتیی هاتنەکایە و دروستبوون و گەشەکردنی

دونیای مۆدێرن بێت. پێمان دەڵێت گەر بتەوێت مۆدرێن بیت، دەبێت چی بکەیت، هەندێک مەرج بۆ تازەبوونەوە دادەنێت، ئەو مەرجانەت تیا نەبێت، مۆدێرن نیت. یەکێک لەو مەرجانە، لاوازبوونی تەواوی ڕۆڵی دینە لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگەدا بە شێویەکی گشتی و لە ژیانی سیاسیدا بەتایبەتی. بێگومان وەک هەموو ئایدیۆلۆژییەکانی دونیا، عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا، لەپاڵ دەستنیشانکردنی هەندێک ڕاستیدا، هەڵگری کۆمەڵێک وەهم و دیدی ناڕاست و گریمانەی هەڵەیە. وەک هەموو ئایدیۆلۆژییەکان لە پەیوەندییەکی ناڕاست و یەکنەڕاستەیدایە بەو پرۆسانەوە، کە دەیەوێت لێکیان بداتەوە و وەسفیان بکات. کێشەی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا لەوەدایە، وێنەیەکی لەدایکبوون و دروستبوونی دونیای مۆدێرن و مێژووی مۆدێرنە دەکێشێت، کە لەگەڵ پێدراوە واقیعییەکانی ئەو دونیایەدا یەک ناگرێتەوە. لەنێوان ئایدیۆلۆژیای عەلمانی و خاسیەتەکانی ئەو دونیا مۆدێرنەدا کە تیۆریزەی دەکات، ناکۆکی و یەکنەگرتنەوەی گەورە هەیە. ئەمەش وا دەکات تیۆرەی عەلمانیەت وەک تیۆرەیەکی ئایدیۆلۆژی بڕێکی گرنگی سیفەتە گرنگەکانی دونیای هاوچەرخ نەبینێت، یان لێیان بێدەنگ دەبێت و وەک نەبوو مامەڵەیان دەکات، یان وەک دیاردەی پەراوێز و ناگرنگ لێیان دەڕوانێت، لەوانەش، چۆنیەتیی دیتن و مامەڵەکردنی دین و ئەو ڕۆڵەی کە لە دونیای مۆدێرندا دەیبینێت. گرنگترین گریمانەیەکی ئایدیۆلۆژی کە عەلمانیەت پێشنیاری دەکات، دروستکردنی ناکۆکییەکی قووڵە لەنێوان مۆدێرنە و دیندا، بە ڕادەیەک، هاتنی مۆدێرنە و پاشەکشەی دین، غیابی مۆدێرنە و ئامادەیی بەهێزی دین، وەک بەڵگەنەویست مامەڵە دەکات. لێرەدا ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت پێی وایە کە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و گواستنەوە لە دونیای بەر لە مۆدێرنەوە بۆ دونیای مۆدێرن، پرۆسەیەکە بەبێ لاوازبوون و کەنارگیربوون و بە پەراوێزبوونی دین ڕوو نادات. دونیای بەر لە مۆدێرنە وەک دونیایەکی

دینی و دونیای مۆدێرن وەک دونیایەکی کەم دین، یان بێدین، یان دونیایەک، کە دین تێیدا وەزیفەی کۆمەڵایەتی نییە، وێنا دەکات. هەر لێرەدا ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە لەگەڵ هاتنی مۆدێرنەدا دین وەزیفە گشتییەکانی لەدەست دەدات و دەبێتە بەشێک لە ژیانی تایبەتیی ئینسان خۆی. واتە مۆدێرنە دین ناچار دەکات لە مەجالی گشتییەوە بپەڕێتەوە بۆ مەجالی تایبەت و بەمەش وای لێ دەکات ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریدا نەمێنێت و تەنها وەک بەشێک لە ژیانی تایبەتیی هەندێک گروپ و دەزگای بچووک و تاکەکەسی تایبەت بمێنێتەوە. ئەم تێزە ئایدیۆلۆژییە، لە زۆر سەرەوە ناڕاستە و لەگەڵ چۆنیەتیی دروستبوون و هاتنەکایەی دونیای مۆدێرندا یەک ناگرێتەوە. چونکە ڕۆڵی دین لە ژیانی گشتی و سیاسیی دونیای مۆدێرندا بە هیچ مانایەک پەراوێز نەبووە، بێگومان ڕۆڵی دین گۆڕاوە، بەڵام دین پەراوێز و کەنارگیر نەبووە.

ئەگەر واز لەوە بهێنین کە ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی مۆدێرنە، لە ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم و فاشیزم و کۆمۆنیزمەوە بیگرە تا بە لیبرالیزم دەگات، هەر یەکێکیان ڕەهەند و کارەکتەرێکی دینیی گرنگی هەیە و لە زۆر کاتدا شێوازی کارکردنیان لەناو کۆمەڵگەدا وەک شێوازی ئیشکردنی دینەکان وایە. موقەدەس لەناو ئەم ئایدیۆلۆژیا عەلمانییە مۆدێرنەدا لەناو نەچووە، بەڵکوو لە ئاستێکی دیکەدا و بە شێوەیەکی دیکە سەرلەنوێ بەرهەم هاتۆتەوە. چۆنیەتیی مامەڵەکردنی کەسایەتیی سەرکردەکان، چۆنیەتیی مامەڵەکردنی پیاوە دینییە پیرۆزەکانمان بیر دەهێنێتەوە. دەڵێم گەر واز لەم ڕاستییانە بهێنین و تەنها تەماشای چۆنیەتیی ئامادەگیی خودی دین بکەین لە دونیای مۆدێرندا، بۆمان دەر دەکەوێت دین لەم دونیایەدا دیاردەیەکی پەراوێزی و ناگرنگ و بێڕۆڵ نییە، بەتەنها مەسەلەیەکی شەخسی نییە، لە مەجالی تایبەتدا نیشتەجێ نییە، بەڵکوو

بە شێوە و ناوەڕۆکی جیاوازەوە لەناو پرۆسە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکاندا ئامادەیە و ڕۆڵی تایبەتیش لە ژیانی سیاسی و فەرهەنگی و ڕەمزیدا دەبینێت، چ لە ئاستی تاکەکەسی و چ لە ئاستی گشتیدا. دین، بۆ نموونە، ڕۆڵێکی سەرەکی و سێنترالی گێڕاوە لە بەرهەمهێنانی شووناسی نەتەوەیی و شووناسی دەستەجەمعیی برێکی زۆر لە ولاتە ئەوروپییەکانی ئەمڕۆدا. پۆڵەندا، ئیرلەندا، یۆنان، ئینگلتەرە و ئیسپانیا و زۆری تریش نموونەگەلێکن، نیشانی دەدەن دین ڕۆڵی سیاسی و فەرهەنگی و ڕەمزیی گرنگی لە ژیانی ئەو کۆمەڵگەیانەدا بینیوە و دەبینێت. هەریەکێکیش لەم کۆمەڵگەیانە، کۆمەڵگەی مۆدێرنن و تا بینەقاقایان لەناو پرۆسە جیاوازەکانی بەعەلمانیبوون و بەمۆدێرنبووندا نوقمن. ئەمەریکا خۆشی نموونەیەکی تری ئەو ولاتانەیە، کە دین لە فۆرمی پرۆتستانیەتدا تییدا ڕۆڵێکی گرنگی لە دروستکردنی شووناسی نەتەوەییدا بینیوە و دەبینێت. بەلام ئەوەی ئامادەگیی دین لەو کۆمەڵگەیانەدا لە ئامادەگیی دین لە کۆمەڵگەیەکی وەک کۆمەڵگەی ئێمەدا جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە شێوازی ئیشکردنی دین و مانا و وەزیفە و ئەرکەکانی گۆڕاون. ئامادەگیی دین لە هەناوی ئەو ولاتە مۆدێرنانەدا مانای هاتنەکایە و دروستبوونی دەسەلاتێکی دینی نییە، مانای دروستبوونی مۆدێلێکی وەک مۆدێلی سعودیە و ئێران و سودان و تالەبان نییە. ئامادەگیی دین لەو ولاتە مۆدێرنانەدا مانای ئەوە نییە کۆمەڵێک پیاوی دینی، جا چ ئایەتوڵڵای بێ حزب بن، یان کەسانێکی ئەفەندی لەناو حزبی دینیدا، دەستنیشانی ماهیەتی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و کولتووریی ئەو کۆمەڵگەیانە بکەن، مانای ئەوە نییە هێزێکی دینی بێت و بیسەپێنێت کۆمەڵگە پێویستە چۆن بێت و چی بکات و چی نەکات، مانای ئەوە نییە هێزێک پێشوەخت و بەتەنها و لە تێگەیشتنی خۆیەوە سەرجەمی حەلال و حەرامە کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسیی و ئەخلاقییەکانی دەستنیشان کردبێت. لێرەدا دین داوای ئەوە

ناکات هەموو کۆمەڵگە بچێتە ژێر حوکمی یاسا و بەها و نرخە دینییە تایبەتەکانەوە، گروپێکی دینی کۆمەڵێک دەقی دینییان بەرز نەکردۆتەوە و هاوار ناکەن ئەوەی لە ئەحکامی ئەم دەقانە لا بدات، کافر و بێدینە و ئەرکی دەوڵەتە سزای شەرعی بەسەردا بسەپێنێت.

بەکورتی، ئەو دینەی لە دونیای مۆدێرندا ئامادەیە، دینێکە جیاواز لە دینی قۆناغەکانی بەر لە مۆدێرنە، دینێکە لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە لەگەڵ دونیای تازەدا، لەگەڵ پرۆسەکانی بەعەلمانیبووندا. واتە دینێکە بووەتە بەشێک لە پرۆسە گەورەکانی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی، دینێکە لەگەڵ زۆربەی دەسکەوتە گرنگەکانی دونیای مۆدێرندا گونجاوە و ڕەهەندە چەپێنەر و نادیموکراسی و تۆتالیتارییەکانی لەدەست داوە. واتە دینی ناو دونیای مۆدێرن، دینی دونیای بەر لە مۆدێرنە نییە، دینێک نییە بە زمانی ڕۆژگار و سەردەمێک بدوێت، جیاواز و ناکۆک بە دونیای مۆدێرن. ئیسلامییەکانی کوردستان دەبێت ئەم زمانە تایبەتەی دین لە دونیای تازەدا فێر ببن و واز لەو دروشمانە بهێنن، کە کۆمەڵگەی ئێمە بەرەو سەدە تێپەڕیوەکان دەگێڕێتەوە. لەپێش هەمووشیانەوە واز لەو دروشمە بهێنن، کە داوای کردنی شەریعەت دەکات بە سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانان.

# ئیسلام وەك ئایدیۆلۆژیا

سەدەی بیستەم لە دونیای موسڵمانانداا سەدەی گۆڕانی ئیسلامە، لە دینەوە بۆ ئایدۆلۆژیا. ئەم گۆڕانەش لە دوو ئاستدا بەرجەستە دەبێت. یەکەمیان، لە ئاستی پەیوەندیی ئیسلام بە ئەخلاقەوە، دووهەمیان، لە ئاستی پەیوەندیی ئیسلام بە سیاسەتەوە. لە یەکەمیاندا ئیسلام لە دینەوە، واتە لە کۆمەڵێک بڕوا و سروت و ئاکاری پەیوەست بە خواپەرستییەوە، دەگۆڕێت بۆ ئایدیۆلۆژیایەکی ئەخلاقی گشتگیر و هەمەلایەن. لە چالاکییەکەوە، کە بە خوداپەرستییەوە پەیوەستە و لە هەندێک ئاستیشدا ناکۆکە بە گرنگیدان و خۆخەریککردن بە دونیاوە، دەگۆڕێت بۆ سیستمێکی ئەخلاقیی هەمەلایەن، کە دەیەوێت سەرجەمی ژیانی دونیایانەی ئینسان بەڕێوە ببات. لەم ئاستەدا، ئیسلام لە دینەوە دەگۆڕێت بە "دین و دونیا،" لە پەیوەندیی نێوان خودا و ئینسانەوە دەگۆڕێت بۆ پەیوەندیی نێوان ئینسان و ئینسان و ئینسان و کۆمەڵگە.

گۆڕانی دووهەمیان، بریتییە لە گۆڕانی ئیسلام لە مەسەلەی باوەڕداری و خواپەرستییەوە بۆ ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی. لە ڕاستیدا ئەوەی بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئیسلامدا باس لەوە دەکات کە ئیسلام لە یەک کاتدا هەم دینە و هەم دەوڵەت، حەسەن بەننای دامەزرێنەری بزوتنەوەی ئیخوان موسلیمینە لە میسر. بەر لە حەسەن بەننا، کەس باسی لەوە نەکردووە کە ئیسلام هەم دینە، هەم دەوڵەت، واتە کەس

نەیوتووە ئیسلام باوەڕێکی دینی و ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسییە لە یەک کاتدا. هەموو خوێنەرێکی ئەم بوارە دەزانێت، نە لە قورئان و نە لە حەدیسدا، دەستەواژەی "دەوڵەت" بەکار نەهاتووە و بڕی هەرە گەورەی مێژووی سیاسیی ئیسلامیش، خۆی مێژوی دابڕانی دینە لە دەسەلاتی سیاسی. لە مێژووی ئیسلامدا بەدەگمەن نەبووبێت، سیاسەت و دین پێکەوە کۆ نەبوونەتەوە، "ئومەرا" و "عولەما" دوو هێزی لێکجیاواز بوون و هەریەکەیان ئەرک و وەزیفەیەکی تایبەتیی هەبووە. بڕی هەرە زۆری ئیسلامناسانیش لەسەر ئەو ڕایە کۆکن، کە ئیسلام هەڵگری تیۆرەیەکی تایبەت سەبارەت بە چۆنیەتیی پیادەکردن و بەڕێوەبردنی سیاسی نەبووە و نییە، واتە ئیسلام تیۆرەیەکی تایبەتی بۆ دروستکردن و بەڕێوەبردن و دامەزراندنی دەوڵەت نەبووە. دەوڵەت غائیبی ژمارە یەکی ناو فیکری سیاسییە لە ئیسلامدا. لەگەڵ هەموو ئەم ڕاستییانەدا، حەسەن بەننا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ئیسلام دەکاتە دین و دەوڵەت لە یەک کاتدا.
ئەو پرسیارەی کە دەکرێت لێرەدا بیکەین، ئەوەیە: ئایا ئەم گۆڕانە لە وێناکردنی حەسەن بەننادا بۆ ئیسلام لەکوێوە دێت؟ وەک وتمان، ئەم گۆڕانە پەیوەندیی بەوەوە نییە حەسەن بەننا شتێکی لە کەلەپووری فیکریی ئیسلامیدا دۆزیوەتەوە، کە کەسانی بەر لەو هەستیان پێ نەکردووە، لە ڕاستییدا، حەسەن بەننا خۆی لێزانی بواری دین نەبووە، کابرا مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بووە و دەرچووی زانکۆی ئەزهەر نییە، واتە لە هیچ یەکێک لە بوارە سەرەکییەکانی فیکری ئیسلامیدا لێزان، واتە موختەس، نەبووە. بۆیە ئەم گۆڕانە شتێک نییە پەیوەندیی بە ناسینی ڕاستەقنەی کەلەپووری ئیسلامییەوە هەبێت لای ئەو. بە بۆچوونی من، ئەم گۆڕانە لە سەرلەنوێ-پێناسەکردنەوەی ئیسلامدا، وابەستەی ناسین و شارەزابوونی خوێندەوار و ڕۆشنبیرە ئیسلامییەکانی سەدەی بیستەمە بە ئایدۆلۆژیا گەورەکانی مۆدێرنە. کردنی ئیسلام بە دین و دونیا، یان

بە دین و دەوڵەت، وابەستەی تێکەڵبوونی فیکری دینییە بە ئایدیۆلۆژییە گەورەکانی دونیای مۆدێرن، لەوانەش، سۆسیالیزم و لیبراڵیزم و فاشیزم. حەسەن بەننا لەسەر وێنەی ئەم ئایدیۆلۆژیا گەورانە، تێگەیشتنی خۆی بۆ ئیسلام دادەڕێژێت.

لە تێکستێکی سەرنجڕاکێشدا بە ناوی "ڕێنیسانسی نوێ،" حەسەن بەننا ئیسلام دەخاتە پەیوەندییەکی نوێوە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی مۆدێرنەدا. سەرەتا بەو شێوەیەی ئەو لەو ئایدیۆلۆژیایانە تێگەیشتووە، خاڵی هەرە سەرەکی هەریەکێک لەم ئایدیۆلۆژیایانە دەستنیشان دەکات و دواتر نیشانی دەدات کە هەریەکێک لەم خاڵانە لەناو ئیسلامدا بوونی هەیە. لەوێشەوە ئەنجامگیری دەکات و دەڵێت گوایە ئیسلام لە یەک کاتدا دەتوانێت ڕۆڵی لیبراڵیزم و ڕۆڵی مارکسیزم و ڕۆڵی فاشیزم ببینێت.

بە بۆچوونی بەننا، خاڵی سەرەکی و هەرە بەهێز لە سۆسیالیزمدا، بریتییە لە پێداگرتن لەسەر مەسەلەی یەکسانیی نێوان ئینسانەکان و نەهێشتنی جیاوازی لەسەر بنەمای چین و توێژ و شوێن و جێی کۆمەلایەتی. کە دێتە سەر فاشیزم، وەک ئایدیۆلۆژیایەک باسی دەکات، کە گرنگی بە هێز و نیزام و گوێڕایەڵی دەدات و ڕۆڵی سەرکردە بەرز ڕادەگرێت، ئەمە جگە لەوەی فاشیزم بە بەردەوامی داوا لە کۆمەڵگە دەکات ملکەچ و گوێڕایەڵی دەسەلات و سەرکردەکان بن. لیبراڵیزمیش وەک ئایدیۆلۆژیایەک دەبینێت، کە باس لە گرنگیی ڕای خەڵک و گرنگیی بەشداربوونیان لە ڕەخنە و ڕێنماییکردنی دەسەلاتدارە سیاسییەکاندا دەکات.

هەموو خوێنەرێکی ورد دەزانێت هیچ شتێک ئەم سێ ئایدیۆلۆژیا ناکۆکە بە یەکدی کۆ ناکاتەوە. هەریەکێک لەم ئایدیۆلۆژیایانە، لەناو ئەزموونی ڕۆژئاوا خۆیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان بە یەکدی ناکۆکن و هەریەکێکیان وێنەیەکی جیاوازی کۆمەڵگە و ئینسان و دەوڵەت و

ئازادی و بەرپرسیاریەت و سەربەخۆیی هەیە و ناکرێت هیچ یەکێکیان لەگەڵ ئەوی دیکەیاندا کۆ بکرێتەوە. بەلام حەسەن بەننا باز بەسەر ئەم سەرەتا زانستییە سادەیەدا دەدات و هەموویان لەناو ئەو تێگەیشتنە تازەیەدا جێگیر دەکات، کە بۆ ئیسلام پێشنیاری دەکات.

بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونەی کە گوایە ئیسلام لە یەک کاتدا مارکسیزم و لیبرالیزم و فاشیزمە، حەسەن بەننا مزگەوت بە نموونە دەهێنێتەوە. بەننا دەڵێت، لە مزگەوتا دەوڵەمەند و هەژار، گەورە و بچووک، بەهێز و بێهێز پێکەوە کۆ دەبنەوە و بێ جیاوازی لەپاڵ یەکدا نوێژ دەکەن و خودا دەپەرستن. لەم کارەشدا، کەس لەویتر زیاتر یان کەمتر، باشتر یان خراپتر نییە. بە بۆچوونی بەننا، لەم ئاستەدا ئیسلام و سۆسیالیزم لێک دەچن. دوای ئەوە بەننا باس لە ڕۆڵی ئیمام دەکات لەناو مزگەوتدا، ئیمامێک، کە لەناو مزگەوتەکەدا ڕێبەری یان سەرکردایەتیی ئیمانداران دەکات، نیزام دەپارێزێت و کە نوێژی کرد، پێویستە باوەڕداران لەدوایەوە بۆ نوێژکردن دامەزرێن و کە قسەشی کرد، دەبێت هەمووان گوێبیستی فەرمایشتەکانی بن و ئەو شتانە وەک ڕاستی وەر بگرن، کە ئەو بۆیان باس دەکات. بە بۆچوونی بەننا، ئیسلام لەم حاڵەدا لە فاشیزم دەچێت و وەک ئەو نیزام و گوێبیستی و هێز نیشان دەدات. دوای ئەمەش، حەسەن بەننا دێتە سەر باسکردنی ڕۆڵی ئیمانداران لەناو مزگەوت خۆیدا و باس لەوە دەکات، ئەگەر هاتوو ئیمام هەڵەیەکی کرد، یان شتێکی نابەجێی لێ دەر کەوت، ئەوکات ئەرکی سەرشانی ئیماندارانە ئامۆژگاریی ئیمام بکەن و بیهێننەوە سەر ڕێی ڕاست. لێرەشدا ئیسلام، بە بۆچوونی حەسەن بەنا، وەک لیبرالیزم وایە.

بەکورتی، حەسەن بەننا لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی بیستەمدا، ئیسلام لە پەیوەندیدا بە ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی مۆدێرنەوە، بە شێوەیەکی تازە لێک ئەداتەوە و بێ هیچ سڵکردنەوەیەکیش ئیسلام بە سەرجەمی

ئەو ئایدیۆلۆژیا گەورانە یەکسان دەکات. وەک دەبینین، ئەم خوێندنەوەیەی حەسەن بەننا بۆ ئیسلام، خوێندنەوەیەکە هیچ پەیوەندییەکی بە مێژوو و کەلەپووری ئیسلامەوە نییە، بەپێچەوانە، خوێندنەوەیەکە هەلومەرجی دونیای عەرەبی، بەتایبەتی هەلومەرجی وڵاتی میسر و بڵاوبوونەوەی ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی دونیای مۆدێرن لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەیهێنێتە کایەوە. بۆیە ئەو ئیسلامەی حەسەن بەننا بە ناوی گەڕانەوە بۆ "دین" و بۆ "ڕەچەڵەک" و بۆ "خود" و بۆ "ڕەسەنایەتی" باسی دەکات، ئیسلامێکی ئایدیۆلۆژیی تازەداهێنراوە و هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامی بەر لە خۆیەوە نییە، نە ڕەسەنایەتی تێدایە و نە دەرەنجامی گەڕانەوەیە بۆ زات و نە لە کەلەپوورەوە هاتووە و نە ڕەگوڕیشەیەکی دێرینی هەیە. ئەو ئیسلامەی حەسەن بەننا دای دەڕێژێتەوە، ئیسلامێکە ئاشنابوون بە سۆسیالیزم و لیبراڵیزم و فاشیزم دروستی دەکات.

بەم جۆرە و لە ڕاستیدا، لەنێوان ئیسلامی حەسەن بەننا و ئیسلامی پێش حەسەن بەننادا، دابڕان هەیە نەک بەردەوامی. ئەوەی حەسەن بەننا دەیڵێت و ئەوەی ئەو وەک ئیسلامی ڕاستەقینە پێشنیاری دەکات، ئیسلامێکە ڕەگەز و مانا و وێنە و زمانەکەی لەناو مارکسیزم و فاشیزم و لیبراڵیزمەوە هاتووە، نەک لەنێو ئایەتەکانی قورئان و قسەوباسی پێغەمبەر و حیکایەتی یاوەرەکانیدا. ئەو لۆژیکەش کە بێ هیچ دوودڵییەکی مەعریفی و بێ هەستکردن بە هیچ ناکۆکییەکی میتۆدی، مارکسیزم، لیبراڵیزم و فاشیزم بە یەکدی تێکەڵ دەکات، هەمان ئەو لۆژیکەیە، کە بێ هیچ دوودڵییەک ئیسلام بە دونیا و ئیسلام بە دەوڵەت تێکەڵ دەکات. ئەوەشی ئەم پرۆسەی تێکەڵکردنە دەبات بەڕێوە، مانا تەقلیدییەکانی دین و چۆنیەتیی ئامادەبوونی دین لە مێژووی دێرینی ئیسلامدا نییە، بەڵکوو دیدێکی سیاسیی هاوچەرخە، کە هەر پارچەیەکی لەناو یەکێک لە ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی مۆدێرنەدایە.

# پۆست ئیسلامیزم

پۆست ئیسلامیزم یەکێکە لەو چەمکە فیکرییە تازانەی لە بواری زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا، بۆ قسەکردن لەسەر دیاردەی ئیسلامی سیاسی، بەکار دەهێنرێت. ژمارەیەکی بەرچاو لە لێزانانی بواری زانستی سیاسی و ئەنترۆپۆلۆژیا و فەلسەفەی سیاسی بەکاری دەهێنن، لەپێش هەمووانەوە، "جیل کێپێل" و "ئۆلیڤەر ڕۆی" و "ئاسف بەیاد." ئەم ناوانە ناوە ناسراوەکانی بواری خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ئیسلامی سیاسیین لە دونیای ئەمڕۆدا.

بیرۆکەی سەرەکی لە چەمکی پۆست ئیسلامیزمدا، بریتییە لە سەرنەکەوتن و فەشەلهێنانی پرۆژەی ئیسلامی سیاسی، یان پرۆژەی ئیسلامیزم. پۆست ئیسلامیزم هێما بۆ هاتنەکایەی قۆناغێکی تازە دەکات، کە تیایدا ئیسلامیزم، کە هێزەکانی ئیسلامی سیاسی لە ساڵانی حەفتاوە سەرقاڵی پیادەکردن و بەرقەرارکردنین، فەشەلێکی بەرچاوی تووشبووە. بەڵام بۆ ئەوەی بزانین ئەم فەشەلە کە پۆست ئیسلامیزم باسی دەکات، چ مانایەکی هەیە، پێویستە وەک سەرەتا بزانین کە ئیسلامیزم خۆی چییە. ئەگەر پۆست ئیسلامیزم قۆناغی دوای ئیسلامیزم بێت، ئەی داخۆ ئیسلامیزم خۆی چی بوو؟

"ئۆلیڤەر ڕۆی،" ئیسلامیزم وەک پرۆژەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی وێنا دەکات، بە پلەی یەکەم، لە ڕێگەی پەلاماردانی دەوڵەت

خۆی و بەکارهێنانی توندوتیژییەوە. بە مانایەکی دیکە، پرۆژەی ئیسلامیزم، پرۆژەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامییە بە هۆی شۆڕش و خەباتی چەکداری و بەکارهێنانی توندوتیژییەوە، لەناو دونیاو کۆمەڵگە و سیستمێکی نێودەوڵەتیی ئیسلامیدا. ئەم پرۆژەیە لە ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاوە ئامادەیە و لەگەڵ شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیدا گوڕ و تینێکی گەورەتر وەر دەگرێت. لەگەڵ دامەزراندنی حکومەتی ئیسلامی لە هەریەکێک لە سودان و ئەفغانستانیشدا بە لووتکەی گەشەکردنی خۆی دەگات. ئیسلامیزم لەم تێگەیشتنەدا ئەو دیدە توندوتیژ و شۆڕشگێڕەیە، کە دەیەوێت لە ڕێگەی گرتنەدەستی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، کۆمەڵگە بە شێوەیەکی ڕادیکاڵ بەرەو ئیسلام بگەڕێنێتەوە و هێز و تواناکانی دەوڵەت بەکار بهێنێت بۆ بە ئیسلامکردنەوەی کۆمەڵگە. بێگومان بەرەو ئەو ئیسلامەی ئەوان بە ئیسلامی ڕاستەقینەی دەزانن. ئەم پرۆسەی گەڕاندنەوەیە بۆ ئیسلام لە ئەدەبیاتی سیاسیدا، پێی دەگوترێت پرۆسەی بەئیسلامیکردنەوەی کۆمەڵگە و بەئیسلامیکردنەوەی تاکەکەسەکان. ڕەگە قووڵەکانی ئیسلامیزم بەم مانایە لەناو ئەو بیرۆکە سەرەکییەی "سەید قوتب" و "مەودودی"دایە، کە کۆمەڵگە ئیسلامی و نائیسلامییەکانی دونیای ئەمڕۆ بە کۆمەڵگەی جاهیلی ناو دەبەن و موسڵمانەکانی دونیاش وەک کەسانێک مامە ڵەدەکەن، کە دینیان لەدەست داوە و بۆ قۆناغی بەر لە هاتنی ئیسلام، واتە بۆ جاهیلییەت گەڕاونەتەوە. پرۆژەی ئیسلامیزم بە ئەرکی خۆی دەزانێت ئەم کۆمەڵگە جاهیلییانە و ئەم ئینسانە جاهیلانە بگەڕێننەوە بۆ ناو ئیسلام. ئامرازی سەرەکیشیان لەمەدا، بەکارهێنانی توندوتیژی و هێرش و ترس و تۆقاندنە لە ئاستی تاکەکەسیدا و لە ئاستی کۆمەڵگەشدا. ئامرازی سەرەکیشیان بۆ ئەنجامدانی ئەم ستراتیژە، بەدەستهێنانی دەسەڵاتی دەوڵەتە بۆ سەپاندنی ئەو ئیسلامەی ئەوان بە ئیسلامی ڕاستەقینەی دەزانن.

چەمکی پۆست ئیسلامیزم، هێما بۆ فەشەلی ئەم پرۆژە تایبەتەی ئیسلامیزم دەکات. لە دیدی ئەو زانا و لێزانە سیاسییانەدا کە باسم کردن، فەشەلی ئیسلامیزم وای کردووە خاڵی سەرەکی و شوێنی سەرنج و مایەی گرنگیپێدان لای برێکی زۆری موسڵمانان لە سیاسەتەوە بگوازرێتەوە بۆ گرنگیدان بە دینداریی تاکەکەسی و شەخسی. پۆست ئیسلامیزم هێما بۆ گۆڕانی میزاج و چاوەڕوانیی برێکی زۆر لە موسڵمانان دەکات، بە ڕادەیەک، برێکی زۆری موسڵمانانی دونیا لەباتی پێداگرتن لە تێکەڵکردنی ئیسلام و سیاسەتبەیەکتری، پێ لەسەر تەرجەمەکردنی ئیسلام دادەگرن بۆ دینێکی شەخسی و سەرلەنوێ-داڕشتنەوەی وەک شێوازێکی تایبەت لە دینداری. لەم گۆڕانەدا، دین زیاتر وەک دیاردەیەکی ڕۆحانی دەر دەکەوێت، تا دیاردەیەکی سیاسی و وەک کۆمەڵێک سیمبۆل وێنا دەکرێت، بۆ نموونە لە فۆرمی حیجاب و ڕیشهێشتنەوە و پۆشینی جلوبەرگی تایبەتدا وەک بەشێک لە شووناسی تاکەکەسی، نەک وەک بەشێک لە پلان، یان پرۆژەیەکی سیاسی.

دەرکەوتێکی دیکەی فەشەلی ئیسلامیزم و هاتنەکایەی قۆناغی پۆست ئیسلامیزم، لاوازبوونی بەرچاو تا ڕادەی وازهێنانی هەندێک لە هێزە ئیسلامییەکانە لە بیرۆکەی ئینتەرناسیۆنالیزمی ئیسلامی. ئەمەش مانای دوورکەوتنەوە لەو دیدە دینییەیە، کە دونیای ئیسلام وەک گشتێکی یەکگرتوو و دانەبڕاو تەماشا دەکات. پۆست ئیسلامیزم لەم ئاستەدا مانای گەڕانەوە بۆ ناو سنوورە نەتەوەییەکانی بەرجەستەبوونی ئیسلام. لێرەدا ئیسلامیزم لە بزووتنەویەکی ئینتەرناسیۆنالیستییەوە دەگۆڕێت بۆ بزووتنەوەیەکی ناوچەیی ناو چوارچێوە و سنوورە لۆکاڵی و نەتەوەییەکان. ئەم گەڕانەوەیە بۆ ناو سنوورەکانی نەتەوە و وەرگرتنی ئەم ڕەنگ و ئاکارە ناسیۆنالیستییە، وەک دەرکەوتێکی دیکەی فەشەلی ئیسلامیزم دەبینێرت.

بەکورتی، لە پەیوەندیدا بە ئیسلامیزمەوە، پۆست ئیسلامیزم، مانای تەواوبوونی قۆناغی شۆڕشگێڕانەی ئیسلامی سیاسییە، کە تیایدا بیرۆکەی شۆڕش، بیرۆکەی سەرەکی بوو، جیهادیش لە شێوە سەربازییەکەیدا، ئامرازی سەرەکیی بەرپاکردنی ئەم شۆڕشە بوو. لەباتی ئەمە، پۆست ئیسلامیزم ئەو قۆناغەیە، کە تیایدا ئیسلام لەباتی ئەوەی لە شەڕدا بێت لەگەڵ عەلمانیەت و مۆدێرنە و دیموکراسیەت و لێبووردن و قبوڵکردنی ئەوی دی جیاوازدا، بەرەو ئەوە دەڕوات ببێتە هاوڕێگا و هاوماڵ و گونجاو لەگەڵ ئەو پێدراوە گرنگانەی دونیای هاوچەرخدا. پۆست ئیسلامیزم، قۆناغی گۆڕانی ئیسلامە لە ئایدۆلۆژیایەکی سەربازیی داخراوەوە، بۆ ئیسلامێکی وەرگر و قبوڵکەری دونیای دەوروبەری. پۆست ئیسلامیزم مانای بوونی ئیسلام بە بەشێک، تاقە بەشێک، لە دونیایەکی فرەڕەنگ و فرەدەنگ و پلورال، بەبێ ئەوەی تەماحی ئەوەی هەبێت یاساکانی ئەو دونیایە دیاری بکات و هەموو جیاوازییەکانی لەناو لۆژیکێکی دینیی کۆگیر و یەکگرتوودا کۆ بکاتەوە. بێگومان ئەم گۆڕانانە مانای ئەوە نییە کە ئیسلامی قۆناغی پۆست ئیسلامیزم، ئیسلامێکی عەلمانییە، یان ئیسلامێکی لیبراڵە، یان ئیسلامێکە ناسیاسییە. نا، ئەوەی ئەم ئیسلامە لە ئیسلامی قۆناغی ئیسلامیزم جیا دەکەتەوە، ئەوەیە کە ئیسلامێکی داخراو و نەفیکەر و شەڕکەر نییە. ئیسلامێک نییە تەماحی ئەوەی هەبێت هەموو کۆمەڵگە بە ڕەنگی خۆی ڕەنگرێژ بکات و حەقیقەتەکانی خۆی بەسەر هەمواندا بسەپێنێت. سیفەتی سەرەکیی پۆست ئیسلامیزم لەوەدایە، کە توانای لێبووردنی زیاترە، توانای قبوڵکردنی ئەوی دیی جیاواز و لەونەچووی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا، ئیسلامێکی سیاسییە. ئەم ئیسلامە ئامادەیە لەگەڵ دیموکراسیەت و دابەشکردنی حەقیقەتەکاندا بژیی. بێگومان پۆست ئیسلامیستەکان کەسانێکی عەلمانی نین، بەڵکوو هەم کەسانێکی باوەڕدارن و هەم باوەڕیشیان بەوە هەیە، کە دین ڕۆڵی

گرنگی هەبێت لە ژیانی گشتیدا. بەڵام لە هەمان کاتیشدا، ئەوەیان قبوڵە کەسان و لایەنی دیکە هەبن، تێگەیشتنەکانی ئەوانیان بەدڵ نەبێت و بە شێوەی جیاواز لەوان بژین و بیر بکەنەوە. بەبێ ئەوەی ئەم جیاوازییانە وا بکات جیاوازیی لە ماف و بەرپرسیاریەت لە نێوانیاندا دروست ببێت.

دەکرێت ئیسلامی پۆست ئیسلامیزم بە ئیسلامێکی ڕۆشنگەر ناو ببەین، ئیسلامێک، لەگەڵ عەقڵانیەت و جیاوازی و ناکۆکی و یەکسانی و هاووڵاتیبوونی جیاوازدا بژیی. ئەگەر ئیسلامیزم لە هەوڵی ئەوەدا بێت بەها دینییەکان بکاتە دەستنیشانکەری سیاسەت و یاسا و دەرکەوتە جیاوازەکانی ژیانی گشتی، ئەوا پۆست ئیسلامیزم ئەم تێگەیشتنە تۆتالیتێر و گشتگیرەی بۆ ڕۆڵی دین نییە. ئەو ڕۆڵە دەستنیشانکەرە هەمەلایەنە بە دین نابەخشێت، کە ئیسلامیزم پێی دەبەخشێت. دروستبوونی پۆست ئیسلامیزم، دەرەنجامی ئەو مێژووە خوێناوی و کارەساتئامێز و وێرانکەرەیە، کە دروستبوونی ئیسلامیزم لەگەڵ خۆیدا هێنای. باشترین نموونەی کەسانی پۆست ئیسلامی لە ئێران، عەبدولکەریم سروش و لەناو عەرەبدا تاریق ڕەمەزانە. لە ئاستی سیاسییشدا، حزبەکەی ئەردۆگان لە تورکیا نموونەیەکی گرنگی پۆست ئیسلامیزمە. پرسیار ئەوەیە، ئایا ئیسلامییەکانی کوردستان و ئەو نوخبە دینییەی ئەمڕۆ دەستنیشانی ماناکانی دین دەکەن لە کوردستاندا، دەتوانن ببنە هێزگەلێکی پۆست ئیسلامیزم؟

# لەعنەتی پیاوە دینییەکان
## چارەنووسی سپینۆزا و ئیبن ڕوشد

"بە بڕیاری فریشتەکان و کەسە پیرۆزەکان، ئێمە نەعلەتمان لە سپینۆزا کرد، ڕەفزمان کرد و وەلامان نا، لە ڕیزی بڕوادارانی جوولەکەدا دەرمان کرد. ئەو هەم ڕۆژەکانی بەنەعلەت کراوە، هەم شەوەکانی، هەم کاتی بێداربوونەوەی و هەم کاتی نوستنی، ئەو لە چوونەدەرەوە و لە هاتنەژوورەوەشیدا بەلەعنەت کراوە. بێگومان خوداوەندی گەورە ناوی ئەم پیاوە لە دونیادا دەسڕێتەوە و لە دەستەی جوولەکە ئیماندارەکان دای دەبڕێت. هیچ کەسێکیش نابێت بە هیچ جۆرێک قسە لەگەڵ سپینۆزادا بکات، چ بە دەم بێت یان بە نامەبۆنووسین، کەسیش نابێت هیچ جۆرە یارمەتییەکی بدات، کەس بۆی نییە لەژێر سەقفێکدا لەگەڵیدا دابنیشێت، ناشبێت کەس تا دووری چوار قۆڵ لێی نزیک بێتەوە. هەروەها کەس نابێت هیچ شتێک بخوێنێتەوە، کە ئەو نووسیبێتی، یان نووسیبێتییەوە."

ئەمەی سەرەوە تێکستی ئەو تڕۆکردن و بەنەعلەتکردنە دینییەیە، کە جوولەکەکانی شاری ئەمستردام لە مانگی حەوتی ساڵی ١٦٥٦دا فەیلەسوفی گەورە سپینۆزای پێ دەر دەکەنە دەرەوەی ناوەندە دینییەکەی خۆیانەوە، تێکستی بەبێدینکردن و بەدناوکردنی یەکێک لە فەیلەسوفە گەورەکانی مێژووی تازە. ئەم دەرکردنەش لە شێوەی کۆبوونەوەیەکی

ئاشکرا و گەورەدا لە شاری ئەمستردام ئەنجام درا: سەرەتا جوولەکەکان لە سیناگۆکێدا کۆ بوونەتەوە، سیناگۆک شوێنی پیرۆزی جوولەکەکانە وەک مزگەوت و کەنیسە لای موسڵمانان و مەسیحییەکان، دوای ئەوە فوو دەکرێت بە بووقدا و ئینجا مۆمە داگیرساوەکانی ناو سیناگۆکە یەک بەدوای یەکدا دەکوژێنرێنەوە. دوای ئەوانە، تێکستی دەرکردن و بەلەعنەتکردنەکەی سپینۆزا بە دەنگی بەرز دەخوێندرێتەوە. لەو کاتەدا کە پیاوە ئاینییەکانی جوولەکە سپینۆزا دەر دەکەنە دەرەوەی ئایینی جوولەکە و کۆمەڵگە دینییەکەی خۆیانەوە، سپینۆزا تەمەنی ٢٢ ساڵ دەبێت. دەرکردنی گەنجێکیش لەو تەمەنەدا و لەو سەردەمەدا بۆ دەرەوەی ئەو کۆمەڵگە دینییەی تێیدا ژیاوە، ژیانی ئەو کەسەی هێجگار زەحمەت و ناقۆلا کردووە. لەو تەمەنە گەنجەوە، سپینۆزا دەبێتە پیاوێکی بێ کۆمەڵگە و کەسێکی بێدین، بێگومان دین بە مانا ڕەسمی و دەزگاییەکەی ئەو سەردەمە، دەنا سپینۆزا خۆی کەسێکی باوەڕدار بوو. سپینۆزا دژی دینی پیاوە ڕەسمییەکانی ئایین، دینی ئەوانەی ماکس ڤێبەر ناویان دەنێت "فەرمانبەرانی کاروباری موقەدەس" بوو، دژی دینی هێز و تاکەکەسە سونەتگەر و تەقلیدییە داخراوەکانی سەردەمی خۆی بوو، کە جگە لە تێگەیشتنی خۆیان بۆ دین، هیچ تێگەیشتنێکی دیکەیان قبوڵ نەبوو.

لە مێژووی ئیسلامیشدا، شتێکی لەو بابەتە و خراپتریش بەرامبەر بە ئیبن ڕوشدی گەورەفەیلەسوف ئەنجام دراوە. وەک سپینۆزا، ئیبن ڕوشدیش بێدین دەکرێت و دەر دەکرێت و نەفی دەکرێت. جیاوازیی سەرەکیی نێوان ئیبن ڕوشد و سپینۆزا لەوەدایە، کە شکاندن و نەفیکردنەکەی ئیبن ڕوشد لە کۆتاییەکانی ژیانیدا بووە، لە کاتێکدا ئەوەی سپینۆزا لە گەنجیدا بووە. ئەگەر سپینۆزا لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا بێدین کرابێت و دەر کرابێت، ئەوا ئیبن ڕوشد لە تەمەنی (نزیکەی) ٧٢ ساڵیدا ڕووبەڕووی ئەم کارەساتە بووەتەوە، واتە لە قۆناغێکی تەمەنیدا،

کە خاوەنی چەندان کتێبی فەلسەفی و خوداناسی گەورە و گرنگ بووە. ئیبن ڕوشد ئەگەر گەورترین فەیلەسوفی دونیای ئیسلام نەبێت، ئەوا بێگومان یەکێکە لە هەرە فەیلەسوفە گەورەکانی ئەو دونیایە.

بە هاندانی کۆمەڵێک "عولەما"ی ئیسلام، خەلیفەی موسڵمانان، ئیبن ڕوشد بە لادان لە دین و بە سووکایەتیکردن بە موقەدەسات تاوانبار دەکات. ئەو تۆمەتانەش لە بەیانێکدا دەنووسرێتەوە و بەسەر سەرجەمی ئەو ناوچانەدا بڵاو دەکرێتەوە، کە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی خەلیفەوە. لە بەیانەکەدا دەربارەی ئیبن ڕوشد دەنووسرێت "لەناو تاریکیی بێئیمانیدا نوقمە... لە دەرەوەڕا خۆی بە کتێبەکەی خوداوەند داپۆشیوە، بەڵام لە قووڵاییدا پڕە لە ئینکاریکردن و ڕەخنەکردنی خوداوەند." بەیانەکە باس لەوە دەکات، کە ئیبن ڕوشد سەر بەو کافرانایە، کە "ئەو وەهمە لای خەڵک دروست دەکەن، کە گوایە عەقڵ ڕێپیشاندەریانە و ڕاستییش پێوەر و تەرازوویانە... لەمەشدا شەیتانێکیان لێ دەر چووە، بەڵام لە پۆشاکی ئینساندا." ئەمانە "ژەهرن و دەڕژێنە قوڵاییی تاریکی و گومڕاییییەوە... ئەمانە لە ڕووکەشدا، لە جلوبەرگ و زمان و ئاخاوتنیاندا لەگەڵ ئۆمەتی موسڵماناندا هاوڕا و تەبان، بەڵام لە قووڵاییاندا و لە دڕۆودەلەسەکانیاندا، دژ بەم ئۆمەتەن." دوای ئەوە، بەیانەکەی خەلیفە ڕوو دەکاتە موسڵمانان و دەڵێت، "ئەی موسڵمانان، خوداوەند سەرتان بخات، ئاگادر بن لەم هێرش و پەلامارە بۆ سەر ئیمان، لەم ژەهرەی دەڕژێنرێتە لەشتانەوە. هەرکەسێک کتێبێک لە کتێبەکانی ئەمانەی لا هەبێت، جەزاکەی چوونە ناو ئەو ئاگرەیە کە بۆ ئەو جۆرە کەسانە ئامادە کراوە. ئاگر مەنزڵگەی نووسەر و خوێنەرانی ئەو کتێبانەیە." وەک چارەسەرکردن و ڕێگرتن لەم "بێئیمانییەش،" خەلیفەی موسڵمانان ئەمری سووتاندنی هەموو کتێبەکانی ئیبن ڕوشد و کتێبە فەلسەفییەکانی تریش دەر دەکات، تەنها کتێبە پزیشکی و کتێبەکانی ماتماتیک و کتێبە گەردووناسییەکان نەبێت. جگە لەمە،

ئیبن ڕوشد لە بەردەمی دەرگای مزگەوتێکدا ڕادەگیرێت و هەرکەسێک دەچێتە ناو مزگەوتەکەوە بۆ نوێژکردن، دەبێت تفێک لە دەموچاوی ئەم فەیلەسوفە گەورەیە بکات. ئەگەرچی نەفیکردنەکەی ئیبن ڕوشد دوو ساڵی پێ دەچێت و دوای ئەوە مۆڵەتی گەڕانەوەی پێ ئەدرێت، بەلام ئەم پیاوە دڵشکاوە، ساڵێک دوای گەڕانەوەکەی دەمرێت.

وەک دەبینین، ڕادەی لێکچوونی تۆمەتبارکردنی سپینۆزا و ئیبن ڕوشد سەرسوورهێنەرە. ئەمانە گەرچی لەناو کەلەپووری دوو دینی جیاواز و لە دوو قۆناغی مێژوویی جیاواز و لە دوو تەمەنی جیاوازدا ژیاون، بەلام شێواز و ئەرگومێنت و چۆنیەتیی بەرەنگاربوونەی "بێئیمانی"یەکەیان وەک یەکە. ئەم وێکچوونەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کێشە قووڵ و گشتییەی کە فیکری دینی داخراو لەگەڵ بیرکردنەوەی ئازادا هەیەتی. ئەم کێشەیەش مێژوویەکی درێژی هەیە و تایبەتیش نییە بە دینێک لە دینەکان بەتەنها. مێژووی ئایین، بەگشتی پڕیەتی لە ساتەوەختی پێکدادانی توند و خویناوی نێوان بیرکردنەوەی ئازاد و ڕەخنەیی لەگەڵ ئەو بیرکردنەوە دینییە داخراوانەدا، کە وەک بیرکردنەوەی بالادەستی ناو عەقڵیەتی سونەتی و تەقلیدیی دینی لە ساتەوەختێکی مێژووییدا ئامادەن و نەک تەنها پاوانی هەموو لێکدانەوە و خوێندنەوە و ڕاڤەکردنەکانی دین دەکەن، بەڵکوو خۆیان بە خاوەنی یەکەمین و دواهەمین هەقیقەتیش دەزانن.

بێگومان زۆربەی کات پێکدادانەکانی دین لەگەڵ نوێبوونەوەدا، پێکدادانی نێوان دین و بێدینی نییە، نیشاندانی ئەم پێکدادانە لەم بەرگەدا بۆ داپۆشینی ڕووکارە ڕاستەقینەکانی ئەم پێکدادانەیە، کە لە ڕاستیدا پێکدادان و ململانێی نێوان چەند گروپێکە لەسەر دەسەلات و لەسەر پاراستن و بەرگریکردن لە کۆمەڵێک دەسکەوتی دونیایی. دین، یان ڕاستر بدوێین پیاوانی دین، یان ئەوانەی لە دیندا بەدوای شەرعیەتدا دەگەڕێن، دابڕاو نین لە ویستی دەسەلاتگەرێتی و دەسەلاتدۆستی.

ئەوانەی بە ناوی دینەوە دەدوێن، فریشتە نین، بەڵکوو ئینسانن بە هەموو ئەو خەون و ویست و چاوەڕوانی و داخوازی و تەماحانەوە، کە ئینسان لەناو خۆیدا هەڵگریەتی. گەڕانەوە بۆ دین ناکرێت بە هیچ جۆرێک دابڕێت لەو ململانێ سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕەمزییە بەردەوامەی بەدرێژایی مێژووی ئینسان لەئارادا بووە. ئەم ململانێیەش ململانێ نییە لەسەر خودا و ئاسمان، بەڵکوو ململانێیە لەسەر زەمین، لەسەر شوێن و جێی کۆمەلایەتی و لەسەر بالادەستکردنی ئەم سیستمی ڕەمزی یان ئەوی تر، ئەم پێناس یان ئەوی تر، هەمووشیان بەسەریەکەوە بەشێکن لە ململانێیەکی کۆمەلایەتیی سەرسەخت لەسەر دەسەلات. نە دین، نە هیچ هەڵسوکەوتێکی دیکە، دابڕاو نییە لە ویست و حەز و چاوەڕوانی و تەماحی تاکەکەسی و کۆمەلایەتیی بکەرەکانی. ئەوەی پێویستە تێی بگەین، ئەوەیە کە هەوڵ و ململانێی هێزە دینییەکان، هەوڵ و ململانێیەک نییە بۆ بردنەوەی بەختەوەری لە ئاسمان، بەڵکوو هەوڵ و ململانێیەکە بۆ کۆنترۆڵکردنی دەسەلات لەسەر زەوی.

# ڕووە تاریکەکانی دین لە کوردستاندا

ئەوەی ئەمڕۆ تەماشای شێوەکانی ئامادەگیی دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بکات، ڕووی بە زیاد لە گوتارێکی دینیدا دەتەقێتەوە، کە زۆربەیان لەگەڵ سەرەتاکانی دیموکراسیەت و سەرەتاکانی دادپەروەری و سەرەتاکانی عەقلانیەت و سەرەتاکانی وشیارییەکی هاوچەرخ و بەرپرسیاردا یەک ناگرنەوە. بەشێکی گەورەی وشیاریی دینی لە وڵاتی ئێمەدا، وشیارییەکە بارگاوی بە ڕق لە دونیا و ڕق لە بەختەوەری و ڕق لە ژیان، ڕق لەوی دی و ڕق لە جیاوازی و ڕق لە نادینی، لە هەمان کاتیشدا، بارگاوییە بە خۆشەویستییەکی ترسناک بۆ هێز و توندوتیژی و مەیلێکی تۆتالیتارانەی تۆقێنەر و پشتئەستوور بە هەوڵدان بۆ گۆڕینی دین لە پەیوەندییەکی ڕۆحییەوە بۆ ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسیی گشتگیر. ئەوەشی وا دەکات دین لە ڕووە خورافی و تۆتالیتارییەکەیدا کاریگەرییەکی دیاریکراو لەسەر بەشێک لە کۆمەڵگەی ئێمە بەجێ بهێڵێت، ئیشکردنی بەردەوامی وشیاریی دینییە لەسەر ئەو ژێرخانە خورافییەی وشیاریی تاکەکەسی و دەستەجەمعی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، کە دەکرێت بەئاسانی لەگەڵ تەفسیرە خورافییەکانی دیندا یەک بگرێتەوە.

لە دونیای ئێمەدا، خورافەتەکانی ناو دین دێن بۆ بەهێزکردنی پایەکانی ئەو خورافەتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەی لە کوردستاندا ئامادەیە. وەک چۆن لە هەمان کاتدا خورافەتە سیاسی و

کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانیش لە ڕێگەی خۆیانەوە پایەکانی خورافەتی دینی بەهێز دەکەن. لەناو ئەم دۆخە قەیراناوی و پرمەترسییەی وشیاریی دینیدا، دەکرێت باس لە دوو گوتاری دینی بکەین، کە نەک تەنها دین لە هەموو ڕەهەندێکی ڕۆحی و ئەخلاقی بەتاڵ دەکەنەوە، بەڵکوو دین لەوە دەر دەکەن، کە بەشێکی تەندروست بێت لە پێکهاتەی ویژدانی ئینسان و ئامرازێک بێت بۆ جوانترکردنی دەروون و جوانترکردنی کۆمەڵگە و جوانترکردنی ژیان. گوتاری یەکەمیان، گوتاری گەڕاندنەوەیەکی گەورە و بەرفراوانی وشیاریی دینییە بۆ خورافەت. بێگومان ئەم گەڕانەوەیە بۆ خورافەت، تەنها دژ بە پێدراوە عەقڵییەکانی وشیاریی هاوچەرخ نییە، بەڵکوو دژ بەو مێژووە درێژەی گۆڕان و پێشکەوتنی وشیاریی دینی خۆشیەتی، کە لە سەردەمی حاجی قادری کۆیی و مەحوی و مەلای گەورەوە، تا سەر عەلادین سوجادی و شێخ محەمەدی خاڵ و مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لە جووڵە و گۆڕانێکی بەردەوامدا بووە، بە ڕووی گۆڕانە گرنگەکانی دونیا و دەسکەوتەکانی زانست و ڕەهەندە ڕەخنەییەکانی وشیاریی هاوچەرخدا. بەم مانایە، گەڕاندنەوەی خورافەت بۆ وشیاریی دینی، نەک تەنها خیانەت لە گەشەکردنی واقیعی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی نادینیی کۆمەڵگەی ئێمە دەکات، بەڵکوو خیانەت لەو مێژووە گرنگەی گۆڕانی وشیاریی دینییش دەکات، کە نزیکەی سەدە و نیوێکە بەشێکە لە مێژووی وشیاریی دینی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا.

گوتاری دووهەم، گوتاری نیشاندانی دینە وەک قوربانیی گوناهەکانی دونیای هاوچەرخ، وەک دیاردەیەک، کە خەریکە لەناو دەچێت و دەپووکێتەوە. دیاردەیەک، گوایە لە بەردەم هەڕەشەی لەبیرچوونەوە و سڕینەوە و لەناوچووندایە لەلایەن ئەخلاقیات و دەزگا و ناوەندە نادینییەکانی کۆمەڵگەوە. ئەم گوتارەیان کۆمەڵگەی ئێمە وا وێنا دەکات، وەک ئەوەی کۆمەڵگەی فاحیشە و لەزەت و بەرەڵایی و بێدینی بێت.

کۆمەڵگەیەکی پەرێشان و بیمار و سەرلێشێواو، کە سەرچاوەی کێشەکانی لە بێدینییەکی بەرفراواندایە. کۆمەڵگەیەک، لەبیری چۆتەوە خودا چییە و داواکارییەکانی کامانەن؟ دین چییە و چۆن دەبێت پەیڕەویی لێ بکرێت؟

ئەگەر لەپشتی گوتاری یەکەمەوە هەوڵدانی پەکخستنی عەقڵ و داخستنی بیرکردنەوەی لۆژیکی و دروستکردنی حەماسەتێکی دینیی توندڕەو و پڕ مەتسی ئامادە بێت، ئەوا لەپشتی گوتاری دووهەمەوە، خەون و پرۆژەی بەدینیکردنێکی تەواوی سەرجەمی ژیانی تاکەکەسی و ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی فەرهەنگی و ژیانی ئەخلاقیی پەنهانە. یەکەمیان دەخوازێت کۆمەڵگەی ئێمە ببێتە کۆمەڵگەی خورافەت، دووهەمیان دەخوازێت کۆمەڵگەی ئێمە ببێتە کۆمەڵگەیەکی تۆتالیتاری و لە دین بەولاوە شتێکی دیکەی نەبێت ئینسان لەپاڵیدا و بە هۆیەوە بژیی. لە هەردوو گوتارەکەشدا، خەونی نوخبەیەکی دینی ئامادەیە، کە دەیانەوێت لە ڕێگەی ئەو وێناکردنە تایبەتەی دینەوە ببن بە بەشێک لە تەوەرە سەرەکییەکانی دەسەڵاتی ماددی و مەعنەوی لە کوردستاندا.

بەهێزکردنی خورافەت پرۆژەی ئەو بەشەیە لە نوخبەی دینی، کە ڕێگەی پتەوکردنی دەسەڵاتە ماددی و ڕەمزییەکەی بەناو فراوانکردنەوەی پانتاییەکانی خورافەتدا تێدەپەڕێت، بەناو دابڕینی دین لە هەر دید و خوێندنەوە و تێڕامان و لێکدانەوەیەکی عەقڵانی و لۆژیکی. لە کاتێکدا بە تۆتالیتاریکردنی دین لە ڕێگەی نیشاندانی دین وەک قوربانی و غەدرلێکراو و لەبیرکراو، پرۆژەی ئەو بەشەی نوخبەی دینییە، کە لە ڕێگەی بەگشتیکردنی دینەوە، سەرقاڵی پرۆژەی بەگشتیکردنی دەسەڵاتی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزیی خۆیەتی. لە هەردوو دۆخەکەشدا، زمانی دین دەبێتە زمانی دابەشکردنی کۆمەڵگە بۆ ئینسانی باوەڕدار و ئینسانی بێباوەڕ، موسڵمان و کافر، بێدین و دیندار، بەئەخلاق و بێئەخلاق.

هەروەها داواکردنی بەهێزکردنی لایەنی یەکەمی ئەو دابەشکردنە و بەگژاچوونەوە و سزادان و بێمافکردنی لایەنی دووهەمیان. ئاشکرایە ئەم دابەشکردنە پرۆژەی پشێوی و نائارامییەکی کۆمەڵایەتیی گەورە و ترسناکی لە پشتەوەیە و دوادەرەنجامیشی بریتی دەبێت لە دابەزاندنی جەهەنەم لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی.

تازەترین دەرکەوتی گوتاری یەکەمیان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، لە خورافەتی "هاتنی پێغەمبەر بۆ هەولێر"دا بەرجەستەیە، کە لەماوەی ڕابردوودا لە ڕێگەی میدیاکانەوە بڵاو بووەوە. لە کاتێکدا تازەترین دەرکەوتی گوتاری دووهەمیان لە ڕێگەی قسەوباسی هەندێک لەو مەلا و خوێندەوارە دینییانەوە دەر کەوت، کە باس لەوە دەکەن، گوایە ئەو مەودایەی ئەمڕۆکە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بۆ سەیرانکردن و تەفریح و هەڵپەڕکێ و ڕەشبەڵەک و خواردنەوە کراوەتەوە، نیوئەوەندە لە بەردەم دیندا نەکراوەتەوە. ئەم بۆچوونە دەیەوێت بڵێت دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا لە دۆخی بەقوربانیبوونێکی بەردەوام و گەورەدا دەژیی.

بەڵام ئایا بەڕاستی کۆمەڵگەی ئێمە بەرەو ئەوە دەچێت ببێت بە کۆمەڵگەیەکی نادینی؟ ئایا بەڕاستی کۆمەڵگەی ئێمە کۆمەڵگەیەکە دینیی تێدا پشتگوێ خراوە؟ ئایا ڕاستە چێژ و لەزەت و تەفریح، دینیان پەک خستووە؟ ئایا ڕاستە دین لەژێر فشاری وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانەدایە، یان ڕێک پێچەوانەی ئەم شتانە ڕاستن؟ سەرنجێکی خێرا لەو کەناڵانەی دین لەمڕۆدا و لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، بۆ تەعبیرلەخۆکردن لە بەردەستیدایە، بێ بناغەیی و ناڕاستی و خورافەتی ئەو بۆچوونانەمان بۆ دەر دەخات. لە مێژووی کۆمەڵگەی ئێمەدا، دین هیچ کاتێک بە ڕادەی ئەمڕۆ کەناڵی ئامادەبوون و بڵاوبوونەوە و خۆبەهێزکردنی لە بەردەمدا نەبووە. دین نەک تەنها خاوەنی چەندان حزبی سیاسیی چەکدار و بێچەکە، بەڵکوو خاوەنی چەندان ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن و ڕۆژنامە و بڵاوکراوە و چاپخانە

و کۆلێژ و پەیمانگا و کۆڕ و کۆمەڵی تایبەتیشە. دین وەزارەتێکی تایبەت بە خۆی هەیە، لەناو دەستوور و یاسا و دادگاکاندا ئامادەیە، تۆڕێکی گەورەی مزگەوت و تەکیە و خانەقای لە بەردەستدایە، کە ئەگەر لە مقەڕ و ناوەندە حزبییەکان بەسەریەکەوە زیاتر نەبێت، کەمتر نییە. هەر بۆنموونە، تەنها لەناو شاری هەولێردا، ٢٢٧ مزگەوت و ١٦ تەکیە هەیە، لە دهۆک، ٥١ مزگەوت هەیە، لە سلێمانی، نزیکەی ١٧٠ مزگەوت هەیە. ئەمەش مانای ئەوەیە، هەر گەڕەکێک لە گەڕەکەکانی شارە گەورەکانی کوردستاندا، ئەگەر سێ مزگەوتی زیاتر تیا نەبێت، ئەوا کەمتری تیا نییە. لە کاتێکدا لە شارێکی وەک سلێمانی، تەنها دوو سینەما و یەک کتێبخانەی گشتی و دوو تا سێ گەلەری هەیە. هەموو ئەمانە نیشانمان دەدەن، دین چ مەجالێکی گەورە و ئەفسانەییی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا لە بەردەمدایە. دین نەک پشتگوێ نەخراوە و پەکی نەکەوتووە، بەڵکوو لە هەموو شتێکی تر زیاترە لە کوردستاندا. کۆمەڵگەی ئێمە پێویستی بە دینی زیاتر نییە، کۆمەڵگەی ئێمە پێویستی بە دینی کەمتر، بەڵام باشتر هەیە. پێویستی بە دینێک هەیە، دوور لە خورافەت و دوور لە مەیلی تۆتالیتاریانە، دینێک، ژیان دەوڵەمەند بکات، نەک وێرانی بکات.

# دین و دەوڵەت

پەیوەندیی نێوان دین و دەوڵەت، یەکێکە لەو پەیوەندییە ئاڵۆزانەی لە دونیای نوێدا شێوازی جیاجیای گرتووەتە خۆی. ئەگەر لە فەرەنسادا، دین و دەوڵەت بە شێوەیەکی شاقوولی لە یەکدی جیا کرابنەوە و دین وەک مەسەلەیەکی تایبەت و شەخسی تەماشا بکرێت، ئەوا لە بەریتانیا و یۆنان و دانیمارک و ئیسپانیا و زۆر وڵاتی دیکەشدا، ئەم جیاکردنەوەیە بەو شێوە شاقوولییە نییە و دین و دەوڵەت بە شێوازی جیاواز بە ناویەکدا چوون. بەڵام ئەم بەیەکداچوونەی دین و دەوڵەت لەو وڵاتانەدا، مانای ئەوە نییە ئەو وڵاتانە دیموکراتی نین و ئینسان تیایاندا ئازاد نییە و ناتوانێت بۆچوون و هەڵوێست و شێوەژیانی تایبەت و ئازادانەی خۆی هەبێت و بەئاشکراش پیادەیان بکات. یان ئینسان ناتوانێت بێدینبوونی خۆی ڕابگەیەنێت و بەئاشکرا ڕەخنەی دین و پیاوانی دین و دید و بۆچوونە دینییەکان بکات. بەپێچەوانەوە، هەریەکێک لەو وڵاتانە، وڵاتی پێشکەوتوو و دیموکراتن و ڕێزی تەواو لە مافەکانی مرۆڤ دەگرن و ئینسان ئازادیی ڕادەربڕین و بوون و نەبوونی دینیی هەیە. بۆیە ئەو پرسیارەی لێرەدا دروست دەبێت، ئەوەیە ئایا چۆن دەوڵەتی دیموکراسی، ئازادیی ڕادەربڕین و ئازادیی شێوازی ژیان و ئازادیی بوون یان نەبوونی دین لەگەڵ بوونی دینێکی ڕەسمیدا کۆ دەکاتەوە؟ چۆن دەوڵەتێک خۆی بە خاوەنی دینێک بزانێت، دەتوانێت دیموکرات و ڕێزگری مافەکانی

مرۆڤ بێت، بە مافی نەبوونی دینیشەوە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، پەیوەندیی بە تێگەیشتنی ئەو وڵاتانەوە بۆ دین و بۆ دەوڵەت هەیە.

ئەو وڵاتانە لە تێگەیشتنیاندا بۆ دین، دین ناخەنە شوێنی سیاسەت و بە هیچ مانایەک دین لەو وڵاتانەدا لە سیاسەت گرنگتر نییە. لەو ئەزموونانەدا، دین دەستنیشانی ئەوە ناکات سیاسەت چی بێت و چۆن بێت، چی دەتوانرێت بکرێت و چی ناتوانرێت، چی حەڵاڵە و چی حەرامە. سیاسەت کایەیەکی سەربەخۆیە و یاسا و فۆرم و بەهای تایبەتیی خۆی هەیە، کە لە دینەوە وەریان ناگرێت. سیاسەت خۆی حەلال و حەرامی خۆی دەستنیشان دەکات و خۆی بڕیاری ئەوە ئەدات چی بکرێت و چی نەکرێت، نەک حەلال و حەرامە دینییەکان بکات بە حەلال و حەرامی خۆی. بەڵام ئەمە مانای تێکەڵنەبوونی دین و سیاسەت بە یەک نییە، مانای ئەوە نییە کە دین ئەرک یان وەزیفەی سیاسیی نییە، یان بەشێک نییە لە ژیانی گشتی لەو وڵاتانەدا. بێگومان دین دەتوانێت لە ئاستی جیهانبینیدا هەندێک هێڵی زۆر گشتی بکێشێت، کە بکرێت سیاسەت هەندێکیان پەسەند بکات، بەڵام لە هەموو دۆخێکدا دین کە دەچێتە ناو سیاسەتەوە چیدی قسەکردنی لەسەر خۆی، قسەکردنێکی دینی نابێت، بەڵکوو بە زمانی سیاسەت ئەدوێت و یاسا و نۆرم و بەهاکانی سیاسەت بەکاردەهێنێت. ئەمەش مانای ئەوەی دین وازی لەوە هێناوە بە ناوی موقەدەسی دینییەوە بدوێت و بە ناوی موقەدەسی دینییەوە تەماشای دونیا و دیاردە سیاسییەکان بکات. دین لەم دۆخەدا لەباتی قسەکردن بە ناوی موقەدەسەوە، بە ناوی ململانێ و کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە ئەدوێت و خوازیاری دۆزینەوەی چارەسەری دیموکراسی و ئینسانییانەیە بۆ ئەو کێشانە. دین لێرەدا دەبێتە یەکێک لەو گەمەکەرە زۆرانەی کە لە کۆمەڵگەیەکدا ئامادەیە و خۆی بە هەڵگری دیدێکی موقەدەس نازانێت، کە دەبێت هەموو هێزەکانی دیکە گوێی لێ بگرن و ئەوەشی لێی لادات

هەڵە و بێدین و بێماف بێت. جگە لەمە، دین دەکرێت ئامرازێک بێت بە دەستی کۆمەڵگەوە، بۆ چاودێریکردنی دەسەڵاتی سیاسی و بەرگریکردن لەو هێزانەی دەشێت دەوڵەت ناهەقییان بەرامبەر بکات. واتە دین لەباتی ئەوەی ببێت بە بەشێک لە دەوڵەت، ببێت بە بەشێک لە کۆمەڵگەی مەدەنی.

ئێستا با بپەڕینەوە بۆ تێگەیشتنی ئەو کۆمەڵگەیانە بۆ دەوڵەت. دەوڵەت لەو ئەزموونانەدا دینی هەبێت یان نەیبێت، زیاتر وەک ناوبژیکەرێکی کۆمەڵایەتیی بێلایەن و وەک پارێزەری ئەمن و ئاسایش و قازانجی گشتیی کۆمەڵگە وێنا دەکرێت. دەوڵەت لەو ئەزموونانەدا بریتییە لە بەرجەستەکەری ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییە گشتییەی کە هێزە جیاوازەکانی کۆمەڵگەیەک لەناو خۆیاندا لەگەڵ یەکدیدا بەستوویانە. پەیمانێک، کە تیایدا ماف و ویست و ئارەزووی هەموو هێزەکان پارێزراوە. هیچ هێزێک چەند لە ڕووی ژمارەشەوە گەورە بێت و بتوانێت بەئاسانی زۆرایەتی دروست بکات، ناتوانێت دەست بۆ ماف و ویست و ئازادیی هیچ هێز و لایەنێکی دیکە ببات، گەرچی ئەو لایەنە کەمینە بن و لە ڕووی ژمارەوە بچووک بن. ئەمە لە پەیوەندیدا بە دینەوە مانای ئەوەی دەوڵەت ناچێت دینێک بەزۆر بەسەر دینەکانی دیکەدا یان بەسەر کەسانی بێدیندا بسەپێنێت، یان یاساکانی وا دابڕێژێت، بەرگری لە دینێک بکات بەرامبەر بە دینەکانی دی یان بەرامبەر بە بێدینەکان. ئەوە بە هیچ جۆرێک وەزیفەی دەوڵەت نییە بیەوێت خەڵک بکات بە مەسیحی، یان یەهودی، یان موسڵمان، یان هەر دینێکی تر. ئەرکی دەوڵەت نییە بیروبۆچوونێکی دیاریکراو بەسەر کۆمەڵگەدا بسەپێنێت.

بە مانایەکی دیکە، دەوڵەت لەم کۆمەڵگەیانەدا ئامرازێک نییە بۆ پەرەدان بە ئیمان و بڵاوکردنەوەی دین، وەک چۆن ڕێگرێکیش نییە لە بەردەم دروستبوونی کەسان و گروپی بێدیندا. ئەرکی بڵاوکردنەوەی

دین و ڕێکرتن لە بێدینی، دەشێت هەندێک گروپی دینی ناو کۆمەڵگەی مەدەنی ئەنجامی بدەن، بێگومان لەپاڵ هەموو ئەو گروپانەی دیکەدا کە سەرچاوەی فیکری و ئەخلاقی و ویژدانیی جیاواز لە دینیان هەیە، بۆ ڕێکخستنی ژیانی ئەخلاقی و ویژدانی خۆیان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر دەوڵەت لە ساتێکی دیاریکراودا ویستی دین بەکار بهێنێت، ئەوا ئەم بەکارهێنانە کاتێک قابیلی قبوڵکردنە، کە دەوڵەت لە ڕێگەی دینەوە بتوانێت ئەمن و ئاسایش و قازانجی گشتیی کۆمەڵگە باشتر بپارێزێت و بتوانێت سنوورەکانی ئازادیی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی فراوانتر بکات. واتە بەکارهێنانی دین لەلایەن دەوڵەتەوە بە مەبەستی دینی نەبێت و پەیوەندیی بە بوون و نەبوونی ئیمانەوە نەبێت. کاری دەوڵەت لە ئەزموونی ئەو وڵاتانەدا ئەوە نییە پڕوپاگەندە بۆ دینێک لە دینەکان بکات و بەزۆر بیسەپێنێت بەسەر هەڵگرانی دینەکانی دیکە و بەسەر ئەوانەدا کە دین چوارچێوەی هەڵسوکەوت و چوارچێوەی ئەخلاق و چوارچێوەی ژیانی ئینسانی و کۆمەڵایەتییان نییە. لەم دۆخەدا ئەوە دین نییە کە بڕیار بۆ دەوڵەت ئەدات، بەڵکوو دەوڵەتە بڕیار بۆ دین ئەدات. دەوڵەت دەستنیشانی ئەوە دەکات، سیاسەتی دینی چۆن بێت، نەک دین دەستنیشانی ئەوە بکات، سیاسەتی دەوڵەت چی بێت و چۆن بێت. دەوڵەت کە سیاسەتێکی دینی تایبەتیش ئەنجام ئەدات، هەمیشە دەبێت ئەو سیاسەتە لە پەیوەندیدا بەو پرنسیپانەوە داڕێژێت، کە مافەکانی مرۆڤ و ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی ویژدان و ئازادیی دینی دەپارێزن. واتە سیاسەتی دینی، دەوڵەت نابێت ببێتە هۆی پێشێلکردنی ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی ویژدان و ئازادیی بوون، یان نەبوونی دین.

لە ڕاستیدا، ڕاستی و دروستی بڕیار و سیاسەتەکانی دەوڵەت لە پەیوەندییاندا بە پاراستنی قازانجی گشتی و پاراستنی ئەمن و ئاسایشی کۆمەڵایەتی و گەورەکردنی ڕووبەرەکانی ئازادییەوە دەپێورێت، نەک لە

پەیوەندیدا بە گوێگرتن یان پیادەکردنی کۆمەڵێک ئەحکامی دینییەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، ئەوەی کە ئەخلاقیاتی کۆمەڵایەتی ڕێک دەخات، ئەوەی کە سیاسەتی دەوڵەت دەبات بەڕێوە، دین نییە، واتە نە دەوڵەت و نە ئەخلاقیاتی کۆمەڵایەتی ناچنە خزماتی دینەوە. بەڵکوو دین دەبێت بچێتە خزمەتی ئەوانەوە و بە مەبەستی پاراستنی ئاسایشی گشتی و گەورەکردنی پانتاییەکانی ئازادی کار بکات. دین لەم ئەزموونانەدا شتێک نییە لە سەرووی کۆمەڵگە و دەوڵەتەوە.

بە گەڕانەوە بۆ لای خۆمان، ئەم قسانە مانای ئەوەی دەوڵەت لە دونیای ئێمەدا نابێت ببێتە دەوڵەتی ئیسلام، بەڵکوو ئیسلام دەبێت ببێت بە ئیسلامی دەوڵەت. یەکەمیان مانای ئەوەیە دین لە سەرووی دەوڵەتەوەیە، دووهەمیان مانای ئەوەیە دەوڵەت لە سەرووی دینەوەیە.

# دین و قیرەقیر... دین و بێدەنگی

ئایا خودا پێویستی بە موکەبیرە و میکرۆفۆن و ئەمپریفایەر هەیە؟ ئایا جەوهەری دین قیرەقیر و هاوارە، یان بێدەنگی و هێمنییە؟ ئایا دین شتێکە لە دەرەوەڕا بەسەر ئینساندا دەسەپێنرێت، بە هۆی میکرۆفۆن و موکەبیرەوە، یان وزەیەکی ناوەکییە و لە ناوەوەڕا ویژدانی ئەخلاقیی ئینسان قووڵ دەکاتەوە؟

من ئەم پرسیارانە بۆیە بەم شێوە پەڕگیر و ڕادیکاڵە دادەڕێژم، چونکە دین لە واقیعی ئێمەدا لەوە دەر چووە هەڵگری هیچ ڕەهەندێکی ڕۆحانی بێت، یان هەڵگری پاڵنەرێکی ویژدانی بێت، لە ناوەوەڕا پەیوەندیی نێوان ئینسان و موقەدەس، ئینسان و دونیا، ئینسان و هاوڕێ ئینسانەکانی تر و ئینسان و خودی خۆی، ڕێک بخات و دابڕێژێت. دین لە واقیعی ئێمەدا بووەتە دینێک، کە سیاسەت دەکات، حزبی هەیە، خاوەنی چەک و تەقەمەنی و هەڕەشەیە، ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن و گۆڤار و ڕۆژنامەی هەیە، کۆبوونەوەی جەماوەری ڕێک دەخات، لە ڕێگەی موکەبیرەوە دەدوێت. بەکورتی، دین لە دونیای ئێمەدا هەموو شتێکی هەیە، ئەو ڕۆحانیەت و هێمنییە سادەیە نەبێت، کە قووڵایی بە شتەکان و دیاردەکان ئەبەخشن.

دین لە مانا ڕۆحانییەکەیدا، پابەستی بەخشینی مانایە بە بوون و بە دونیا و بە ژیان. هەڵگری دیدێکی ئەخلاقییە، کە ئینسان دەکاتە بوونەوەرێکی ناسک و بەرپرسیار و چاکەکار. ئەم دووانەش، واتە

بەخشینی مانا بە ژیان و کردنی ئینسان بە بوونەوەرێکی ناسک و بەرپرسیار و چاکەکار، بۆ ئەوەی بتوانن دروست ببن، پێویستیان بە دونیایەک هەیە کەمترین هەراوهۆریا و زۆرترین بێدەنگی، کەمترین قیرەقیڕ و زۆرترین هێمنی، کەمترین سەپاندن و زۆرترین ئازادیی تێدا بێت. ڕۆحانیەت قسەکردنی دینە لەگەڵ ڕۆحی ئینساندا، قسەکردنیش لەگەڵ ڕۆحدا، قسەکردنێکی تایبەتە و جیاوازە لەو جۆرە قسەکردنانەی لە کۆبوونەوە حزبی و جەماوەرییە گەورەکاندا ڕوو دەدات، سەر بەو جۆرە قسەکردنانەش نییە بە چەپڵەڕێزان دەست پێ دەکات و بە چەپڵەڕێزان کۆتایی دێت، لەناو ئەو خوتبانەدا نییە کە بە دەنگی بەرز و قیرەقیڕ و هەڕەشە دەست پێ دەکەن و بە مەلعونکردنی ئینسان کۆتاییان دێت. قسەکردن لەگەڵ ڕۆحدا، باسکردنی ئەو ترسە گەورەیە نییە کە خوتبەبێژان لەپشتی میکرۆفۆنەکانەوە دەیگێڕنەوە و باوەڕداران دەستەدەستە دەکەنە گریان و دوژمنی ژیان. قسەکردن لەگەڵ ڕۆحدا بە هیچ جۆرێک سەر بەو جۆرە کۆڕ و کۆبوونەوانە نییە، کە تیایاندا پلانی لێدانی ئەم یان ئەو ئینسان، فەتوای کوشتنی ئەم یان ئەو باوەڕدار یان بێباوەڕ، بەکافرکردنی ئەم یان ئەو کەس، دەر دەکرێت. قسەکردن لەگەڵ ڕۆحدا، قسەکردنێکی ناوەکییە و پێویستی بە میکرۆفۆن و موکەبیرە و قیرەقیڕ نییە.

بەڵام بۆ دین لە کوردستاندا ڕەهەندە ڕۆحانییەکەی خۆی دۆڕاندووە؟ بۆ بووەتە دیاردەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی پڕ دەنگەدەنگ و قیژە و هاوار؟ بۆ خودا لە کوردستاندا کراوەتە خودایەک پێویستی بە موکەبیرە و میکرۆفۆن هەبێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لەو ڕاستییە کۆمەڵایەتییەوە دەەست پێ دەکات، کە دین لە کوردستاندا زیاترە لە دین، ئەمەش وای کردووە لەوە بکەوێت تەنها مەسەلەی باوەڕبوون بە خودا و پێغەمبەر و قورئان و تێکستە پیرۆزەکان بێت، پەیوەندییەک بێت،

ویژدانی ئینسان لە ناوەوە دای بڕێژێت و گرێی بدات بە موقەدەسێکی هێمن و چاکەکار و بەڕەحمەوە. دین لە کوردستاندا ڕاستەوخۆ گرێ دراوە بە شوێن و جێ و دەسەلات و توانا و نفوز و تەماحی سیاسی و کۆمەلایەتیی ئەو کەس و هێزانەوە، کە بە ناوی دینەوە قسە دەکەن. ئەمڕۆ لە کوردستاندا کە دین قسە دەکات ئەوە ڕۆحانیەت نییە کە قسە دەکات، ئەو دیدە نییە کە جەوهەری دین وەک جەوهەرێکی ویژدانی و ئەخلاقی دەبینێت، دینێک نییە لەگەڵ دونیا و ئینساندا هێمن و لەسەرخۆ بێت، بەڵکوو ئەو گشتە ئاڵۆزەیە، کە تیایدا سیاسەت و نفوز و دەسەلات و شوێن و جێی کۆمەلایەتیی پیاوانی ئایین، یان ئەوانەی کە خۆیان بە وەکیل و دەمڕاستی ئایین دەزانن، ڕۆڵی سەرەکیی تێدا دەبینێت.

لە کوردستاندا شتێکی ئەوتۆ نییە ناوی خوێندنەوە و ناسینێکی فەلسەفی و سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژیی دین بێت. ئەوەی بالادەستە ئەو تەفسیرە سونەتییەیە، کە هەموو ڕەهەندێکی ڕۆحانی لە دین دادەماڵێ و دەیگۆڕێت بۆ دیاردەیەکی پڕقیرەقیر و پڕڕق و پڕهەڕەشە. تێکەڵبوونی هەمەلایەنی دین بە عەقلیەتی هاوارکردن و قیژە و هەڕەشەکردن، وای کردووە کۆمەلگەی کوردی، ئەمڕۆ لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستی بە هێمنکردنەوەی دین هەبێت. ئەنجامدانی ئەم کارەش، بە پلەی یەکەم ئەرکێکی فەرهەنگی و دینی و ڕۆشنبیرییە، پێش ئەوەی ئەرکێکی سیاسی بێت. گێڕانەوەی ڕۆحانیەت بۆ دین، ڕزگارکردنی دین لە دەستی قیرەقیر، لابردنی موکەبیرە و میکرۆفۆنەکان لە بەردەمی دیندا، ئەرکێکی دینیی گرنگن. دەڵێم ئەرکێکی دینیی گرنگن، چونکە سەرجەمی ئەو شتانە دین بە مانا ڕۆحانییەکەی دەکوژن و دەیگۆڕن بۆ نەرەنەرێکی گەورە، کە تێیدا ئینسان هەموو توانایەکی بیرکردنەوە و تێڕامان و بەرخوردی ئەخلاقی و ویژدانی لەدەست دەدات. کێشەکەش لەوەدایە، دین لەمڕۆکەی کوردستاندا دەیەوێت سەرجەمی ژیان بخاتە ژێر دەستی ئەو دیدەوە

بەخشینی مانا بە ژیان و کردنی ئینسان بە بوونەوەرێکی ناسک و بەرپرسیار و چاکەکار، بۆ ئەوەی بتوانن دروست ببن، پێویستیان بە دونیایەک هەیە کەمترین هەراوهۆریا و زۆرترین بێدەنگی، کەمترین قیڕەقیڕ و زۆرترین هێمنی، کەمترین سەپاندن و زۆرترین ئازادیی تێدا بێت. ڕۆحانیەت قسەکردنی دینە لەگەڵ ڕۆحی ئینساندا، قسەکردنیش لەگەڵ ڕۆحدا، قسەکردنێکی تایبەتە و جیاوازە لەو جۆرە قسەکردنانەی لە کۆبوونەوە حزبی و جەماوەرییە گەورەکاندا ڕوو دەدات، سەر بەو جۆرە قسەکردنانەش نییە بە چەپڵەڕێزان دەست پێ دەکات و بە چەپڵەڕێزان کۆتایی دێت، لەناو ئەو خوتبانەدا نییە کە بە دەنگی بەرز و قیڕەقیڕ و هەڕەشە دەست پێ دەکەن و بە مەلعونکردنی ئینسان کۆتاییان دێت. قسەکردن لەگەڵ ڕۆحدا، باسکردنی ئەو ترسە گەورەیە نییە کە خوتبەبێژان لەپشتی میکرۆفۆنەکانەوە دەیگێڕنەوە و باوەڕداران دەستەدەستە دەکەنە گریان و دوژمنی ژیان. قسەکردن لەگەڵ ڕۆحدا بە هیچ جۆرێک سەر بەو جۆرە کۆڕ و کۆبوونەوانە نییە، کە تیایاندا پلانی لێدانی ئەم یان ئەو ئینسان، فەتوای کوشتنی ئەم یان ئەو باوەڕدار یان بێباوەڕ، بەکافرکردنی ئەم یان ئەو کەس، دەر دەکرێت. قسەکردن لەگەڵ ڕۆحدا، قسەکردنێکی ناوەکییە و پێویستی بە میکرۆفۆن و موکەبیرە و قیڕەقیڕ نییە.

بەڵام بۆ دین لە کوردستاندا ڕەهەندە ڕۆحانییەکەی خۆی دۆڕاندووە؟ بۆ بووەتە دیاردەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی پڕ دەنگەدەنگ و قیژە و هاوار؟ بۆ خودا لە کوردستاندا کراوەتە خودایەک پێویستی بە موکەبیرە و میکرۆفۆن هەبێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لەو ڕاستییە کۆمەڵایەتییەوە دەست پێ دەکات، کە دین لە کوردستاندا زیاترە لە دین، ئەمەش وای کردووە لەوە بکەوێت تەنها مەسەلەی باوەڕبوون بە خودا و پێغەمبەر و قورئان و تێکستە پیرۆزەکان بێت، پەیوەندییەک بێت،

ویژدانی ئینسان لە ناوەوە دای بڕێژێت و گرێی بدات بە موقەدەسێکی هێمن و چاکەکار و بەڕەحمەوە. دین لە کوردستاندا ڕاستەوخۆ گرێ دراوە بە شوێن و جێ و دەسەڵات و توانا و نفوز و تەماحی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو کەس و هێزانەوە، کە بە ناوی دینەوە قسە دەکەن. ئەمڕۆ لە کوردستاندا کە دین قسە دەکات ئەوە ڕۆحانیەت نییە کە قسە دەکات، ئەو دیدە نییە کە جەوهەری دین وەک جەوهەرێکی ویژدانی و ئەخلاقی دەبینێت، دینێک نییە لەگەڵ دونیا و ئینساندا هێمن و لەسەرخۆ بێت، بەڵکوو ئەو گشتە ئاڵۆزەیە، کە تیایدا سیاسەت و نفوز و دەسەڵات و شوێن و جێی کۆمەڵایەتیی پیاوانی ئایین، یان ئەوانەی کە خۆیان بە وەکیل و دەمڕاستی ئایین دەزانن، ڕۆڵی سەرەکیی تێدا دەبینێت.

لە کوردستاندا شتێکی ئەوتۆ نییە ناوی خوێندنەوە و ناسینێکی فەلسەفی و سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژیی دین بێت. ئەوەی باڵادەستە ئەو تەفسیرە سونەتییەیە، کە هەموو ڕەهەندێکی ڕۆحانی لە دین دادەماڵێ و دەیگۆڕێت بۆ دیاردەیەکی پڕقیڕەقیڕ و پڕڕق و پڕهەڕەشە. تێکەڵبوونی هەمەلایەنی دین بە عەقلیەتی هاوارکردن و قیژە و هەڕەشەکردن، وای کردووە کۆمەڵگەی کوردی، ئەمڕۆ لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستی بە هێمنکردنەوەی دین هەبێت. ئەنجامدانی ئەم کارەش، بە پلەی یەکەم ئەرکێکی فەرهەنگی و دینی و ڕۆشنبیرییە، پێش ئەوەی ئەرکێکی سیاسی بێت. گێڕانەوەی ڕۆحانیەت بۆ دین، ڕزگارکردنی دین لە دەستی قیڕەقیڕ، لابردنی موکەبیرە و میکرۆفۆنەکان لە بەردەمی دیندا، ئەرکێکی دینیی گرنگن. دەڵێم ئەرکێکی دینیی گرنگن، چونکە سەرجەمی ئەو شتانە دین بە مانا ڕۆحانییەکەی دەکوژن و دەیگۆڕن بۆ نەڕەنەڕێکی گەورە، کە تێیدا ئینسان هەموو توانایەکی بیرکردنەوە و تێڕامان و بەرخوردی ئەخلاقی و ویژدانی لەدەست دەدات. کێشەکەش لەوەدایە، دین لەمڕۆکەی کوردستاندا دەیەوێت سەرجەمی ژیان بخاتە ژێر دەستی ئەو دیدەوە

بۆ دین، کە لەسەر هاوارکردن و قیڕەقیڕ دەژی، لەباتی ئەوەی بەهێمنی ڕۆحی ئینسانەکان بدوێنێت، بە موکەبیرە هاوار دەکات.

ئاشکرایە ئاکاری سەرەکیی دین بریتییە لە باوەڕبوون بەوەی کە دونیایەکی دی لەپشتی ئەم دونیایەوە هەیە، هێزێک هەیە کە لە باشە و خراپە، ڕاست و ناڕاستی ئینسانەکان دەپرسێتەوە. باوەڕبوون بەم هێزە، دەبێت باوەڕبوونێکی ئەخلاقی و ویژدانیی ناوەکی بێت، دەبێت لە پێداویستی و قەناعەتێکی ناوەکییەوە هاتبێت، پێویستی بە ویژدانێکە، ئینسانی کردبێتە بوونەوەرێکی ناسک و بەرپرسیار. بۆ ئەنجامدانی ئەمانەش، دین پێویستی بە موکەبیرەی مزگەوت نییە، پێویستی بە قیڕەقیڕ و دەنگبەرزکردنەوەی پیاوە دینییەکان نییە، پێویستی بەو هەموو هەڕەشە و ترساندنانە نییە، کە لەناو ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە دینییەکانەوە دێن و پەیوەندیی نێوان ئینسان و خودا دەکەنە پەیوەندییەکی ترسئامێز. خۆشویستنی خوداوەند، بوونی ئینسان بە بوونەوەرێکی بەرپرسیار و ناسک و چاکەکار، مەسەلەیەکی ناوەکییە، لە ویژدانەوە هەڵدەقوڵێت، شتێک نییە قیڕەقیڕ و هاوارکردن و هەڕەشە دروستی بکات. باوەڕبوونی ڕاستەقینە بە خودا، دەبێت بەشێکی قووڵ و گرنگی ئەزموونی تاکەکەسییانەی ئینسانەکان خۆیان بێت، لەناو ڕۆحیانەوە بێتە دەرێ، بەشێک بێت لەو ویژدانە تەندروستەی بە ژیان و کۆمەڵگە و ئینسانەکانی دیکەوە گرێیان دەدات. ئەمانەش پێویستیان بە هێمنی و تەنهایی و بێدەنگی هەیە، پێویستیان بەوە هەیە دین وەک شیعر، وەک پارچەیەک مۆسیقا، وەک پیاسەیەکی هێمنی ناو دارستانێکی گەورەی لێ بێت.

ئیمانداری ڕاستەقینە، لە بێدەنگی و هێمنیدا، لە خودا دەگات و لە بێدەنگی و هێمنیدا دەتوانێت باوەڕدار بێت، لە بێدەنگی و هێمنیدا دەتوانێت قەناعەت و باوەڕەکانی خۆی بناسێت. دین جۆرێکی تایبەتە لە

خۆشەویستیی ئینسان بۆ خوداوەند، بۆ ئینسانەکانی تر، بۆ موقەدەسێک بە زمانی گوڵ بدوێت. هەموو قیرەقیرێک ئەم خۆشەویستییە دەکوژێت، ئەم خۆشەویستییە دەگۆڕێت بۆ هەستێکی بێقوولایی، کە دونیا بە لۆژیکی ڕەش و سپی ببینێت. دینی پڕ قیرەقیڕ و هاتوهاوار، لەباتی عاشق، توندڕەو و تێرۆریست دروست دەکات. کەی لەو ڕاستییە سادەیە تێدەگەین، کە موکەبیرە دین دەکوژێت.

# پیاوانی دین چ داوایەکیان هەیە؟

هەفتەی ڕابردوو، واتە لە سەرەتای مانگی شەشی ساڵی ۲۰۰۸دا، کۆمەڵێک لە زانایانی ئاینیی شاری هەولێر و دەوروبەری و هەندێک لە شێخانی تەریقەت و بڕێک مامۆستا و قوتابییانی زانکۆ و پەیمانگەکان، یادداشتێکیان پێشکەش بە سەرۆکی هەرێم و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکی پەرلەمان و هەندێک لە وەزارەتەکان کردووە و داوای ئەوەیان کردووە، سنوورێک دابنرێت بۆ ئەوەی ئەوان بە هێرشکردنەسەر دین و موقەدەسات ناوی دەبەن. یادداشتەکە دۆخی دین و موقەدەسات لە کوردستاندا وەک غەدرلێکراو و قوربانییەک نیشان دەدات، کە لە بەردەم هێرشێکی بەردەوامدایە، بەبێ ئەوەی کەسیان بتوانن بێنە قسە و بەرگری لە خۆیان بکەن. یادداشتەکە، دین لە کوردستاندا وەک هێزێکی غەدرلێکراو و سووکایەتیپێکراو و ڕێگەپێگیراو نیشان دەدات. بۆیە داوای ئەوە دەکات، نووسینی ڕەخنەیی لەسەر دین "قەدەغە بکرێت" و "لێپرسینەوەی شەرعی" و "یاسایی" لەگەڵ ئەوانەدا بکرێت کە گوایە "هێڵە سورەکانی بیروباوەڕ و ئایینی،" زۆرینەی میللەت دەبەزێنن و بەزاندوویانە. بەمەشەوە ناوەستن، داوای دروستکردنی لیژنەیەکی سانسۆر دەکەن لە "مامۆستایانی ئایینی و نووسەر و ڕۆشنبیرە ساغ و ڕاست و دڵسۆزەکانی میللەت و یاساناسەکان" بۆ "بەسەرداچوونەوە و دیاریکردنی ئەو بابەت و نووسینانەی کە مۆڵەتی چاپیان پێ ئەدرێت."

بە بۆچوونی ئەو بەڕێزانە، ئەوەندەش بەس نییە تەنها سزای نووسەرە ڕەخنەگرەکان بدرێت، کە ڕەخنە لە دین دەگرن، بەڵکوو داوای سزادانی ئەوانەش دەکات، کە "یارمەتییان داون" و "ڕێگەیان بۆ خۆش کردوون" ڕەخنە لە دین بگرن.

ئینسان پێوستی بەوە نییە کۆمەڵناس و سیاسەتناسێکی گەورە بێت بۆ ئەوەی لە مەترسیی ئەم یادداشتە و ناڕاستیی شێوازی قسەکردنی یادداشتنووسەکان لەسەر دۆخی دین لە کوردستاندا تێبگات. ئەو وێنەیەی نووسەرانی یادداشتەکە بۆ دین لە کوردستاندا دروستی دەکەن، مەبەستم وێنەی دینە وەک شتێک، گوایە ڕۆژانە لە بەردەم هەڕەشەدایە و کەس نییە بەرگری لێ بکات و ڕێ لە سووکایەتیپێکردنی بگرێت، وێنەیەکی هێجگار ساختە و ناڕاستە و ڕێکوڕەوان پێچەوانەی ئەو وێنەیە دروستە. بەدرێژاییی مێژووی خۆی، کوردستان هەرگیز بە ئەندازەی ئەمڕۆ دینی تێدا نەبووە، بەقەد ئەمڕۆ پیاوانی دین و هێزی سیاسیی دینی و دەزگا و دامەزراوەی دینیی تیا نەبووە. هەرگیز دین لە کوردستاندا بە ڕادەی ئەمڕۆ مینبەری قسەکردنی نەبووە. ئەمڕۆ دین بە هەزاران مزگەوت و خانەقا و تەکیەی هەیە، دەیان ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەی هەیە، چەندەها ئۆرگانی خۆڕێکخستن و کاری دەعوەکردن و سیاسەتکردنی هەیە، حزبی هەیە، وەزارەتی هەیە، وەزیری هەیە، هەزاران مەلا و خەتیبی هەیە، کۆلێژی تایبەتی لە زانکۆکاندا هەیە، پەیمانگای هەیە، لە قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندییەکاندا وەک بەشێکی جێگیر لە سیستمی پەروەردە دەخوێندرێت. ئەمە جگە لەو ژمارە زۆرەی بەرنامەی دینی، کە لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و میدیای پارتە بالادەستەکانی کوردستاندا پەخش و بلاو دەکرێنەوە. بەکورتی، ئەمڕۆ هیچ شتێک نییە لە کوردستاندا بەقەد دین توانای ماددی و مەعنەوی و پەیوەندیکردنی خرابێتە بەردەم و بەقەد دین بتوانێت و توانیبێتی قسە

بکات و بەقەد دین دەنگی بەرز بێت. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو بەڕێزانە وێنەیەکی دین ئەکێشن وەک ئەوەی لە ڕۆخی وێرانبوون و لەناوچوون و فەنابووندا بژی. ئەمەش لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی جارنەجارێک لێرە و لەوێ دەنگێکی ڕەخنەیی بەرز دەبێتەوە و شتێک لەسەر دین دەڵێت، کە لەگەڵ زەوقی ئەو نوخبە دینییەی ناو کوردستاندا ناگونجێت.

بۆ داخستنی دەمی ئەو دەنگە ڕەخنەییانەش، ئەو هەموو ئیمکانات و توانایانە بەس نییە کە لە بەردەم دین خۆیدایە، ئەوە بەس نییە بەرامبەر بە کتێبێکی ڕەخنەیی لەسەر دین ئەوان دە کتێبی بەرگری بنووسن، لەکوێ ڕەخنەیەک لە دین گیرا، لەوێدا وەڵامی خۆیان هەبێت، وشە بە وشە وەڵام بدەنەوە، بەڵکوو داوای دروستکردنی لیژنەیەکی تۆقێنەری سانسۆر دەکەن، کە بتوانێت ڕێگە لە ئازادیی ڕادەربڕین و بیرکردنەوە و بڵاوکردنەوە بگرێت. جەوهەری یادداشتی ئەو بەڕێزانە، هەوڵدانە بۆ بێدەنگکردن و پلانە بۆ ترساندن و دەستەبەرکردنی، سزادانە بۆ ئەوانەی شتگەلێک لەسەر دین دەڵێن، جیاواز لەوەی ئەو بەڕێزانە بە ڕاستی دەزانن. ئەمەش بەداخەوە، بەر لە هەموو شتێک، عەقڵیەتی بەعس و عەقڵیەتی خومەینیمان بیر دەهێنێتەوە، نەک ئەزموونێک نیازی وا بێت ئازادیی ڕادەربڕین و ئازادیی ویژدان و ئازادیی بیرکردنەوە دەستەبەر بکات. من حەز ناکەم بەراوردی ناڕاست بکەم، بەڵام ئەوەی ئەو بەڕێزانە داوای دەکەن، بە هەموو پێوەرێک تۆقێنەرە، دروستکردنی لیژنەیەکی سانسۆری دینی، یان نزیک بە دین لە مەلا و مامۆستایانی دینی و ڕۆشنبیری "ساغ!" -(دەبێت ئەم ڕۆشنبیرە ساغانە کێ بن، جگە لەوانەی بە عەقڵیەتی ئەو مامۆستا و مەلا دینییانە بیر دەکەنەوە )- دووبارەکردنەوەی ئەو سیستمی سانسۆرەیە، کە بەعس بەدرێژاییی زیاد لە سی ساڵ لە عێراقدا خستیە کار و لە ڕێگەیەوە جگە لە دەنگی سەدام و دەنگی ڕژێمە جینۆسایدییەکەی، هیچ دەنگێکی دیکە نەدەبیسترا.

هیچ مەترسییەک لەوە گەورەتر نییە لە وڵاتێکدا لیژنەیەک دروست ببێت، بڕیار بدات چی لەو وڵاتەدا بنووسرێت و چی بڵاو بکرێتەوە و چی یاساغ بکرێت. ئەم دۆخە رێک دووبارەکردنەوەی ئەزموونی سەدامە. ئەم دیکتاتۆرە لە سەرەتاکانی دەسەڵاتیدا بە ناوی عروبە و وەحدە و ڕزگارکردنی فەلەستینەوە، هەموو فیکرێکی نابەعسییانەی یاساغ دەکرد، بە جۆرێک، سانسۆری ئەم سیستمە، یەکێک لە سیستمە سانسۆرە تۆقێنەرەکانی هەموو دونیا بوو. لە نەوەدەکانیش بەدواوە، هەمان ڕژێم هەمان سیستمی سانسۆری درێژە پێ دا، بەڵام ئەمجارەیان بە ناوی پاراستنی ئیسلام و دین و موقەدەساتی میللەتەوە. دروستبوونی دونیایەکی سەدامییانە بەناو ئەو شێوازە سانسۆرەدا تێدەپەڕێت، کە ئەو بەڕێزانە لە یادداشتەکەیاندا داوای دەکەن.

خاڵێکی دیکە لەو نامەیەدا کە شایانی رەخنەکردنە ئەو دیدەیە کە دەیەوێت ژیانی فرەباوەڕی و فرەنرخاندن و فرەبۆچوون و فرەدەنگیی کۆمەڵگەیەک بخاتە ژێر ڕەحمەتی لیژنەیەکی سانسۆرکردنەوە. ئەوەی دین وتی، لە ڕاستیدا ئەوەی بڕێک لە مەلاکان و خوێندەوارە دینییەکان وتیان، ببێتە تاقە هەقیقەت و کەس نەتوانێت بیروبۆچوون و هەڵسەنگاندن و نرخاندنێکی دیکە و جیاوازی هەبێت. ئەوەشی وەک ئەوان نەدوا و نەینووسی، ئەوا لە هەنگاوی یەکەمدا ڕێگەی قسەکردنی لێ بگرن و سانسۆری بکەن، گەر بێدەنگ نەبوو، "لێپرسینەوەی شەرعی!"ی لەگەڵدا بکەن و لە دواهەنگاویشدا، "سزای شەرعی!"ی بدەن. ئەمەش هەمان ئەو پرۆژە تۆقێنەرەیە، کە سانسۆری دینی لە بڕێک لە وڵاتانی دەوروبەر و لە بەشەکانی دیکەی دونیادا پیادەی دەکات. بەمەش ئەو برە دەسکەوتە لە خەڵکی کوردستان دەسێننەوە، کە مێژوویەکی درێژەخەباتی بۆ دەکەن، مەبەستم ئازادیی ویژدان و ئازادیی نووسین و ئازادیی ڕادەربڕینە.

ئەو بەڕێزانە باز بەسەر ئەو ڕاستییە سادەیەدا ئەدەن، کە هەموو

کۆمەڵگەیەکی زیندوو، کۆمەڵگەیەکی فرەدەنگ و فرەباوەڕ و فرەخەون و فرەهەڵسەنگاندنە. هونەری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە لەوەدایە، چوارچێوەیەکی گشتی بۆ جێکردنەوەی ئەو فرەییە دروست بکرێت و جیاوازییەکانی ناوی بپارێزرێت، نەک ئەو فرەییە لەناو ببرێت و بۆچوونە جیاوازەکان سانسۆر بکرێن و لەناو ببرێن. ئەوەی خەریکی ئەوە بێت بۆچوونە جیاوازەکان لە ڕێگەی بێدەنگکردن و سانسۆر و فشارهێنان و ترساندن و هەڕەشەوە چارەسەر بکات، ڕەچەتەی کۆمەڵگەیەکی نەخۆش و نائارام و پڕنهێنی و پڕدرۆ و پڕناپاکی دەنووسێت. ئینسان بوونەوەرێکی قسەکەرە، ئەو قسانەی نەیتوانی بەئاشکرا بیانکات، بەنهێنی دەیانکات، لە کوێشدا پانتاییی کاری نهێنی و بیرکردنەوەی نهێنی و خەونبینینی نهێنی گەورە بوو، لەوێدا کۆمەڵگە لە بەردەم ئەگەری بەکارهێنانی توندوتیژی و نارەحەتی و تەقینەوەی ترسناکدایە. بوونی بۆچوون و دیدی جیاواز، تەنها بەشێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و دینی نییە، بەڵکوو بەشێکە لە زیهن و بیرکردنەوەی تاکەکەسەکان خۆشیان. لە دونیادا سەرێکی عاقڵ نادۆزینەوە چەندان بۆچوون و هەڵسەنگاندنی ناکۆک و جیاوازی تێدا نەبێت. ئینسانبوون مانای ئاڵۆزبوون و فرەدەنگبوونە.

بەدەر لە هەموو ئەم شتانە ڕاستییەکی تریش هەیە پێویستە ئەو بەڕێزانە بیزانن، ئەویش ئەوەیە ئێمە لە دونیایەکدا دەژین، سانسۆرکردن تێیدا لە مەحاڵ نزیک بووەتەوە. ئەوەی ئەمڕۆ مەلایەک سانسۆری دەکات و لێناگەڕێت چاپ بکرێت و بڵاو ببێتەوە، پێنج دەقیقە دواتر لەسەر تۆڕەکانی ئینتەرنێتە و دەکەوێتە بەرچاوی هەموو دونیا. بۆیە ئەو داوایەی ئەو بەڕێزانە لە حکومەتی هەرێمی دەکەن، شتێکە لەگەڵ سادەترین پێدراوەکانی دونیای هاوچەرخدا ناگونجێت. لە ڕاستیدا ئەو داوایە بۆنی چاخە کۆنەکانی دوامانەوەی لێ دێت و پێویستە حکومەتی هەرێم بە هیچ جۆرێک گوێی لێ نەگرێت.

# پرسی ئینسان

ئایا شتێک هەیە لە کۆمەڵگە و سیاسەت و کولتووری ئەمڕۆکەی کۆمەڵگەی ئێمەدا ناوی ئینسان بێت؟ ئایا بەڕاست ئینسانبوون یەکێکە لە چەمکە سەرەکییەکانی دونیای ئێمە؟ شتێک هەیە لەو کۆمەڵگەیەدا ناوی ئینسان بێت وەک بەهای هەرە بەرز، کە بتوانێت باز بەسەر سنوور و پێناسە بەرتەسک و ناوچەییەکانی ئینسانبووندا بدات؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، پێویستە سەرەتا، مەبەستم لە چەمکی ئینسان و ئینسانبوون دەستنیشان بکەم.

بەر لە هەموو شتێک، ئینسان بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریی تایبەتە، واتە کەسێکە هەمیشە سەر بە هێزێکی کۆمەڵایەتیی تایبەتە، بۆ نموونە، یان کرێکارە یان جووتیارە یان مامۆستایە، هتد... لە هەمان کاتدا سەر بە ناوەندێکی کولتووری و ئەخلاقیی تایبەتە، لە نیشتمانێکی دیاریکراودا دەژی، هەڵگری ئەم یان ئەو باوەڕ و ئەم یان ئەو دینی جیاوازە، وەک چۆن دەشێت نە دین و نە هیچ باوەڕێکی ئایدیۆلۆژی دیاریکراویشی نەبێت. واتە ئینسان هەمیشە بوونەوەرێکی کۆنکرێتە، نیشتەجێی ناو کۆمەڵێک هەلومەرج و پێدراوی کولتووری و چوارچێوەی سیاسی و شارستانیی تایبەتە. بوونێکی هەیە، دیاریکراو و سنووردار، سنووردار بە دین و بە شوێن و بە کولتوور و بە بەها و ئەخلاقیاتی تایبەت. بەکورتی، ئینسان هەمیشە ئینسانێکی بەرجەستەی

ناو هەلومەرجێکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریی دیاریکراوە، شووناس و پێناسەکانی هەمیشە بەسەر ئەو شتانەدا دابەش دەبێت، کە لەناویاندا ئامادەیە و لەگەڵیاندا دەژی.

بەڵام مەبەستی من لە ئینسان لێرەدا ئەم ئینسانە کۆنکرێتە نییە، مەبەستم لەم یان ئەو کەس، لە خەڵکی ئەم ناوچە یان ئەوی دی، لە موسڵمانان یان ناموسڵمانان نییە، بەڵکوو مەبەستم لەو وێنە گشتییەی ئینسانە، کە لەپشتی هەریەکێک لەم دەرکەوتە کۆنکرێتانەی ئینسانەوە ئامادەیە، مەبەستم لە ئینسانە وەک فیکرەیەکی ئەبستراکت، وەک شتێک بکەوێتە ئەودیوی پێناسە تایبەتییەکانیەوە، وەک بوونەوەرێک، گەورەتر لەوەی کورت ببێتەوە بۆ خەڵکی ئەم یان ئەو ناوچە، بۆ کەسێک، سەر بەم یان بەو دین، بۆ خاوەنی ئەم یان ئەو ڕەنگ و زمان و ڕەگەز. مەبەستم ئینسانە وەک ئینسان، وەک شتێک، گەورەتر و بەنرختر لە دەرکەوتە کۆنکرێتییەکانی. بێگومان مەبەستم لەمە، وێناکردنی ئینسان نییە وەک جەوهەرێکی نەگۆڕ و دیاردەیەکی نامێژوویی، بەڵکوو مەبەستم لەو فیکرەیەیە کە دەتوانێت هەموو بوون و دەرکەوتە مێژووییەکانی ئینسانبوون بگرێتە خۆی، مەبەستم ئینسانە وەک ناوێک لەپشتی هەموو ناوەکانی ترەوە، ئینسانە لە دەرەوەی ئەسڵ و فەسڵدا، ئینسانە وەک فیکرە، وەک بەهایەکی گەورە و باڵا، کە نەبەستراوەتەوە بە دەرکەوتە مێژوویی و ناوچەیی و سیاسی و فەرهەنگی و دینییە تایبەتەکانییەوە.

بێگومان گرنگترین دەرکەوتی ئینسان لە فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی مۆدێرندا وەک فیکرەیەکی موجەڕەد، وەک کەسێک کورت نەبێتەوە بۆ ئەسڵ و فەسڵێکی تایبەت، دەرکەوتنیەتی لە شێوەی هاوڵاتیبووندا. فیکرەی ئەوەی ئینسانەکان هەموویان هاوڵاتیی ناو دەوڵەتێکی تایبەتن و هەموویان وەکوو یەک تەماشا و مامەڵە دەکرێن، بەبێ ئەوەی گوێ بە زمان و ڕەنگ و ئەسڵ و فەسڵیان بدرێت، ئەو

فیکره گرنگەیە، کە وا دەکات ئینسـان وەک بوونەوەرێکی گەورەتر لە ئینتیما و شووناس و پێناسە بچووکەکانی ببینرێت و مامەڵە بکرێت. واتە هاوولاتیبوون هەنگاوی یەکەمی پشتگوێخستن و گوێنەگرتنە لە مەسەلەی ئەسڵ و فەسڵ و هەنگاوی یەکەمی مامەڵەکردنی ئینسانە وەک شتێک گەورەتر لەو دەرکەوتە بچووکانەی کە باسم کرد. بەلام هاوولاتیبوون شێوازی سیاسییانەی بوونی ئینسانە، پێناسەکردنی ئینسانە وەک بوونەوەرێکی سیاسی. لەبەر ئەوەی ناکرێت ئینسان کورت بکرێتەوە بۆ رەهەندە سیاسییەکەی بەتەنها، بۆیە ناکرێت ئینسانبوون تەنها لە چوارچێوەی هاوولاتیبوونیشدا سنووردار بکرێت. وەک وتم، هاوولاتیبوون ئەگەرچی کردنەوەی دەرگایەکی زۆر سەرەکییە بە ڕووی ئینسانبووندا بە مانا موجەڕەد و گەورەکەی و لە ڕاستیشدا بەبێ کردنەوەی ئەم دەرگایە، زەحمەتە ئینسانبوون بەو مانایەی من لێرەدا باسی دەکەم دروست ببێت، بەلام کورتکردنەوەی ئینسانبوون بۆ هاولاتیبوون، کورتکردنەوەی ئینسانە لەبوونەوەرێکی فرە پێناس و فرە رەهەندەوە بۆ بوونەوەرێکی سیاسیی بەتەنها. بەکورتی، بەهاولاتیبوون هەنگاوێکی گرنگی پرۆسەی بەئینسانبوونە، بەلام هەموو پرۆسەکە نییە. جگە لەمە بە هاوولاتیبوون تا ئێستاش دیاردەیەکی سنووردارە، ئینسان تەنها لە سنووری دەوڵەتێکی نەتەوەییدا دەتوانێت هاوولاتی بێت و لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەو دەوڵەتەدا، وەک ئینسانێکی کامڵی خاوەن ماف و خاوەن ئەرک و خاوەن بەرپرسیارێتی مامەڵە ناکرێت. تا ئەمڕۆکەش، شتێک نییە ناوی هاوولاتیی جیهانی بێت و وا بکات ئینسانەکان نەبەسترێنەوە بە سنوورەکانی دەوڵەتی نەتەوەوە.

ئاشکرایە بەو مانایانەی ئینسانبوون لە سەرەوە باسم کرد، شتێک لە ولاتی ئێمەدا بە ناوی ئینسانەوە بوونی نییە. ئینسان نەبووەتە ئەو بەهایەی کە بتوانێت لە دەرەوەی پێناسە بچووک و ناوچەیی و دینی

و سیاسییەکانیدا ببینرێت. لە دونیای ئێمەدا ئینسانبوون پەیوەندییەکی پتەوی بە ئەسڵ و فەسڵەوە هەیە، پەیوەندیی بەوەوە هەیە خەڵکی کوێیە و لەکوێوە هاتووە، کێ دەناسێت و کێ ناناسێت و سەر بە کام گروپ و هێزی کۆمەڵایەتییە. ئەوەی سەر بە ئەسڵێکی دیاریکراو بێت و فەسڵێکی دیاریکراویشی هەبێت، وەک کەسێکی "ئینسانتر" مامەڵە دەکرێت، ئەم جۆرە کەسانە تەنها لە پلەوپایەی کۆمەڵایەتیدا لەپێشتر نین، بەڵکوو لە ئاستی ئینسانبوونیشیاندا لەپێشتر و لەسەرەوەترن. مافی زیاتر و هەلی زیاتر و دەسکەوتی زیاتریان لە ژیاندا و لەناو کۆمەگادا هەیە. ئینسان لە وڵاتی ئێمەدا هێشتا لە قۆناغی بەر لە هاووڵاتیبووندا دەژی، وەک کەسێک، سەر بەم هێز یان بەو هێزی کۆمەڵایەتیی تایبەت، سەر بەم حزب یان بەوی تریان، خاوەنی ئەم دین یان ئەوی تر، تەماشا دەکرێت. بڕ و ڕادەی ئینسانبوونیشی ئەو ئینتیما بچووکانە دەستنیشانی دەکات. ئەم قۆناغی بەر لە هاووڵاتیبوونە، قۆناغی غیابی تەواوەتی ئینسانە وەک ئینسان.

ڕاستە فیکرەی هاووڵاتیبوون فیکرەیەکی سیاسییە، بەڵام لە هەمان کاتدا لەسەر داننان بە جیاوازییەکان و ڕێزگرتنیان دروست بووە، لەسەر داننان بە فرە شێوازی ژیان و فرە شێوازی بیرکردنەوە و فرە شێوازی پێناس کار دەکات. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، مەجالی فرەدینی و فرەبۆچوونی و فرەڕایی نەبێت، یان گەر هەبێت، بەڵام وەکوو یەک ڕێز و مافیان نەبێت، ئەوکات شتێک بە ناوی ئینسانەوە لەو کۆمەڵگەیەدا بوونی نییە. هەڵوێستی ئینسانی لە داننان بە جیاوازییەکاندا دروست دەبێت، لەکوێدا داننان بە جیاوازیدا نەبێت و ئینسان نەتوانێت لەگەڵ جیاوازییەکانی ئازادانە بژی، لەوێدا شتێک بە ناوی هەڵوێستی ئینسانییەوە بوونی نییە. هەڵوێستی ئینسانی ئەو کاتە دروست دەبێت، کە تۆ ئەوی ترت

بـه هەمـوو جیاوازییەکانییـەوە قبـوڵ بێـت، بـە جیاوازیـی دیـن، جیاوازیـی بیرکردنـەوە، جیاوازیی تایەفـە، جیاوازیی ڕەنـگ، جیاوازیـی ڕەگـەز و مەیلـی جنسـی... هتـد. نـەک هـەر قبوڵـت بێـت، بەڵکـوو هەمـووان هەمـان مـاف و ئـەرک و ڕێـزی تۆیـان هەبێت.

لـە دونیـای ئێمـەدا دیـن و سیاسـەت و ناوچەگەرێتـی و حـزب، ناهێڵـن ئینسان بـە مانا ئینسـانییەکەی لەدایک ببێت، ناهێڵن ئینسـان وەک بەهایەکی گـەورە بوونـی هەبێت لەباتـی "ئینسـانی مـاف و ئینسـانی ڕێـز،" "ئینسـانی حزبی،" "ئینسانی خێڵ،" "ئینسـانی بنەماڵە،" "ئینسـانی ناوچـە" و "ئینسـانی دین"مـان هەیـە. هەریەکێکیـش لـەم فۆرمـە بچووکانـەی ئینسـانبوون، شـەپازللەیەکی گەورەیـە لـە ئینسـانبوون وەک بەهایەکـی بـەرز و ڕاسـتەقینە.

# هاووڵاتـی وەك ئینسان

هاووڵاتیبـوون دروشـم نییـە، قسـەیەک نییـە ئـەم یـان ئـەو سیاسـی، بـە درۆ یـان بـە مەبەسـتی پروپاگەندەکـردن بـۆ مەسـەلەیەکی تایبـەت بیکات. هاووڵاتیبـوون شـووناسـێکی سیاسـیی و کۆمەڵایەتییـە. شـووناسـێکە تیایـدا تاکەکـەس لـە سـەرێکەوە وەک بوونەوەرێکی سیاسـی و لـە سـەرێکی دیکەوە وەک بوونەوەرێکـی کۆمەڵایەتـی وێنـا دەکرێـت. سـیفەتی هـەرە سـەرەکیی ئـەم سیاسـی و کۆمەڵایەتیبوونـەی تاکەکەسـیش، یەکسـانییە، واتـە مافـی سیاسـیی سـەربەخۆ و یەکسانیی هەیـە و لـە ڕووی کۆمەڵایەتیشـەوە هیچـی لەوانـی دەوروبـەری کەمتـر نییـە. هاووڵاتـی بـە کەسـێک دەگوترێـت کـە هـەم ئۆتۆنـۆم و سـەربەخۆ بێـت، هـەم یەکسـانیش بێـت لەگـەڵ هەمـوو ئەوانـەدا کـە پێکـەوە لـە سـەرزەمینێکی دیاریکـراودا دەژیـن. بـەم مانایـە، هاووڵاتیبوون مانـای ئەوەیـە هەمووـمـان وەک ئینسـان هەمـان مافـی سیاسـیمان هەبێـت و هەمـان ڕێـز و هەمـان نرخـی کۆمەڵایەتـی و هەمـان بەهـای یاسـاییمان پـێ ببەخشـرێت. ئـەوە بیرۆکـەی یەکسـانبوونی سیاسـی و کۆمەڵایەتییـە، مانـا قووڵەکانـی شـووناسـی هاووڵاتیبـوون وەک شـوناسـێکی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی دەستنیشـان دەکات.

ئەوانـەی لـە بـواری نووسـین لەسـەر مەسـەلەی هاووڵاتیبوونـدا کاریـان کـردووە و مێژووی شـێوازەکانی پێناسـکردنی ئینسـانبوونیان نووسـیوەتەوە، هەمیشـە زیـاد لـە شـووناسـێکی سیاسـی و کۆمەڵایەتییـان لـە یەکـدی جیـا

کردووەتـەوە. ئـەم شوناسانەشـیان داوەتـە پاڵ قۆناغـە جیاوازەکانـی ژیـان و بوونـی کۆمەڵایەتیی ئینسـان لـە سـەردەمە جیاوازەکانـدا. ئەمـەش مانـای ئـەوەی لـە هـەر قۆنـاغ و سـەردەمێکدا، مانایەکـی تایبەتیـی ئینسـانبوون لەئـارادا بـووە و هەریەکێکیشـیان مانایەکـی تایبەتـی بـە شـوێن و جێـی ئینسـان لەنـاو تـۆڕی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتـی و سیاسـییەکاندا بەخشـیوە. هەروەهـا ئینسـانەکان خۆشـیان هەسـت و بۆچوونێکـی تایبەتیـان بەرامبـەر شـوێنی خۆیـان لـە کۆمەڵگـە و لەنـاو پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانـدا هەبـووە و دەسـەڵاتە سیاسـییەکانیش داواکاری و چاوەڕوانیی جیاوازیـان بەرامبـەر بـە ئینسـانەکان هەبـووە. بـۆ نموونـە، لـە قۆناغێکدا کـە دەربەگایەتـی شـێوازی سـەرەکیی ڕێکخسـتنی پەیوەندییـە ئینسـانییەکان بـووە و دەرەبەگایەتـی ئـەو چوارچێوەیـە بـووە، کـە شـووناسـی ئینسـانی تێـدا بەرهـەم هاتـووە، پەیوەندییـە ئینسـانییەکان بـە شـێوازێکی هیرارکـی، واتـە هەڕەمـی ڕێـک خـراوە. کەسـێک لـە سـەرەوەی کۆمەڵگـەدا وەک دەرەبـەگ و سـەروەر ئامـادە بـووە و ئەوانـی دی لـە خـوارەوەی کۆمەڵگـەدا و لەژێـر دەسـتی ئـەو دەرەبەگـەدا بـوون. شـتێک بـە نـاوی هاوولاتیبوونـەوە بوونـی نەبـووە، خەڵـک یـان نۆکـەر یـان خزمەتـکار یـان پیـاوی ژێردەسـتی دەرەبەگـەکان بـوون، دەربەگەکانیـش سـەروەر و سـەرداری ئـەوان بـوون. سـیفەتی سـەرەکیی ئینسـانبوون لـەم سیسـتمەدا لەسـەر نایەکسـانی دروسـت بـووە، ئەوانـەی خـوارەوە گوێڕایـەڵ و گوێمشـتی ئەوانـەی سـەرەوە بـوون، مافـی بەدەنگهاتنیـان بەرامبـەر بـە خراپـەکاری و مافـی لێپرسـینەوە و چاودێریـی ئەوانـەی سـەرەوەی خۆیـان نەبـووە. بەدرێژاییـی تەمەنیـان خزمەتـی بەگەکانـی خۆیانیـان کـردووە. لـە بەرامبـەر ئـەم خزمەتـەدا، دەرەبەگـەکان لـە چوارچێـوەی پەیوەندییـە دەرەبەگییەکانـدا تـا ڕادەیەکـی بەرچـاو ئەمـن و ئاسایشـیان بـۆ ئـەو ژێردەسـت یـان ڕەعیەتانـە دابیـن کـردووە. وەک وتـم، ئـەوەی لـەم مۆدێلـە کۆمەڵایەتییـەدا نائامادەیـە، بیرۆکـەی هاوولاتییـە.

لە مۆدێلی شانشینیشدا بیرۆکەی هاوولاتی و هاوولاتیبوون نائامادەیە. ژیان و ئیشکردنی ئەم مۆدێلە لە دەوری بوونی پادشایەک دروست بووە، کە لەسەری سەرەوەی کۆمەڵگەدا ئامادەیە، پادشایەک کە جیاوازە لە هەموو ئەوانەی لەژێر دەسەلات و ڕکێفی ئەودا دەژین. ئەوانەی لە ژێردەستی پادشاداں، هاوولاتی نین، بەڵکوو ڕەعیەتی ئەو پادشایەن، پادشا شوانە و ئەوان مەڕەکانی بەردەمین. وەک ڕەعیەتیش ئەوەی لەسەریانە ئەنجامی بدەن، بەخشینی متمانەی خۆیانە بەو پادشایە و سەرشۆڕکردنە بۆ ویست و فەرمانەکانی. لەم مۆدێلەدا، پادشا ڕەمزی کۆمەڵگە و نیشتیمان و سەروەرییە و کەس بۆی نییە ململانێ و لاساریی لەگەڵ ویست و فەرمایشتەکانیدا بکات.

مۆدێلێکی دیکە کە باس دەکرێت، مۆدێلی دەسەلاتە ستەمگەرەکانە. لەم مۆدێلەدا، ستەمگەرێک پەیدا دەبێت، کە دەچێتە لووتکەی هەرەمی دەسەلات و هەرەمی کۆمەلایەتییەوە و لەوێوە لەباتی هەمووان بیر دەکاتەوە و بڕیار ئەدات. لێرەدا حوکم و دەسەلاتی تاکەکەسی سەروەرە و هەموو ئەوانەی دەرەوەی ئەو تاکەکەسە هەرکەسە بە شێوەیەک سەرشۆڕی ویست و ئیرادەی ئەون. ئەم سیستەمە داوای خۆشەویستی لە خەڵک دەکات، خۆشەویستی بۆ سەرۆک و ماڵ و منداڵ و بنەماڵەکەی. هەر ڕەخنەگرتن و نارەزایییەک بەرامبەر بە سەرۆک، وەک سووکایەتیکردن بە ولات و سووکایەتیکردن بە سیستەمە سیاسییەکە دەبینرێت. لەم جۆرە سیستەمانەدا بە بەردەوامی تاقمێک بوقژەن هەن، هەموو ئەوانەی سەرۆکیان بەدڵ نییە، وەک ناحەز و تێکشکێنەری موقەدەساتی ولات ناوزەد ئەکەن.

لە ڕووی مێژوویییەوە، هاوولاتیبوونی ڕاستەقینە، تەنها لە قۆناغی دروستبوونی نەتەوەدا وەک یەکەیەکی سیاسیی سەرەکی لەدایک دەبێت. لە ڕاستیدا زۆر زەحمەتە چەمکی نەتەوە لە چەمکی هاوولاتیبوون جیا

بکەینەوە. نەتەوە کاتێک دروست دەبێت، کە ئەندامانی ئەو نەتەوەیە هەست بەوە بکەن هەموویان وەکوو یەک ئەندامی ئەو نەتەوەیەن، هەموویان هەمان ڕەگوڕیشەیان هەیە و هەمووشیان هەمان بەها و نرخی کۆمەڵایەتییان پێ بەخشراوە. زەحمەتە بیرۆکەی نەتەوە دروست ببێت، گەر بڕێکی ئەو نەتەوەیە خۆی لە بڕەکەی دیکەی بە ئینسانتر بزانێت، گەر هێزێکی ئەو نەتەوەیە خۆی بە گەورەتر و خاوەن مافتر و ڕێزدارتر بزانێت. لەناو فیکرەی نەتەوەدا، ڕۆحیەتێکی یەکسانخواز هەیە کە ئەندامانی نەتەوەکە وەکوو یەک تەماشا دەکات. ئەم ڕۆحیەتە یەکسانخوازە لە بیرۆکەی هاوولاتیبووندا تەعبیر لە خۆی دەکات. خاڵی سەرەکی لە بیرۆکەی هاوولاتیبووندا ئەوەیە، هەموو ئەوانەی سەر بە نەتەوەن هەمان ماف و هەمان نرخ و هەمان بەهایان هەیە و هەمووشیان وەک هاوولاتیی ئازاد هەمان بەرپرسیارێتیشیان لەسەر شانە. کەسیان لەوی تریان زیاتر یان کەمتر ئەندامی نەتەوە نییە، کەسیان لەوی تریان خاوەن ماف و خاوەن ڕێزی زیاتر نییە. ئەوەی لێرەدا خاڵی سەرەکییە، کەسی سەرۆک، یان کەسی دەرەبەگ، یان پادشا نییە، بەڵکوو نەتەوە خۆیەتی وەک یەکەیەکی دەستەجەمعی، وەک بوونێکی پێکەوەییی کراوە بۆ هەمووان. ئینتیما لێرەدا بۆ تاکەکەسە دەسەڵاتدارەکان نییە، بەڵکوو بۆ ئەو یەکە گەورەیەیە، کە ناوی نەتەوەیە. بەکورتی، فیکرەی هاوولاتیبوونی یەکسان، هاوولاتیبوون بۆ هەمووان، لەگەڵ فیکرەی نەتەوەدا لەدایک دەبێت. نەتەوە ئەو یەکە سیاسییەیە، کە ئەندامەکانی وەکو یەک یەکسانن، هەمان ماف و هەمان نرخ و هەمان ڕێزیان هەیە. لێرەدا هاولاتیبوون تەعبیر لەو پەیوەندییە دەکات، کە تاکەکەس لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا دروستی دەکات، دەسەڵاتێکی سیاسی، کە بە ناوی نەتەوەوە قسە دەکات و بە ناوی نەتەوەشەوە ئامادەیە. دەسەڵاتی سیاسیی لێرەدا موڵکی ئەم یان ئەو کەس، ئەم یان ئەو هێزی سیاسی نییە بەتەنها، بەڵکوو شتێکە

تەعبیر لە ئیرادەی گشتی یان ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتیی نێوان هێزە جیاوازەکان دەکات. هاووڵاتیبوون لێرەدا مانای سەرجەمی ئەو مافانەی کە هەموو کەسێک هەیەتی لە بەرامبەر ئەو ئەرکانەدا کە دەبێت هەموو کەسێک جێبەجێیان بکات. هاووڵاتیبون مانای بوونی سەرزەمینێکی سیاسیی تیایدا ئەرکەکان و مافەکان بەیەکسانی دابەش بکرێت. ئینسان کاتێک دەبێت بە هاووڵاتییەکی ڕاستەقینە کە مافەکانی وەک مافی هەموو ئەوانە وا بوو، کە لەگەڵیاندا دەژی و ئەرکەکانیشی هەمان ئەرکی ئەوان بوو. کەی ئینسان فەرق و جیاوازیی بەرامبەر کرا، ئەرکی زیاتر و مافی کەمتری پێ درا، لەگەڵ ئەوانەدا یەکسان نەبوو کە نیشتمانیان لەگەڵدا دابەش دەکات، مانای ئەوەیە فێڵ لە هاووڵاتیبوون و لە ئینسانبوونی کراوە. لەمڕۆدا، دەرکەوتی سەرەکیی ئینسانبوونی ئێمە، دەرکەوتنمانە وەک هاووڵاتیی یەکسان.

# رۆشنگەری

لە مێژووی فیکردا، کەم وتار هەیە هێندەی وتاری "رۆشنگەری چییە؟"ی فەیلەسوفی ئەڵمانی، ئیمانوێل کانت بەناوبانگ بێت. ئەم وتارەی کانت، کە لە ساڵی ١٧٨٤ بۆ رۆژنامەیەکی ئەڵمانی نووسیوە، لەلایەن زیاد لە فەیلەسوفێکەوە باس کراوە و لێک دراوەتەوە. کانت لێرەدا رۆشنگەری وەک توانای بەکارهێنانی سەربەخۆ و ئاشکرای عەقڵ دەناسێنێت. ئینسانی رۆشنگەر وەک کەسێک نیشان ئەدات، کە ئامادە نییە جڵەوی عەقڵی خۆی بداتە دەستی کەسانێک، کە خۆیان بە چاوساغی کۆمەڵگە دەزانن. لە هەمان کاتدا، کانت بە کۆمەڵگە و سەردەمێک دەڵێت کۆمەڵگە و سەردەمێکی رۆشنگەر، کە تیایاندا عەقڵ بتوانێت بەسەربەخۆیی و بە شێوەیەکی ئاشکرا کار بکات، واتە عەقڵ نەخرێتە ژێر فشاری حەلاڵ و حەرام و ئەشێ و ناشێی دینی و فەرهەنگی و کۆمەلایەتییەوە، عەقڵ ئازادیی ئەوەی هەبێت بە شێوەیەکی ئاشکراو سەربەخۆ کار بکات.

رۆشنگەری وەک قوتابخانەیەکی فیکری لە سەدەی هەڤدەهەم و سەدەی هەژدەهەمی ئەوروپادا لەدایک دەبێت. لە دوای لەدایکبوونیشیەوە بیروبۆچوون و بەرخوردەکانی دەبنە بنەما سەرەکییەکانی لەدایکبوونی شووناسی مۆدێرن لە دونیادا. لە راستیدا ئامادەگیی ئینسانی مۆدێرن و کومەڵگەی مۆدێرن، ناکرێت لە هاتن و گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی رۆشنگەری جیا بکرێتەوە. ئاشکراشە کومەڵگە جیاوازەکان بە شێوازی

جیاواز دەکەونـە پەیوەندییـەوە لەگـەڵ بیروبۆچوونەکانـی ڕۆشـنگەریدا. ڕاسـتە ڕۆشـنگەری وەک قوتابخانـە، وەک ڕێبازێکـی فیکریـی دیاریکـراو، لـە ئەوروپـادا لەدایـک دەبێت، بـەڵام هـەر لـەدوای لەدایکبوونیـەوە دەبێتـە بەشـێک لـە خەیـاڵ و عەقڵیەتێکـی ئینسـانیی بەرفـراوان. لـە سـەدەی هەڤدەهـەم بەمدیودا، بیروبۆچوونەکانـی ڕۆشـنگەری تەنها بـە دونیـادا بـڵاو نابنـەوە، بەڵکوو لەنـاو فەرهەنـگ و ناوەندە فیکرییە جیاوازەکانـی دەرەوەی ئەوروپاشـدا عەقڵـە ڕەخنەیـی و کـراوەکان دەخەنـە جووڵەیەکـی گـەورە و بەردەوامـەوە، وا لـەو عەقڵانـە دەکـەن، لـە کەلەپووری فەرهەنگی و فیکری و سیاسیی خۆیاندا ئـەو ساتەوەخت و دید و بۆچـوون و دەزگایانە بدۆزنەوە، کـە لـە دیدەکانـی ڕۆشـنگەرییەوە نزیکـن، یـان تەبـان لەگەڵیانـدا و دەتوانـن وەک پاڵپشـتێک بـۆ ڕۆشـنگەری کار بکـەن. واتـە ڕۆشـنگەری وا دەکات میللەتـە جیاوازەکانـی دونیـا سـاتەوەختە ڕۆشـنگەرییە تایبەتەکانـی نـاو مێژووی خۆیـان بدۆزنـەوە و سـەرلەنوێ چـالاک و ئەکتیڤیـان بکەنـەوە. لـە سـەدەی هەڤدەهـەم بـەدواوە ڕۆشـنگەری کاریگەریـی گـەورە، هـەم لەسـەر فەرهەنگـی ئـەو نەتەوانـە بەجـێ دەهێڵێت کـە خۆیـان بـە ڕۆشـنگەر دەزانـن، هـەم لەسـەر ئـەو دەزگایانـەی کـە دروسـتیان کـردووە بـۆ ئـەوەی ژیانـی سیاسییان ڕێـک بخـات. دەکرێـت گرنگتریـن بۆچوونەکانـی ڕۆشـنگەری لـەم چـوار بۆچوونـەدا کـۆ بکەینـەوە.

یەکـەم: پێداگرتنـی بـەردەوام لەسـەر بیرۆکـەی ئۆتۆنۆمبـوون یـان سـەربەخۆبوونی تاکەکـەس و کۆمەڵگە. کۆڵەکەی یەکەمـی ڕۆشـنگەری ئـەو بۆچوونەیـە، کە ئینسـان وەک بوونەوەرێکـی سـەربەخۆ وێنا دەکات، ئینسـان وەک کەسـێک دەبینێـت، بتوانێـت و مافـی ئـەوەی هەبێـت بـە شـێوەیەکی سـەربەخۆ بڕیارەکانـی خـۆی بـدات، ئینسـان خـۆی بڕیـاری ئـەوە بـدات چ کار و کردەوەیـەک ئەنجام بـدات، خـۆی دەستنیشـانی چۆنیەتـی ڕێکخسـتن و بەڕێوەبردنـی ژیانـی خـۆی بکات و خـۆی شـێوەژیانی خـۆی هەڵبژێرێت.

ئینسـان سـەربەخۆ بێت لـە جوولـە و هەڵسـوکەوتیدا و ئیـرادەی پـەک نەخرێـت و ئازادیـی نەدزرێـت. بێگومـان هەمـوو ئەمانـە لـە چوارچێـوەی رێککەوتنێکـی کۆمەڵایەتیدایـە، کـە چوارچێـوە گشـتییەکانی ژیانـی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی دەستنیشـان دەکات. لـە دیـدی ڕۆشـنگەریدا، سـنووری ئازادییەکانـی ئینسـان بەرفراوانـە و بەتەنهـا لـە ئازادیـی سیاسـییدا جێگیـر نییـە. ئازادیـی ویـژدان، ئازادیـی هەڵبـژاردن، ئازادیـی جوولـە، بەشـێکی گرنگی ئـەو ئازادییانـەن. لەپاڵ ئەمانەشـدا، ئازادیی عەقڵ خۆی کۆڵەکەیەکی گرنگـی ئازادیـی ڕۆشـنگەرانەیە. ئازادیـی عەقـڵ مانـای ئازادیـی مەعریفـە، واتـە ئازادبـوون و سـەربەخۆبوونی مەعریفـە لـە دەسـەڵاتە دەرەکییـەکان. بـۆ نموونـە، لـە دەسـەڵاتی دیـن و لـە دەسـەڵاتی سیاسـی. مەعریفـە بـۆ ئـەوەی بەرهـەم بهێنرێـت و کار بـکات، پێویسـتی بـە ڕووخسـەت یـان مۆڵەتـی دیـن و دەسـەڵاتی سیاسـی نەبێـت. حـەڵاڵ و حەرامـی دینـی و سیاسـی نەبـن بـە حـەڵاڵ و حەرامـی مەعریفـە. هەمـان شـتیش بـە نیسـبەت هونـەر و ئەدەبیـات و شـێوازەکانی تـری نووسـینەوە ڕاسـتە. ڕۆشـنگەری مانـای ئازادکردنـی ئـەم بوارانـەی ژیانـی فیکـری و ڕۆحیـی ئینسـان لـە سانسـۆرە دینـی و سیاسـی و ئەخلاقییـە دەرەکییـەکان. لـە سـەرێکی دیکـەوە ئـازادی لـە دیـدی ڕۆشـنگەریدا تەنهـا ئازادیـی تاکەکەسـەکان نییـە، بەڵکـوو ئازادیـی کۆمەڵگەشـە. وەک چـۆن تاکەکـەس ئـازاد و سـەربەخۆیە، ئـاواش کۆمەڵگـە ئـازاد و سـەربەخۆیە. ئازادیـی کۆمەڵگـە مانـای ئـەوەی کۆمەڵگـە خـۆی دەستنیشـانی ئـەوە بـکات، کـێ حاکمـی بێـت؟ چەنـد حاکمـی بێـت و کـەی و چـۆن لای ببـات؟ ئـەم پێداگرتنـە سـەرەکییەی ڕۆشـنگەری، لەسـەر پێویسـتی سـەربەخۆبوونی کۆمەڵگـە دەبێتـە هـۆکاری لەدایکبوونـی یەکێـک لـە چەمکـە سیاسـییە هـەرە گرنگەکانـی دونیـای نـوێ، مەبەسـتم چەمکـی سـەروەرییە. ڕۆشـنگەریی کۆمەڵگـە وەک یەکەیەکـی سـەروەر وێنـا دەکات و ئـەوەی کۆمەڵگـە دەیەوێـت، دەبێـت ئـەوە بێـت ببێتـە سـەرچاوەی بڕیـار و ڕاپەڕاندنـی کارەکان. کۆمەڵگـە

لێرەدا بکەرێکی سیاسیی گرنگە و هەموو ئەوانەی کاری سیاسی و دەوڵەتی دەکەن، دەبێت گوێڕایەڵی ئیرادە و قازانجی گشتیی کۆمەڵگە بن. لە هەمان کاتدا، بۆ ئەوەی ئازادیی کۆمەڵگە نەتوانێت ئازادیی تاکەکەس بشێوێنێت، واتە بۆ ئەوەی زۆرایەتیی کۆمەڵگە نەتوانێت ویستی خۆی بەسەر هەموو کۆمەڵگەدا بسەپێنێت، ڕۆشنگەری باسی مافی ئازادیی و سەربەخۆییی تاکە کەسەکان دەکات لە بەرامبەر کۆمەڵگە خۆشیدا. بەم مانایە، نابێت ئازادییی کۆمەڵگە ئازادیی تاکەکەس وێران بکات، بەڵکوو دەبێت لە بەرامبەر ئازادیی کۆمەڵگەدا، ئازادیی تاکەکەس بپارێزرێت و نەهێڵرێت کۆمەڵگە تاکەکەس داگیر بکات.

بیرۆکەی دووهەمی ڕۆشنگەری، بیرۆکەی مرۆڤایەتییە. ڕۆشنگەرەکان باوەڕیان وایە کە هەموو میللەتە جیاوازەکانی دونیا لەوەدا بەشدارن، کە بەسەریەکەوە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێک دەهێنن. لەمەدا هیچ کەس و لایەن و میللەتێک لە کەس و لایەن و میللەتێکی دیکە مرۆڤتر نییە. ئینسان لە هەرشوێنێکی دونیادا بێت، هەر ئینسانە و بەشێکە لەو گشتە گەورەیەی ناوی مرۆڤایەتییە. ئەمەش مانای دانانی ئینسان لە سێنتەری بیرکردنەوە و بەرخوردەکاندا، مانای مامەڵەکردنی ئینسان وەک بەهایەکی موجەڕەد و دیتنی بەختەوەریی ئینسان وەک دواهەمین ئامانج.

بیرۆکەی سێیەم، بریتییە لە باوەڕبوون بە گەردوونگەرایی، واتە باوەڕبوون بەوەی کە کۆمەڵێک بەها و نرخ و یاسا هەن بۆ هەموو کولتور و کۆمەڵگە و کەلەپوورەکان شیاون. ئینسان بە حوکمی ئەوەی ئینسانە، کۆمەڵێک مافی گەردوونیی هەیە و هیچ کەس و لایەنێک بۆی نییە پێشێلیان بکات. ڕۆشنگەرەکان ئەم مافانە ناو دەنێن مافی سروشتی، لەوانەش، مافی ژیان و مافی مامەڵەی یەکسان و مافی قێزەوننەکردن و ئازارنەدان و هتد... لە ڕاستیدا ئەم مافە گەردوونییانە لە سەرووی ئەرک و یاسا و بەها نەتەوەییەکانەوەن و بۆ هەموو میللەتانی دونیا قابیلی

پیادەکردنن.

بیرۆکەی چوارەم، بیرۆکەی رەخنەیە. لە راستیدا ڕۆشنگەری لە زۆر ڕووەوە مانای ئامادەگیی عەقڵیەتێکە، سڵ لە ڕەخنەکردنی هیچ پێدراوێکی ژیانی سیاسی و فەرهەنگی و ڕۆحی و کۆمەڵایەتی نەکاتەوە. ڕەخنە ببێتە یەکێک لە بەها فیکرییە هەرە گەورە و گرنگەکان. بێگومان ڕۆشنگەری لە مێژووی خۆیدا تووشی نووشستیی گەورە هات، دونیای دوای ڕۆشنگەری برێکی زۆری لە خۆشباوەڕییەکانی ڕۆشنگەری بەدرۆ خستەوە، بەڵام ئەوەی تا ئەمڕۆکە لە ڕۆشنگەری بەزیندوویی ماوەتەوە، ئەو پێداگرتنە گەورەیەیە لەسەر ئازادی و سەربەخۆییی ئینسان، کە لەگەڵ خۆیدا هێنای.

# لە خوداناسییەوە بۆ کۆمەڵناسی

هەمـوو کۆمەڵگەیـەک پێکهاتێکـی ئاڵـۆزو فرەڕەنـگ و فرەخەونـە، زۆر زەحمەتـە کۆمەڵگەیـەک بدۆزینـەوە تەنها یـەک بیر، یـەک دید، یـەک شـێوازی چاوەڕوانـی، یـەک هەقیقـەت، یـەک تێگەیشـتن بـۆ خـۆی و یـەک تێگەیشـتنی بـۆ دونیـای دەوروبـەر، بەڕێـوەی ببـات. کۆمەڵگـە مانـای جیـاوازی، مانـای ملمـلانـێ، مانـای ئامادەگیـی دیـد و بۆچـوون و تەماحـی جیـاواز، مانـای جووڵـە و گۆڕانـی بـەردەوام. ئـەو دیـدەی کۆمەڵگـە وەک یەکەیەکـی لێکچـوو و هارمۆنـی و بـێ جیـاوازی دەبینێـت، کـە هەڵگـری یـەک هەقیقـەت و یـەک شـێوازی ژیـان و یـەک سیسـتمی ئەخلاقـی و یـەک شـێوازی داوەریکردنـە، دیدێکـی دینییـە. دیدێکـە زیاتـر سـەر بـە کایـەی خوداناسـییە، نـەک کۆمەڵناسـی.

خوداناسـی لـەو گریمانـە سـەرەکییەوە دەسـت پـێ دەکات، کـە پێـی وایـە لەپشـتی واقیـع و لەپشـتی حوکمـە ئەخلاقـی و سیاسـی و فەرهەنگییەکانـەوە، خودایـەک هەیـە کـە شـتەکان و بەهـاکان و نرخـەکان ڕێـز دەکات و دەیانپارێزێـت و کـەی ویسـتی لەناویـان دەبـات. لـە کاتێکـدا کۆمەڵناسـی لـەو گریمانـەوە دەسـت پـێ دەکات، کـە پێـی وایـە کۆمەڵگـە تاکەکـەس و گروپەکانـی نـاوی دروسـتی دەکـەن و بەڕێـوەی دەبـەن و دەیگـۆڕن. هەمـوو ئـەو وێنانـەی لـە خوداناسـییەوە بـۆ کۆمەڵگـە دروسـت دەبـن، وێنەیەکـن یـەک پرنسـیپ و یـەک مانـا و یـەک هەقیقـەت و یـەک ئیـرادە، دەکەنـە دروسـتکەر و پاڵنـەر و دەسـکاریکەری کۆمەڵگـە. لـە کاتێکـدا هەمـوو ئـەو وێنانـەی لـە

دیدیکی کۆمەڵناسییەوە دێن، پێ لەسەر جیاوازی و ناکۆکی و ململانێ و فرەڕەنگی و فرەدیدی و فرەهەقیقەتی دادەگرن.

ئەم جیاوازییە قووڵەیە وا دەکات کۆمەڵناسێکی گەورەی وەک پیتەر بێرگەر بڵێت لەپشتی دیدی کۆمەڵناسییەوە "بێخوداییەکی میتۆدی" هەیە. واتە کۆمەڵناس لە شیکردنەوەیدا بۆ کۆمەڵگە لە بوونی خودایەکەوە لەپشتی واقیع و لەپشتی کۆمەڵگە و لەپشتی بوونی کۆمەڵایەتییەوە دەست پێ ناکات، بەڵکوو لە خاڵی کۆبوونەوە و پێکەوەژیانی کۆمەڵێک ئینسان و کۆمەڵێک گروپەوە دەست پێ دەکات، بەبێ خودا. خوداناسی لەو گریمانەوە دەست پێ دەکات، کە لە دەرەوەی واقیعی ئامادە و ئەزموونکراوی نێوان ئینسان و گروپەکاندا، واقیعێکی تری نەبینراو و ئاسمانی هەیە. خوداناسی دیاردەکانی ناو واقیعی ئامادە لە پەیوەندیدا بەو واقیعە ئاسمانییەوە دەخوێنێتەوە و هەر لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییەشەوە هەڵیان دەسەنگێنێت و داوەرییان دەکات. لە کاتێکدا کۆمەڵناسی تەنها لەسەر واقیعی ئەزموونکراو خۆی ئەدوێ و ئەم واقیعەش وەک پێدراوێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی سەرزەمینیی کاتی و قابیلی گۆڕان مامەڵە دەکات. لە ڕاستیدا سەرەکیترین جیاوازی نێوان ئەم دوو دیدە، لە پەیوەندییاندا بە چەمکی جیاوازییەوە دەر دەکەوێت. خوێندنەوەی خوداناسانەی واقیع، خوێندنەوەیەکە سەرجەمی دیاردەکان دەباتەوە بۆ سەر بوونی یەک فیکرە و یەک پرنسیپ و یەک هەقیقەت. تەواو وەک چۆن خوداناسی خودایەک لەپشتی دونیاوە وێنا دەکات، ئاواش لەپشتی کۆمەڵگەوە یەک پرنسیپ و یەک هەقیقەت و یەک سیستمی ئەمر و نەهیکردن وێنا دەکات، کە بەسەریەکەوە وەک چیمەنتۆیەکی کۆمەڵایەتی پارچە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بەیەکەوە گرێ دەدات. لە کاتێکدا دیدی کۆمەڵناسانە، کۆمەڵگە لە جیاوازییەکان و ململانێکان و ناکۆکییە جۆربەجۆرەکانیدا دەبینێت و وەک ڕووبارێک وێنای دەکات، کە بەردەوام لە جووڵە و گۆڕان و

# له خوداناسییه‌وه بۆ کۆمه‌ڵناسی

هه‌موو کۆمه‌ڵگه‌یه‌ک پێکهاتێکی ئاڵۆزو فره‌ڕه‌نگ و فره‌خه‌ونه‌، زۆر زه‌حمه‌ته کۆمه‌ڵگه‌یه‌ک بدۆزینه‌وه ته‌نها یه‌ک بیر، یه‌ک دید، یه‌ک شێوازی چاوه‌ڕوانی، یه‌ک هه‌قیقه‌ت، یه‌ک تێگه‌یشتن بۆ خۆی و یه‌ک تێگه‌یشتنی بۆ دونیای ده‌وروبه‌ر، به‌ڕێوه‌ی ببات. کۆمه‌ڵگه مانای جیاوازی، مانای ململانێ، مانای ئاماده‌گیی دید و بۆچوون و ته‌ماحی جیاواز، مانای جووڵه و گۆڕانی به‌رده‌وام. ئه‌و دیده‌ی کۆمه‌ڵگه وه‌ک یه‌که‌یه‌کی لێکچوو و هارمۆنی و بێ جیاوازی ده‌بینێت، که هه‌ڵگری یه‌ک هه‌قیقه‌ت و یه‌ک شێوازی ژیان و یه‌ک سیستمی ئه‌خلاقی و یه‌ک شێوازی داوه‌ریکردنه‌، دیدێکی دینییه‌. دیدێکه زیاتر سه‌ر به کایه‌ی خوداناسییه‌، نه‌ک کۆمه‌ڵناسی.

خوداناسی له‌و گریمانه سه‌ره‌کییه‌وه ده‌ست پێ ده‌کات، که پێی وایه له‌پشتی واقیع و له‌پشتی حوکمه ئه‌خلاقی و سیاسی و فه‌رهه‌نگییه‌کانه‌وه‌، خودایه‌ک هه‌یه که شته‌کان و به‌هاکان و نرخه‌کان ڕیز ده‌کات و ده‌یانپارێزێت و که‌ی ویستی له‌ناویان ده‌بات. له کاتێکدا کۆمه‌ڵناسی له‌و گریمانه‌وه ده‌ست پێ ده‌کات، که پێی وایه کۆمه‌ڵگه تاکه‌که‌س و گروپه‌کانی ناوی دروستی ده‌که‌ن و به‌ڕێوه‌ی ده‌به‌ن و ده‌یگۆڕن. هه‌موو ئه‌و وێنانه‌ی له خوداناسییه‌وه بۆ کۆمه‌ڵگه دروست ده‌بن، وێنه‌یه‌کن یه‌ک پرنسیپ و یه‌ک مانا و یه‌ک هه‌قیقه‌ت و یه‌ک ئیراده‌، ده‌که‌نه دروستکه‌ر و پاڵنه‌ر و ده‌سکاریکه‌ری کۆمه‌ڵگه‌. له کاتێکدا هه‌موو ئه‌و وێنانه‌ی له

پیادەکردنن.

بیرۆکەی چوارەم، بیرۆکەی رەخنەیە. لە ڕاستیدا ڕۆشنگەری لە زۆر ڕووەوە مانای ئامادەگیی عەقڵیەتێکە، سڵ لە ڕەخنەکردنی هیچ پێدراوێکی ژیانی سیاسی و فەرهەنگی و ڕۆحی و کۆمەڵایەتی نەکاتەوە. ڕەخنە ببێتە یەکێک لە بەها فیکرییە هەرە گەورە و گرنگەکان. بێگومان ڕۆشنگەری لە مێژووی خۆیدا تووشی نووشستیی گەورە هات، دونیای دوای ڕۆشنگەری بڕێکی زۆری لە خۆشباوەڕییەکانی ڕۆشنگەری بەدرۆ خستەوە، بەڵام ئەوەی تا ئەمڕۆکە لە ڕۆشنگەری بەزیندوویی ماوەتەوە، ئەو پێداگرتنە گەورەیەیە لەسەر ئازادی و سەربەخۆیی ئینسان، کە لەگەڵ خۆیدا هێنای.

# له خوداناسییەوە بۆ کۆمەڵناسی

هەموو کۆمەڵگەیەک پێکهاتێکی ئاڵۆزو فرەڕەنگ و فرەخەونە، زۆر زەحمەتە کۆمەڵگەیەک بدۆزینەوە تەنها یەک بیر، یەک دید، یەک شێوازی چاوەڕوانی، یەک هەقیقەت، یەک تێگەیشتن بۆ خۆی و یەک تێگەیشتنی بۆ دونیای دەوروبەر، بەڕێوەی ببات. کۆمەڵگە مانای جیاوازی، مانای ململانێ، مانای ئامادەگیی دید و بۆچوون و تەماحی جیاواز، مانای جووڵە و گۆڕانی بەردەوام. ئەو دیدەی کۆمەڵگە وەک یەکەیەکی لێکچوو و هارمۆنی و بێ جیاوازی دەبینێت، کە هەڵگری یەک هەقیقەت و یەک شێوازی ژیان و یەک سیستەمی ئەخلاقی و یەک شێوازی داوەریکردنە، دیدێکی دینییە. دیدێکە زیاتر سەر بە کایەی خوداناسییە، نەک کۆمەڵناسی.

خوداناسی لەو گریمانە سەرەکییەوە دەست پێ دەکات، کە پێی وایە لەپشتی واقیع و لەپشتی حوکمە ئەخلاقی و سیاسی و فەرهەنگییەکانەوە، خودایەک هەیە کە شتەکان و بەهاکان و نرخەکان ڕێز دەکات و دەیانپارێزێت و کەی ویستی لەناویان دەبات. لە کاتێکدا کۆمەڵناسی لەو گریمانەوە دەست پێ دەکات، کە پێی وایە کۆمەڵگە تاکەکەس و گروپەکانی ناوی دروستی دەکەن و بەڕێوەی دەبەن و دەیگۆڕن. هەموو ئەو وێنانەی لە خوداناسییەوە بۆ کۆمەڵگە دروست دەبن، وێنەیەکن یەک پرنسیپ و یەک مانا و یەک هەقیقەت و یەک ئیرادە، دەکەنە دروستکەر و پاڵنەر و دەسکاریکەری کۆمەڵگە. لە کاتێکدا هەموو ئەو وێنانەی لە

دیدێکی کۆمەڵناسییەوە دێن، پێ لەسەر جیاوازی و ناکۆکی و ململانێ و فرەڕەنگی و فرەدیدی و فرەهەقیقەتی دادەگرن.

ئەم جیاوازییە قووڵەیە وا دەکات کۆمەڵناسێکی گەورەی وەک پیتەر بێرگەر بڵێت لەپشتی دیدی کۆمەڵناسییەوە "بێخوداییەکی میتۆدی" هەیە. واتە کۆمەڵناس لە شیکردنەوەیدا بۆ کۆمەڵگە لە بوونی خودایەکەوە لەپشتی واقیع و لەپشتی کۆمەڵگە و لەپشتی بوونی کۆمەڵایەتییەوە دەست پێ ناکات، بەڵکوو لە خاڵی کۆبوونەوە و پێکەوەژیانی کۆمەڵێک ئینسان و کۆمەڵێک گروپەوە دەست پێ دەکات، بەبێ خودا. خوداناسی لەو گریمانەوە دەست پێ دەکات، کە لە دەرەوەی واقیعی ئامادە و ئەزموونکراوی نێوان ئینسان و گروپەکاندا، واقیعێکی تری نەبینراو و ئاسمانی هەیە. خوداناسی دیاردەکانی ناو واقیعی ئامادە لە پەیوەندیدا بەو واقیعە ئاسمانییەوە دەخوێنێتەوە و هەر لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییەشەوە هەڵیان دەسەنگێنێت و داوەرییان دەکات. لە کاتێکدا کۆمەڵناسی تەنها لەسەر واقیعی ئەزموونکراو خۆی ئەدوێ و ئەم واقیعەش وەک پێدراوێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی سەرزەمینیی کاتی و قابیلی گۆڕان مامەڵە دەکات. لە ڕاستیدا سەرەکیترین جیاوازی نێوان ئەم دوو دیدە، لە پەیوەندییاندا بە چەمکی جیاوازییەوە دەر دەکەوێت. خوێندنەوەی خوداناسانەی واقیع، خوێندنەوەیەکە سەرجەمی دیاردەکان دەباتەوە بۆ سەر بوونی یەک فیکرە و یەک پرنسیپ و یەک هەقیقەت. تەواو وەک چۆن خوداناسی خودایەک لەپشتی دونیاوە وێنا دەکات، ئاواش لەپشتی کۆمەڵگەوە یەک پرنسیپ و یەک هەقیقەت و یەک سیستمی ئەمر و نەهیکردن وێنا دەکات، کە بەسەریەکەوە وەک چیمەنتۆیەکی کۆمەڵایەتی پارچە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بەیەکەوە گرێ دەدات. لە کاتێکدا دیدی کۆمەڵناسانە، کۆمەڵگە لە جیاوازییەکان و ململانێکان و ناکۆکییە جۆربەجۆرەکانیدا دەبینێت و وەک ڕووبارێک وێنای دەکات، کە بەردەوام لە جووڵە و گۆڕان و

هەڵبەزودابەزدا بێت.

بە بۆچوونی من، دیدی خوداناسانە بۆ کۆمەڵگە دیدێکی ترسناک و پڕمەترسییە، چونکە دەیەوێت ئاڵۆزییەکانی ناو کۆمەڵگە بۆ وەک یەک وێنە، هەقیقەتە جیاوازەکان بۆ یەک هەقیقەت و ئامانجە هەمەڕەنگەکان بۆ یەک ئامانج و ویستە جیاوازەکان بۆ یەک ویست و چاوەڕوانییە هەمەجۆرەکان بۆ یەک چاوەڕوانی و شێوازە جیاوازەکانی ژیان بۆ یەک شێوازی ژیان و فرەجۆریی بەهاکان بۆ یەک سیستمی بەها و دەرکەوتە ئەخلاقییە جیاوازەکان بۆ یەک سیستمی ئەخلاقی، کورت بکاتەوە. هەموو کورتکردنەوەیەکی لەم بابەتەش، بەناو دەریایەک لە توندتیژیی ڕەمزی و توندوتیژیی ڕاستەقینەدا تێدەپەڕێت. هەموو هەوڵدانێک بۆ دۆزینەوە و بەرهەمهێنانی هەقیقەتی جیاواز وەک هەوڵدان بۆ دەرچوون لەو هەقیقەتە ئاسمانییە وێنا دەکات، کە خوداناسی هەڵگریەتی. ئەمەش تەواو ناکۆکە بەو ڕاستییە کۆمەڵایەتییە سادانەی کە نیشانمان ئەدەن کۆمەڵگە گشتێکی ئاڵۆزە و هەرگیز بە یەک ئاڕاستەدا ناجووڵێت و بە یەک ئاڕاستەشدا ناڕوات، بەڵکوو بە زیاد لە ئاڕاستەیەکدا دەڕوات و لە زیاد لە ئاستێکدا دەجووڵێت. هەندێک هێز هەن بەردەوام تەماشای پێشەوە دەکەن و دەیانەوێت شتی تازە و ئەزموونی تازە و شێوەژیانی تازە بدۆزنەوە، تا ئەو ئاستەی دەکرێت هەندێکیان بە هێزی مۆدەپەرست ناو ببەین. لە کاتێکدا هێزی دی هەن تا پێیان بکرێت ئاوڕ لە دواوە و لە ڕۆژگارە دوورەکان ئەدەنەوە، لەناو وێنەکانی کەلەپوور و خەیاڵەکانی ڕابردوودا دەژین و دەخوازن دونیای ئەمڕۆ لەسەر هەمان شێوە و هەمان مۆدە و هەمان مۆدێلی دونیای جاران ڕێک بخەنەوە. دەکرێت بەمەیان بڵێین هێزی ڕابردوو، یان کەلەپوورپەرست. بێگومان لەناو هەریەکێک لەم دوو گروپەشدا، ئاست و ڕادەی جیاوازی مۆدەپەرستی و ڕابردووپەرستی هەیە. ئەمە جگە لە بوونی چەندەها گروپی دیکە، کە نە مۆدەپەرستن

و نە ڕابردووپەرستن، بەڵکوو بیرکردنەوەی تریان هەیە و شێوەژیانی تایبەتیی خۆیان دەژین.

بە بۆچوونی من، یەکێک لە ڕۆڵە هەرە گرنگەکانی ڕۆشنبیران لە کۆمەڵگەدا ئەوەیە، بەردەوام ئاڵۆزییە گەورەکانی ناو هەناوی کۆمەڵگە و ناو ژیانی کۆمەڵایەتی نیشان بدەن. ئەوە وەبیری خەڵک بهێننەوە، کە ئەوان هەمیشە لە دونیایەکی ئاڵۆزدا دەژین و هەمیشەش زیاد لە شێوازێک و زیاد لە ڕێگەیەک و زیاد لە مۆدێک بۆ ژیان هەیە، هەمیشە زیاد لە پەیوەندییەک هەیە بە ئێستاوە و زیاد لە پردێک هەیە بۆ پەڕینەوە بەرەو ئایندە و زیاد لە تێگەیشتنێک هەیە بۆ ڕابردوو. ئەرکی ڕۆشنبیر ئەوەیە بەردەوام وەبیرمان بهێنێتەوە ئەو ساتەوەختەی تێیدا دەژین، ساتەوەختێکی ئەبەدی نییە، شتێک نییە خودا سەپاندبێتی، یان ئەمرێکی خودایی لە پشتیەوە بێت و هەمیشە هەبووبێت و هەمیشەش بەو جۆرە بمێنێتەوە. کاری ڕۆشنبیر ئەوەیە، نیشانی بدات ئەوەی کە ئێستا هەیە، تەواو جیاوازە لەوەی کە نیوسەدە، یان چارەکەسەدەیەک، یان تەنانات دەیەیەک لەمەوپێش لەئارادا بووە. هەروەها ئەوەشی کە دەیەیەکی دیکە یان چارەکەسەدەیەکی دیکە یان نیوسەدەی دیکە دێت، تەواو جیاواز دەبێت لەوەی لە ئێستادا هەیە. کاری ڕۆشنبیر ئەوەیە نەهێڵێت ئینسان باوەڕی بەوە بێت، کە دونیا ناگۆڕێت، ئەو ئەگەرانە نیشان بدات، کە هەمیشە دەشێت دەرگایەک، یان کۆمەڵێک دەرگا بکەنەوە و دونیا لە جووڵە و گۆڕانەکانیدا نیشان بدەن. ڕۆشنبیر دەبێت هەڵگری ئەو دیدە کۆمەڵناسییە بێت، کە پێمان دەڵێت کۆمەڵگە هەرگیز هەڵگری یەک پرسیار نییە کە تەنها یەک وەلامیشی هەبێت، بەڵکوو کۆمەڵگە هەردەم هەڵگری چەندەها پرسیارە و هەر پرسیارێکیش قابیلی چەندەها وەلامدانەوەی جیاوازە. لەمەش گرنگتر، پێداگرتنە لەسەر ئەو ڕاستییەی کە هیچ یەکێک لەو پرسیارانەی کۆمەڵگەیەک لە ساتەوەختێکی مێژوویی

دیاریکراودا دەیانکات، ناکرێت بەتەواوی وەڵام بدرێنەوە، هەمیشە لەپشتی وەڵامدانەوەی پرسیارە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بۆشاییەک دەمێنێتەوە، کە ڕێگە بۆ دروستبوونی پرسیاری تر و ئەگەری وەڵامدانەوەی تر دەکەنەوە. بۆ ئەوەی کۆمەڵگە بناسین، دەبێت لە خوداناسییەوە بپەڕینەوە بۆ کۆمەڵناسی، ئەمەش کارێکە بێ هەوڵ و کۆششی بەردەوامی ڕۆشنبیران مەحاڵە.

# کەی ئیسلامییەکانی کوردستان گەورە دەبن؟

جارێکی دیکە ئیسلامییەکانی کوردستان سەلماندیانەوە هێزگەلێکن ناتوانن باز بەسەر ئەو گوتارە ئایدیۆلۆژییە دینییە داخراوەدا بدەن، کە هەڵگرین و ناتوانن وەک بزاوتێکی سیاسیی کامڵ و پێگەیشتوو و هەڵگری سەرەتا سادەکانی دیموکراسیەت، هەڵسوکەوت بکەن. هەموو جارێک کە دەمانەوێت ئەو دیدە لای خۆمان پەرە پێبدەین کە ئەم هێزانە ماڵئاواییان لەو ڕابردووە ئایدیۆلۆژییە نادیموکراسە کردووە، کە لە سەردەمی سەید قوتبەوە بەشێکە لە گوتاری ئیسلامی سیاسی، شتێک ڕوو دەدات، دەمانباتەوە خاڵی سەرەتا و هەموو ئەو ترس و دوودڵی و گومانانەمان لا زیندوو دەکەنەوە وامان لێ بکات گومان لە نیاز و لە ویستی دیموکراسییانەی ئەم هێزانە بکەین. من لە ساڵانی ڕابردوودا و لە ئێستاشدا، لە سنووری باوەڕبوونی تەواومدا بە دیموکراسیەت، بەرگریی تەواوم لە هەموو دەنگێک کردووە، کە کەوتبێتە ژێر فشاری ناهەق و هەڕەشەی دەسەڵاتگەرانەی هێزە باڵادەستەکانی کوردستانەوە، تا بە بەرگری لە هێزە ئیسلامییەکانی کوردستانیش دەگات، هەمیشە بەرگریشم لەو بۆچوونە کردووە، کە ئیسلامییەکانی کوردستان دەتوانن ببنە گەمەکەری سیاسیی دیموکراس و دەتوانن ڕووە دینییەکەی دیموکراسیەت و مەسەلەی نەتەوایەتی بە یەکدی تێکەڵ بکەن. بەڵام وەک چۆن هێزە باڵادەستەکانی کوردستان بەردەوام تووشی نائومێدیمان دەکەن لە

مەسەلەی کرانەوە و دیموکراسیبووندا، بە هەمان شێوە ئیسلامییەکانی کوردستانیش بەردەوام تووشی هەمان نائومێدیمان دەکەن. دواهەمین ڕووداوێک کومانەکانمانی زیندوو کردەوە، ئەو هەڵوێستە توندڕەوەی یەکگرتووی ئیسلامییە بەرامبەر بە گۆڤاری "وێران،" کە ژمارە شەشی لە ماوەی پێشوودا کەوتە بازاڕەوە. مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکگرتوو بەیاننامەیەکی ڕەسمیی توندی لە دژی ئەو گۆڤارە بڵاو کردۆتەوە، کە پڕیەتی لە هەموو ئەو ڕەگەزانەی هێما بۆ ئاکارە نادیموکراسییە ترسناکەکان دەکات.

بەیاننامەکەی یەکگرتوو دەنووسێت، "لەم ڕۆژانەدا (...) گۆڤارێک بە ناوی (وێران)ەوە کەوتە بازاڕ، تیایدا بە شێوازێکی زۆر ناشیرین هێرش دەکاتە سەر مەقامی پیرۆزی پێغەمبەرانی خوا و سوکایەتییان پێ دەکات، جگە لەمەش، بە زمانێکی سێکسییانەی قێزەون و وروژێنەر چەندین بابەتی بڵاو کردۆتەوە، کە تەواو نامۆن بە کولتووری جوان و ڕەسەنی کوردەواریمان و هەموو بەها پیرۆزەکانی پێشێل کردووە." بێگومان ئەمە یەکەم جار نییە هێزەکانی ئیسلامیی سیاسی بە ناوی "کولتووری جوان" و "ڕەسەنی کوردەواری"یەوە قسە دەکەن، خۆیان بە دەمڕاستی ئەو "کولتووره جوانە" دەزانن و هەرشتێک لەگەڵ دیدی ئەواندا نەکونجا، وەک لادان لەو "کولتووره ڕەسەن"ە وێنای بکەن. لێرەدا قسەم لەسەر ئەوە نییە، یەکگرتوو چۆن کولتووری کوردیمان بۆ پێناس دەکات و چۆن پێمان دەڵێت ئەم کولتووره چییە و کامەیە، چونکە هەر لە ئەساسەوە شتێک نییە ناوی یەک کولتووریی کوردی بێت. کورد وەکو هەموو میللەتانی دونیا، چەندەها کولتووری جیاوازی هەیە، هەر ناوچەیەک کولتوورێکی هەیە و هەر چین و توێژ و گروپێکی کۆمەڵایەتیش کولتووری خۆی هەیە، ئەو کولتوورەی لە شارێک لە شارەکاندا هەیە، لەوی دیکەیاندا بوونی نییە، کولتووری لادێکانیش تەواو لە کولتووری

شارەکان جیاوازە، کولتووری خەڵکی خوێندەوار و کولتووری کەسانی نەخوێندەوار، یەک کولتوور نییە، ئەو کوردەی لەگەڵ عەرەبی عێراقیدا پەیوەندیی زۆرە، کولتوورێکی هەیە جیاواز لەو کوردەی لەگەڵ ئێران یان تورکیادا پەیوەندیی هەیە.

بەکورتی، کولتوور شتێک نییە هەموو کەسێک بە هەمان مانا هەیبێت و هەموو کەسێک هەمان تێگەیشتنی بۆی هەبێت. بێگومان بوونی جیاوازیی کولتووری و جیاوازیی تێگەیشتن بۆ کولتوور، شتێک نییە تایبەت بێت بە کورد، بەڵکوو یەکێکە لە ئاکارە سەرەکییەکانی هەموو میللەتانی دونیا. هیچ میللەتێک نییە تەنها خاوەنی یەک کولتوور بێت، تەنانەت هیچ میللەتێک نییە یەک تێگەیشتنی یەکگرتووی بۆ هەمان دین هەبێت، کە زۆرینەی ئەو میللەتە باوەڕیان پێیەتی، دینیش وەک کولتوور، چەندەها شێواز و دەرکەوت و لێکدانەوەی جیاوازی هەیە، کە ناکرێت بۆ یەک تێگەیشتن کورت بکرێتەوە. لە ڕاستیدا من لێرەدا کات و ڕووبەری ئەوەم نییە زۆر لەسەر ئەم خاڵە بڕۆم، هەرکەسێک بیەوێت شتێکی کەم لەسەر ئەنترۆپۆژیای کولتوور -واتە زانستی ناسینی کولتوور- تێبگات، دەزانێت هەڵەیەکی گەورەیە بەو شێوەیە باس لە کولتووری نەتەوەیەک بکرێت وەک لە بەیاننامەکەی یەکگرتوودا هاتووە. ئەو خاڵەی لێرەدا گرنگە وەبیری هەموانی بهێنمەوە، ئەوەیە، ئەم شێوازی باسکردنەی کولتوور، شێوازی باسکردنیەتی لە ئەزموونە دیکتاتۆرییە تۆقێنەرەکاندا. ئەو دێڕانەی سەرەوە ڕێک وەک قسەی خومەینی وایە لەسەر کولتووری ئێرانی، قسەی بن لادن لەسەر کولتووری ئیسلامی، قسەی سەدام حوسەین لەسەر کولتووری عێراقی. بەدەگمەن دیکتاتۆرێک ئەدۆزینەوە سەری زمان و بنی زمانی باسی پاراستنی کولتووری "جوان" و "ڕەسەن"ی نەتەوەکەی نەبێت لە سوکایەتیپێکردن.

بەیاننامەکە لە بەشێکی دیکەدا دەربارەی گۆڤاری وێران دەنووسێت

"دژایەتی ئادابی گشتی و موقەدەساتیگەلی کوردی موسڵمانی کردووە، بەمەش یاساکانی هەرێمی بەگشتی و یاسای ڕۆژنامەگەریی بەتایبەتی پێشێل کردووە. ئێمە لە مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکگرتوو، بەتوندی ناوەڕۆکی ئەم (گۆڤارە ئەدەبییە نوێخواز)ە! ئیدانە و ڕەت دەکەینەوە و بە هەوڵێکی نەزۆکی تێکدەرانەی دەزانین و باوەڕمان وایە ئامانجی(ویران)، وێرانکردنی باری ئەخلاقی و تێکدانی ئاسایشی کۆمەلایەتی و پچڕاندنی شیرازەی خێزانە لە کۆمەڵگەی کوردستاندا و هەوڵێکی ترسناکە بۆ پەلکێشکردنی گەنجەکانمان بەرەو هەڵدێری بێهودەیی و عەبەسیەت و بەدرەوشتی و دوورخستنەوەیان لە هەموو ئاکارێکی جوان و بەهایەکی بەرز." لەپشتی ئەم دێڕانەوە، سیاسەتی دروستکردنی دوژمنێکی ترسناک ئامادەیە کە دەبێت لەناو ببرێت. هەرکەسێک ئەم دێڕانە بخوێنێتەوە، لە سیحر و توانا و کاریگەری ئەفسانەیی گۆڤارێکی لەم جۆرە سەری سووڕ دەمێنێت. ئایا بەڕاستی گۆڤارێکی ئەدەبی کەم تیراژ، دەتوانێت ئەو ڕۆڵە تێکدەرە ببینێت لە کاتێکدا یەکگرتوو هێزە ئیسلامی و نائیسلامییەکانی تر لە کوردستاندا، ڕۆژانە لە ڕێگەی دەیان کەناڵی تەلەڤزیۆن و سەدان ڕادیۆ و دەیەها ڕۆژنامە و گۆڤار و کۆڕ و کۆبوونەوە و لە ڕێگەی هەزاران مزگەوتەوە، کۆمەڵگەی کوردی پڕ دەکەن لە قسە و بۆچوون و حیکایەت و ڕەمز و ئەحکام و ترس و ئاکاری دینی. ئەم بڕە زۆرەش لە قسەکردنی دینی، بەشێکی گەورەی خورافەتێکی تەواوە و لەسەر ترساندنی ئینسان و بچووککردنەوەی ئیرادە و کەمکردنەوەی توانا عەقڵییە ڕەخنەییەکانی کار دەکات. کەم ئەزموونی دیکتاتۆرییان لە دونیادا هەیە ئەم زمانەی یەکگرتووی بەکار نەهێنابێت و ئەو وێنە ناڕاست و پڕ مەترسییە فووتێکراوانەی بوونی مەترسییەکی گەورەی نەورووژاندبێت، کە یەکگرتوو لێرەدا دەیانورووژێنێت.

زمانی دیکتاتۆرییانە و تۆقێنەری بەیاننامەکە لە کۆتاییەکەیدا بەتەواوی

ئاشکرا دەبێت کە داوای ئەوە دەکات هەموو کۆمەڵگەی کوردی دژی ئەو گۆڤارە و نووسەرەکانی ڕابوەستنەوە "تا ببنە پەند بۆ هەر کەسێک کە سووکایەتی بە موقەدەساتی گەلەکەمان دەکات و ئاسایشی کۆمەڵایەتی کوردستان دەخاتە مەترسییەوە." وازنەهێنان لەم عەقڵیەتە، وازنەهێنانە لەو مەیلە تۆتالیتارییە شاراوەیەی لەناو زۆرێک لە هێزەکانی ئیسلامی سیاسیدا ئامادەیە.

# کێشەی خراپ خوێندنەوە و خراپ تێگەیشتن

## سەرەتا

مانگێک دوای بڵاوبوونەوەی ئەو گۆشەیەی من لە ڕۆژنامەی ئاوێنەی ڕۆژی ١٥ی مانگی چواری ساڵی ٢٠١٠دا، بە ناونیشانی لە "خوداناسییەوە بۆ کۆمەڵناسی، کاک (کۆشان عەلی بەردەکۆزیی) لە ڕۆژنامەی (هاووڵاتی) ڕۆژانی ١٤، ١٨، ٢١ و ٢٥ی مانگی پێنجدا، بە چوار ئەڵقە وەڵامێکی درێژی ئەو نووسینەی منی دایەوە. ئەوەی خوێنەران لێرەدا دەیخوێننەوە، وەڵامێکی خێرا و سەرەتاییە بەو بۆچوونانەی کاک کۆشان لە نووسینەکەیدا دەری بڕیون. پێش هەموو شتێ، دەمەوێت خوێنەر لەوە ئاگادار بکەمەوە، کە ئەم وەڵامە کەمتر فۆرمی وتوویژ و دیالۆگێکی فیکری دەگرێتە خۆی، واتە کەمتر ئەچێتە قاڵبی موناقەشەکردنی فیکری و ئەرگومێنتکۆڕینەوە و بەریەککەوتنی شێوازی جیاوازی بیرکردنەوەی عەقڵانییەوە، بەڵکوو زیاتر فۆرمی ڕاستکردنەوەی هەڵە و نیشاندانی خراپخوێندنەوە و تێنەگەیشتن لە مەبەستی نووسەرێک دەگرێتە خۆی. هۆکاری ئەم مەسەلەیەش ئەوەیە، نووسینەکەی کاک کۆشان زەمینەیەک بۆ دیالۆگی لەم بابەتە ناهێڵێتەوە. ئەو بەڕێزە نەهاتووە بۆچوونەکانی من وەک خۆیان چۆنن ئاوا وەریان بگرێت و دواتر موناقەشەیان بکات،

بەڵکوو زۆربەی هەرە زۆریانی بە هەڵە خوێندووەتەوە و بە شێوەیەکی ناڕاست و نادروست لێکی داونەتەوە.

کاک کۆشان تەنانەت مانای گرنگترین چەمکێک کە نووسینەکەی منی لەسەر بینا کراوە، مەبەستم چەمکی "خوداناسییە،" بە هەڵە لێک داوەتەوە و سەرجەمی وەڵامەکەی خۆشی لەسەر ئەو هەڵەکارییە بونیاد ناوە. ئەم مامەڵەکردنە تایبەتییە وا دەکات ئەوەی من لێرەدا دەینووسم، لەوە تێپەڕ ناکات، ڕاستکردنەوەی بڕێک لە لێکدانەوە و تێگەیشتنە ناڕاستەکانی کاک کۆشان بێت بۆ نووسینەکەی من و ببێتە هۆی ئەوەش، کە ئەم نووسینە شێوەی دیالۆگێکی فیکری نەگرێتە خۆی. ئاشکرایە دیالۆگ کاتێک دروست دەبێت، کە کەسانی دیالۆگکەر لەسەر مانای دەستەواژە و پێناسە سەرەکییەکان یەک بن و بۆ هەردوو لایان ئاشکرا بێت، کە لە یەک بابەت ئەدوێن و ئەو چەمکانەی بەکاری دەهێنن بە یەک مانا بەکاری دەهێنن. دیالۆگ بۆ ئەوەی مانای هەبێت، دەبێت لەو زەمینە سەرەتاییە هاوبەشەوە دەست پێ بکات و دواتر بپەڕێتەوە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵێک دەرەنجام و خوێندنەوەی جیاواز و ناکۆک و ناتەبا لەگەڵ یەکدیدا. دیالۆگ پێویستی بە ئامادەگیی پانتاییەکی مەعریفی هاوبەش هەیە وەک خاڵی دەستپێکردن و دواتر پەڕینەوە بۆ بەرهەمهێنانی مانا و دید و بۆچوونی جیاواز. بەداخەوە ئەوەی کاک کۆشان نووسیویەتی، لەودیو ئەم سەرەتا پێویستەوەیە بۆ هەر دیالۆگێکی فیکری، ئەوەی ئەو دەیڵێت و باسی دەکات و وەک ڕەخنە ڕووبەڕووی منی دەکاتەوە، پەیوەندیی بەوەوە نییە، کە من لە ستوونەکەی (ئاوێنە)دا نووسیومە، وەک چۆن پەیوەندیشی نییە بە بڕێکی زۆری ئەو نووسینانەوە کە من لە ساڵانی ڕابردوودا دەربارەی دین نووسیومن. بەکورتی، کاک کۆشان لەسەر شتێک قسە دەکات، کە لە نووسینی مندا بوونی نییە، مانایەک بە چەمکە سەرەکییەکانی ناو نووسینەکەم ئەدات، کە ماناکانی من نین و دواتر بە کەیفی خۆیشی

دەرەنجام لە بەکارهێنانی ئەو چەمکانەوە وەر دەگریت. ئەمەش خراپترین شێوازی خوێندنەوە و ڕەخنەکردن و لێکدانەوەی نووسینی کەسێکە، کە بمانەوێت ڕەخنەی بکەین و بۆچوونەکانی بخەینە ژێر نیشانەی پرسیارەوە.

لەگەڵ ئەو ڕاستییانەشدا، من هێشتا وەڵامدانەوەی کاک کۆشانم بە پێویست زانی، نەک بە تەنها لەبەر ئەوەی دەمەوێت بەرگری لە بۆچوونەکانی خۆم بکەم و هەقیقەتی ئەو دیدە بۆ خوێنەر ئاشکرا بکەم، کە من لەو ستوونەدا دەرم بڕیوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەی ئەو خراپ خوێندنەوەیەی ئەو بەڕێزە پێی هەستاوە و ئەو هەڵانەی کردوونی، بەشێکن لەو هەڵە بونیادی و باوانەی ڕۆژانە لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا دەکرێن. وەک چۆن کرۆکی نووسینەکەشی درێژکراوەی ئەو گوتاری پاساوهێنانەوە و بەرگریکردنە سادە و بێقوڵاییەیە کە بڕێکی زۆری خوێندەوارانی دینی لە ڕۆشنبیریی ئێمەدا لە دینی دەکەن، پاساوهێنانەوەیەک، باز بەسەر بڕێکی زۆری ئەو ناشیرینییانەدا ئەدات، کە دین ڕۆژانە لە دونیای ئێمەدا بەرهەمی دەهێنێت و بەرگرییەکیش، کە نایەوێت و ناتوانێت سەرەتاییترین ڕەخنە لە دین لەو دونیایەدا قبوڵ بکات. لە هەردوو دۆخەکەشدا، ئەم گوتارە، دین وا مامەڵە دەکات، وەک ئەوەی لە دونیای ئێمەدا هیچ کێشەیەکی نەبێت و وەک ئەوەی دەرمانێکی سیحری بێت بۆ چارەسەرکردنی سەرجەمی کێشە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕۆحییەکان و ناشیەوێت هیچ شتێکی تێدا ببینێت جگە لە ئامرازێک بۆ بەرهەمهێنانی جوانی و مەحەبەت و ڕۆحانیەت نەبێت. بێگومان دین دەتوانێت بڕێکی دیاریکراوی ئەم ڕۆڵە ببینێت، واتە دەتوانێت خەریکی ئەوە بێت، دونیا و پەیوەندییەکان و شتەکان جوان بکات، بە بوونی ئینسان، قووڵاییەکی ڕۆحی ببەخشێت، ژیان بە نادیارێکەوە گرێ بدات و ئینسان بکاتە بوونەوەرێکی ناسکی پڕ مەحەبەت و پڕ بەرپرسیاریەتی و پڕ لێبووردن.

بەڵام ئەمە شێوازی سەرەکی ئامادەگی و ئیشکردنی دین نییە لە دونیای ئێمەدا. دین لە دونیای ئێمەدا دینێکی توورەیە، بە ڕادەیەکی زۆر ڕق و ناتەبایی و چەپاندن و هەڕەشە و ترساندن و بچووکرکردنەوە و داپۆشین و لێنەبووردن بەرهەم دەهێنێت. دین بەو شێوەیەی ئەمڕۆ هەیە، وەک ڕێگرێک لە بەردەم گەشەکردنی ڕۆحی و عەقڵی و ویژدانی ئینسانی ئێمەدا کار دەکات. خوداناسی و دینداریی ئەمڕۆکەی کۆمەڵگەی ئێمە، خوداناسی و دینداریییەکی بێقوولایی و شەڕانگێزە، نەک شتگەلێک، کە ئینسانبوونمان قووڵتر و پڕماناتر بکەن.

دین بەگشتی و خوداناسی بەتایبەتی، لەمڕۆکەی کۆمەڵگەی ئێمەدا، بە مانا و دید و بۆچوونی سەدە کۆنەکانەوە دێت و بەوانەوە قسە لەسەر کێشە مۆدێرنەکانی دونیا دەکات. بە ڕادەیەکیش بەرفراوان کراوە، کە بە مافی سروشتیی خۆی دەزانێت، لەسەر ورد و درشتی کێشە گەورە و بچووکەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری و ڕەمزیی کۆمەڵگەی ئێمە بدوێت. کەچی لە هەمان کاتدا، دین لە دونیای ئێمەدا ئەو وەزیفە ڕۆحی و ویژدانی و ئەخلاقییە نابینێت، کە پێویستە بیبینێت، نایەت لە گۆشەنیگایەکی تایبەتەوە ژیان دەوڵەمەند و جوان بکات، بەڵکوو بە ناوی چەندەها موقەدەسەوە دەیەها سنوور و سەدەها ڕێگر لە بەردەم بەختەوەری و ئاسودەگی ژیانی ئینساندا دروست دەکات. یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی ئامادەییی ئەم دۆخە ناڵەبارەی دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، جگە لە تازەنەبوونەوەی عەقڵیەتی دینی لە ناوەوەدا، ئەو گوتاری پاساوهێنانەوەیە بۆ دین کە هەوڵ دەدات ڕێ لە هەر هەوڵێکی ڕاستەقینەی ڕەخنەکردنی دین بگرێت و بەم کارەشی ڕێگەی تازەبوونەی عەقڵیەت و خەیاڵی ئایینی زەحمەت دەکات. نووسینەکەی کاک کۆشان، نموونەیەکی بەرچاو و ئاشکرای ئەم گوتاری پاساوهێنانەوەیەیە بۆ دین، کە لەدوای شۆڕشی ئێرانەوە، گوتاری باڵادەستە لە ناوچەکەدا.

جگە لەو خاڵانەش، نووسینەکەی کاک کۆشان بە ڕۆحێکی هێجگار پاتریارکییانەوە نووسراوە، ئەو نووسینەکەی من بە "وتاری بێ سەر و بەر" دائەنێت و "تەحەدا"ی من دەکات وەڵامی بدەمەوە، بە حیسابی خۆی دەیەوێت من "لەو گۆمە (مەنگ) و (کۆنەی)" تێی کەوتم دەر بهێنێت و لەبیریشی ناچێت بەناوی "مێژووەوە" قسە بکات و ڕووی دەمیشی بکاتە سەرجەمی ڕۆشنبیرانی کورد و هەمووومان پێکەوە نەسیحەت بکات. ئەم ڕۆحییەتەی کاک کۆشان، گەر ڕۆحییەتی پاتریارکە دینییەکانی ناو کۆمەڵگەی ئێمەش نەبێت، ئەو پاتریارکانەی وا دەزانن هەموو هەقیقەتەکانیان لەلایە، ئەوا بە ڕادەیەکی ترسناک لەو ڕۆحییەتەوە نزیکە. ئەم ڕۆحییەتە دەشێت ئایەتوڵلایەک، پاتریارکێکی دینی، یان ئایدیۆلۆژیستێک دروست بکات، بەڵام هەرگیز ناتوانێت ڕۆشنبیرێکی ڕەخنەیی پێبگەیەنێت. بەکورتی، هەموو ئەم شتانە وایان کرد وەڵامدانەوەی نووسینەکەی کاک کۆشان بە پێویست بزانم و لە هەمان کاتدا ئەو نووسینە وەک هۆکارێک بەکار بهێنم بۆ سەرلەنوێ نیشاندانەوەی بەشێک لە کێشە ستراکتورییەکانی ناو ڕۆشنبیریی کوردی.

## تەوەری یەکەم:

## "چەواشەکردنی خوێنەر"
## یان نەبوونی توانا بۆ جیاکردنەوەی شتەکان لە یەکتر

کاک کۆشان من بەوە تاوانبار ئەکات، گوایە خوێنەرم "لە بەرامبەر ڕاستییەکاندا"چەواشە کردووە و سەرم لێ تێک داوە و زانیاریی هەڵەم خستووەتە بەردەمی، بۆ ئەوەی وای لێ بکەم "بڕوای بەوە نەبێت کە کۆمەڵناسی و خوداناسی بەیەکەوە بگونجێن لە کۆمەڵگەدا." یاخود وا بکەم، خوێنەر ئەو "قەناعەتە"ی لا دروست ببێت ئەگەر کۆمەڵناس بوویت، ئیتر ناتوانیت خوداناس بیت و ئەگەر خوداناسیش بوویت، ناکرێت کۆمەڵناس بیت. بە بۆچوونی ئەو، من دەمەوێت خوێنەر ناچار بکەم لە "خوداناس"ەوە ببێت بە "کۆمەڵناس." بەوەندەش واز ناهێنێت، من بەوە تاوانبار دەکات گوایە خوێنەری کورد "فێری زانیاریی هەڵە" ئەکەم و بیروبۆچوونی کۆمەڵناسێکی بەناوبانگی بە هەڵە پێ دەناسێنم و بەم کارەشم "خیانەت" و "کوفری فیکری" ئەنجام دەدەم. هەروەها من بە "شوێنکەوتەی کەسێک" دەزانێت، مەبەستی پیتەر بێرگەری کۆمەڵناسە، کە ئەو کەسە خۆی باوەڕی بەو بۆچوونانە نەماوە، کە گوایە من لێم وەرگرتووە و بەرگرییان لێ دەکەم. بە بۆچوونی کاک کۆشان، من داوا لە خوێنەری کورد دەکەم لەنێوان دین و نادین، ئیمان و بێئیمانی و

باوەڕ و کوفردا یەکێکیان هەڵبژێرێت. لە کۆتاییشدا ئەو نووسینەکەی من وا دەبینێت، وەک ئەوەی هەوڵدانێک بێت بۆ "سڕینەوە" و بێماناکردنی ئایین و جێگرتنەوەی بە فیکری نادینی. لە هەمووشی سەیرتر، باس لەوە دەکات من لە ستوونەکەمدا ئەو چەمکانەی کە بەکارم هێناون "پێناس!"م نەکردوون، یان "پێناسی هەڵەم!" بۆ بەکار هێناون و ئەو دێت پێناسەکان ڕاست دەکاتەوە و هەقیقەتەکانیان نیشان دەدات.

بەکورتی، ئەمە پوختەی ئەو شتانەیە کە کاک کۆشان لەسەر ستوونەکەی من دەیڵێت و ئینجا دێت ڕەخنەیان دەکات. هەر لەم سەرەتایەوە دەمەوێت بە خوێنەر بڵێم، کە هیچ یەکێک لەم ڕەخنە و تۆمەتانە ڕاست نین و هەموویان لە تێنەگەیشتنێکی هێجگار خراپی کاک کۆشان بۆ نووسینەکەی من هاتوون و لە نەبوونی توانای جیاکردنەوەی ماناکان و ژانرەکان و چەمکەکان لە یەکدییەوە، سەرچاوەیان گرتووە.

یەکێک لەو کێشە گەورانەی ڕۆشنبیریی ئێمە بە دەستییەوە دەناڵێنێت، نەبوونی توانای جیاکردنەوەی کایەکان و جۆرەکانی نووسین و زانستە جیاوازەکانە لە یەکتری. ڕۆشنبیریی ئێمە تا ئەمڕۆش وتاری ڕۆژنامەگەری لە نووسینی ئەکادیمی، ڕا و سەرنج لە لێکۆڵینەوەی زانستی و تەنانەت لقە جیاوازەکانی ناو مەعریفە خۆشی لە یەکدی جیا ناکاتەوە. لەم ڕۆشنبیرییەدا، سنوورێک نییە، سۆسۆلۆژیا لە فەلسەفە و دەروونناسی لە ئینساننناسی و سیاسەتناسی لە خوداناسی جیا بکاتەوە. ژانرەکان و کایەکان بە شێوەیەکی خورافی بەناویەکداچوونَ و پێوەرێکی مەعریفی نییە لقە جیاوازەکانی مەعریفە و شێوازە جیاوازەکانی نووسین لە یەکدی جیا بکاتەوە. بۆیە لە دونیای ئێمەدا تێکەڵبوونێکی سەیر و ترسناکی شێوە جیاوازەکانی نووسین و شێوە جیاوازەکانی مەعریفە بە یەکتری دروست بووە و تێکستێک، کە پێویست بێت وەک سەرنج و ڕا تەماشا بکرێت، مامەڵەی نووسینی ئەکادیمی لەگەڵ دەکرێت و نووسینێکی

ئەکادیمیش کە پێویستە بەپێی پێوەری زانستی بنرخێندرێت، وەک نووسینێکی ڕۆژنامەنووسی مامەڵە دەکرێت. بەداخەوە، لە نووسینەکەی کاک کۆشاندا، دۆخی ئەم جیانەکردنەوەیە بە شێوەیەکی ترسناک ئامادەیە و هەر خودی نەبوونی ئەم توانای جیاکردنەوەیەشە بۆتە سەرچاوەی سەرەکی ئەو هەڵانەی تێیان کەوتووە.

سەرەتا کاک کۆشان نەیتوانیوە ستوونێکی ڕۆژنامەگەرییانە لە نووسینێکی ئەکادیمی جیا بکاتەوە. ئەو بەڕێزە حیسابی ئەوەی نەکردووە ئەوەی من لە (ئاوێنە)دا دەینووسم، کاری ئەکادیمی نییە، وتار نییە، لێکۆڵینەوە نییە، بەڵکوو ستوونە. کاک کۆشان ستوونەکە بە "وتار" ناو دەبات، بە وتارێکی "بێسەروبن و نادیار و ناڕاستەوخۆ." ئاخۆ وتاری ناڕاستەوخۆ چی بێت؟ جگە لەوە، باس لەوەش دەکات گوایە من لەو "وتارەدا!!!" کۆمەڵناسێکم (مەبەستی پیتەر بێرگەرە) بە هەڵە بە خوێنەری کورد ناساندووە. هەموو ئەمانە لە کاتێکدایە من نەک تەنها وتارم نەنووسیوە، بەڵکوو لەو کۆمەڵناسەش تەنها دوو وشەم وەرگرتووە، دوو وشە کە هێما بۆ میتۆدی مامەڵەکردنی زانستی سۆسیۆلۆژیا دەکات لەگەڵ ئایینـدا. واتە من نەک تەنها وتارم نەنووسیوە، بەڵکوو بە هیچ جۆرێکیش مەبەستم نەبووە ئەو کۆمەڵناسە بە خوێنەری کورد بناسێنم. فیکری کۆمەڵناسێک لە ستووندا بە خوێنەر ناناسێنرێت، ئەوەی بیەوێت کۆمەڵناسێک بە خوێنەران بناسێنێت، پێویستی بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زانستییە و لێکۆڵینەوەی زانستیش لە ستوون و لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکاندا ئەنجام نادرێت. (من دواتر دێمەوە سەر بەهەڵەحاڵیبوونی کاک کۆشان، لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی پیتەر بێرگەر بۆ دین و ئەو دوو وشەیەش کە من لەم کۆمەڵناسەم وەر گرتووە).

کاک کۆشان چونکە نەیتوانیوە جیاوازی لەنێوان ستوون و نووسینی ئەکادیمیدا بکات، داوای پێناسەکردنی زانستییانە بۆ کۆمەڵگە و کۆمەڵناسی

و دین لە ستووندا دەکات. ئەم داواکارییە لە ئاستە ڕۆژانەییەکەیدا لە داخوازی کەسێک دەچێت، لای دارتاشێک داوای هەنگوین بکات، یان لای شاعیرێک بە دوای دەرمانی کۆکەڕەشەدا بگەڕێت. هیچ ستوونووسێکی ئەم دونیایە شتەکان بە شێوەی زانستی و ئەکادیمی پێناسە ناکات. پێناسەی زانستی تەنها لە وتارە فیکری و ئەکادیمییەکاندا دەکرێت، نەک لە ستوونی ناو ڕۆژنامەکاندا. ستوون ژانرێکی تایبەتی نووسینی ڕۆژنامەگەرییانەیە کە ڕێسا و بەها و شێوازی تایبەتی خۆی هەیە. ئەم هەڵەیەی کاک کۆشان ناچارم دەکات لێرەدا کۆمەڵێک زانیاریی سەرەتایی لەسەر چییەتی ستوون بنووسم، کە پێم وایە زۆربەی هەرە زۆری خوێنەران دەیزانن و پێویستیان پێی نییە، بەڵام شێوازی جیانەکردنەوەی ژانرەکان لای کاک کۆشان بە ڕادەیەکە، هەست دەکەم ناچارم لێرەدا ئەم کارە بکەم.

ستوون نووسینێکی ڕۆژنامەوانیی کورتە، تیایدا زۆربەی کات نووسەر ڕا و بۆچوونەکانی خۆی بە ڕۆحی تەحەداکردنەوە دەنووسێت. لە ستووندا نووسەر خاڵێکی دیاریکراو دەگرێت و گەورەی دەکات، بەچڕی و هەندێک جار بەوپەڕی پەرگیرییەوە لەسەر ئەو خاڵە دەنووسێت. شێوازی نووسین و ئەرگومێنتهێنانەوەشی، زۆرجار، بێ موبالەغەکردن نابێت. ئەو بابەتانەی نووسەری ستوون قسەیان لەسەر دەکات، هەمەجۆرن، لە باسکردنی دوکانی بەقاڵێکەوە بیگرە بۆ باسکردنی تیۆرەیەکی فەلسەفی، تا بە باسکردنی گرنگترین ڕووداوە سیاسییەکانی دونیا دەگات. لەمەشدا مەبەستی ستوونووس لێکۆڵینەوەی زانستی نییە، بەڵکوو کۆکردنەوەی سەرنجی خوێنەرانە لەسەر ئەو دیاردانەی نووسەرەکە باسیان دەکات، تیشکخستنە سەر بابەتێکە، کە نووسەر لەو ساتەدا بە گرنگی دەزانێت قسەی لەسەر بکرێت، نیشاندانی هەڵوێستێکی دیاریکراوە، گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی تایبەتە، سەرنجێکی خێرایە لەسەر مەسەلەیەکی گرنگ.

وەک وتیشم، بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەرانیش رابکێشێت و وا بکات ببێتە بابەتی تێرامان و گرنگیپێدان، نووسەری ستوون زۆرجار ستوونەکانی بە زمانێکی تیژ و بە رۆحێکی(پۆلیمیک) ئامێز و بە زمانێکی ئەدەبی و شیعری دەنووسێت. بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە ستوون دەبێت فیکری تیا نەبێت، هەلگری دیدێک نەبێت و شتێکی گرنگ لەسەر ئەو بابەتە نەلێت کە قسەی لەسەر دەکات. دەکرێت ئەوەی نووسەرێک لە ستوونێکدا دەیلێت، هاوشان بێت بەوەی نووسەرێکی دیکە بە کتێبێک دەیلێت. بەلام لە هەموو ئەم دۆخانەدا ستوونووسینی زانستی و ئەکادیمی نییە. ئەوەی کەسێک بێت و داوای ئەو مەرجانە لە ستوون بکات کە بۆ نووسینی ئەکادیمی دانراون، مانای ئەوەیە ئەو کەسە ئەم دوو شێوازە نووسینە بە یەکدی تێکەل دەکات و ناتوانێت لە یەکتری جیایان بکاتەوە.

ئەوەی شوێنی سەرسوورمانە، کاک کۆشان دوای ئەوەی پێی وایە کە من "پێناس!!!" ی هەلەی کۆمەلگەم کردووە، خۆی چەند پێناسێکی جیاواز لە کۆمەلێک کۆمەلناسەوە وەر دەگرێت و بەدوای یەکدا ریزیان دەکات، کەچی کاتێک ئەنجامگیری دەکات، هەلەیەک دەکات، زەحمەتە کەسێک یەک وانەی کۆمەلناسی خوێندبێت، بیکات. لەگەل ئەوەشدا هەلەکەی خۆی بە ناوی راستکردنەوەی "هەلەی" منەوە بە خوێنەر دەناسێنێت. من لە ستوونەکەمدا دەلێم "هەموو کۆمەلگەیەک پێکهاتێکی ئالۆز و فرەرەنگ و فرەخەونە" و "زۆر زەحمەتە کۆمەلگەیەک بدۆزینەوە تەنیا یەک بیر، یەک دید، یەک شێوازی چاوەروانی، یەک هەقیقەت، یەک تێگەیشتن بۆ خۆی و یەک تێگەیشتن بۆ دونیای دەرەوە بەرێوەی ببات." کەچی کاک کۆشان دێت و دەلێت ئەم "پێناسە!!!" بۆ کۆمەلگە هەلەیە. بە بۆچوونی ئەو، کۆمەلگە هەیە جیاوازیی تێدا نییە و یەک دید و یەک خەون و یەک شێوە چاوەروانی و یەک بیر و یەک هەقیقەت بەرێوەی دەبات. بۆ ئەوەی بیشیسەلمێنێت کۆمەلگەی لەو جۆرە بوونی هەیە، باس

لـه کۆمەڵگـەی تۆتالیتـار ئـەکات، گوایـە لـەم جـۆرە کۆمەڵگەیـەدا جیـاوازی بوونـی نییـە و هەمـوو کۆمەڵگـە لەسـەر یـەک بنەمـا و یـەک ئەسـاس دروست بووه. بەداخـەوە، ئـەم بۆچوونـەی کاک کۆشـان بۆ کۆمەڵگـە نـەک هەڵەیـە، بەڵکوو وەکـوو خـۆی دەڵێـت "کوفرێکـی مەعریفیشـە." لـە هەمـوو ئەدەبیاتـی تۆتالیتاریزمـدا شـتێک نییـە نـاوی کۆمەڵگـەی بـێ جیاوازیـی بێت. تۆتالیتاریزم مانـای ئـەوە نییە کۆمەڵگە بۆتـە گشـتێکی لێکچـووی بێ جیاوازی و بێ ناکۆکـی و بێ دید و ویسـت و چاوەڕوانیی جیاواز. وەک هـەر کۆمەڵگەیەکـی دیکـە، کۆمەڵگـەی تۆتالیتـاری پـڕە لـە دیـد و ویسـت و چاوەڕوانیی جیـاواز، بـەڵام کێشـەکە لەوەدایـە ئـەو سیسـتمە سیاسییەی کـە لـە کۆمەڵگـەی تۆتالیتاریـدا ئامادەیـە، لەسـەر سـڕینەوە و وێرانکردنـی ئـەو جیاوازییانـە کار دەکات، ناهێڵێت تەعبیر لـە خۆیان بکـەن و لـە ڕێگـەی تـرس و تۆقاندنـەوە بڕێکـی زۆر لـە خەڵـک بێدەنـگ دەکات.

دەسـەڵاتی تۆتالیتـاری ئـەو شـێوە دەسـەڵاتەیە، وەک هانـا ئارێنـت دەڵێـت، "هەیمەنـەی سەرتاسـەری" دەوێـت، بـەڵام ئـەم ویسـتەی دەسـەڵات، یەکانگیـر نییە لەگـەڵ پێدراوە سۆسـیۆلۆژییەکانی کۆمەڵگـەی تۆتالیتـاردا. ئەزموونێکـی تۆتالیتـاری نادۆزینـەوە توانیبێتـی هەمـوو جیاوازییـە سۆسـیۆلۆژی و کولتووری و ڕەمزییەکانـی نـاو کۆمەڵگـەی لەناو بردبێت و هەموانی وەکوو یـەک لـێ کردبێـت. ئـەو پێناسـەیەی هانـا ئارێنـت بـۆ کۆمەڵگـەی تۆتالیتـاری دەیکات، وەک کۆمەڵگـەی "هەیمەنـەی سەرتاسـەری" مانـای ئـەوە نییـە کـە کۆمەڵگـە بـووە بـە یـەک و جیاوازیـی تێـدا نەمـاوە. ئەزموونـی نازییەتـی ئەڵمانـی، ئەزموونـی هەوڵـدان بـوو بـۆ دروسـتکردنی "مرۆڤـی سـوپەرمان" و ئەزموونـی سـتالینیزمیش، ئەزموونـی هەوڵدانـی دروسـتکردنی "ئینسـانی سـۆڤیەتی تـازە" بـوو(Tormey 1995: 169) . ئـەوەی پێـی وا بێـت ئـەم دوو سیسـتمە لـەوەدا سـەر کەوتـن، هەمـوو ئینسـانەکانی کۆمەڵگـەی ئەڵمانـی و سۆڤیەتی بۆ ئـەو دوو جۆرە ئینسـانە کورت بکەنـەوە، نـەک تەنهـا ئاگای لـە

مێژووی ئەو دوو کۆمەڵگەیە نییە، بەڵکوو لە مەحاڵبوونی ئەم دوو خەونە یۆتۆپییە ترسناکەش نەگەیشتووە. نە سۆڤیەتی سەردەمی ستالینیزم و نە ئەڵمانیای ڕۆژگاری نازیزم، نەیانتوانی ئینسانەکانی ئەو دوو کۆمەڵگەیە بکەن بە کۆپیی یەکتری و جیاوازییەکانیان بسڕنەوە."

هەیمەنەی سەرتاسەری" مانای ئەوە نییە کە ئایدیۆلۆژیای هێزە تۆتالیتارییەکان، کە هەمیشە تەماحی هەیمەنەی سەرتاسەرییان هەیە، لە ڕووی عەمەلییەوە توانیبێتیان شوێنی هەموو چالاکییەکی ئازادیی بیرکردنەوە و تێرامان و لێکدانەوە بگرنەوە. بێگومان گەر تیۆرەی تۆتالیتاریزم دابەزێنین بۆ ئاستێکی کاریکاتۆری و بەتاڵی کەینەوە لە هەر قووڵاییەکی فیکری، دەکرێت کۆمەڵگەی تۆتالیتاریی وەک ئەو شوێنە وێنا بکەین کە بەرگریی تیایدا مەحاڵە و عەقڵ و دەماغ و هەستی هەموو ئینسانەکانی ناوی شۆردراونەتەوە و هەموویان وا قورمیش کراون، وەک ئەوەی باوەڕیان بە یەک دید و بە یەک بۆچوون و بە یەک حیکایەت هەبێت، کە ئەویش حیکایەت و دید و بۆچوونەکانی دەوڵەتە. دەڵێم ئەم وێنەیە بۆ تۆتالیتاریزم، وێنەیەکی کاریکاتێرییە و پەیوەندیی بە ڕاستییەکان و پێدراوە سۆسیۆلۆژییەکانی کۆمەڵگەی تۆتالیتارییەوە نییە. ئەگەر لێکۆڵینەوە لە تۆتالیتاریزم بە شێوەیەکی زانستی و سیستماتیک لە کتێبەکەی هانا ئارێنتەوە دەستی پێ کردبێت، ئەوا ئەم کتێبە مەودایەک بۆ ئەوە ناهێڵێتەوە، کە کۆمەڵگەی تۆتالیتاری وەک کۆمەڵگەیەکی بێ جیاوازی وێنا بکەین. دەسەڵاتی تۆتالیتاری هەوڵی لەناوبردنی جیاوازی ئەدات، بەڵام ئەم هەوڵە مەحاڵە و ئەزموونێکی مێژوویی نادۆزینەوە، کە ئەم دۆخە بسەلمێنێت. هانا ئارێنت لە کتێبی "ڕەگوڕیشەکانی تۆتالیتاریزمدا، " دەیەوێت لە دوو خاڵی سەرەکی بدوێت. یەکەمیان ئەوەیە، تۆتالیتاریزم وەک دیاردەیەکی تازە و بێ نموونەی ناو مێژوو ببینین. دووهەمیان لەو خەیاڵ و وێنە کارەستئامێزە بکۆڵینەوە کە لە دونیای تۆتالیتاریزمدا

دروست دەبێت. ئارێنت پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە کتێبەکەی ئەو لە یەک کاتدا دژ بە گەشبینییەکی نابەرپرسیار و دژ بە ڕەشبینییەکی نابەرپرسیارە. بۆیە لە کاتێکدا وێنەی تەڵخ و تۆقێنەری ئەو کۆمەڵگەیە نیشان دەدات، لە هەمان کاتدا لە زیاد لە شوێنێکی ئەو کتێبەدا پێ لەسەر بیرۆکەی ئەوە دادەگرێ کە کۆمەڵگەی تۆتالیتاری تۆوی وێرانبوونی خۆی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە. واتە کۆمەڵگەی تۆتالیتاری وێنە دژ و جیاوازەکەی خۆی لە هەناوی خۆیدا ئامادەیە. کۆمەڵگەی تۆتالیتاری کۆمەڵگەیەک نییە هەموو شتە دژەکانی تری لەناو بردبێت و پانتاییەکی بۆ ناکۆکی و بۆ جیاوازبوون و بۆ لەویدیدنەچوون نەهێشتبێتەوە. هانا ئارێنت لە دیدێکی هیگڵییەوە کە گۆڕان و بەرهەمهێنانی جیاوازی وەک کارێکی حەتمی دەبینێت، دەنووسێت: "هەیمەنەی تۆتالیتاریستییانە لە هەناوی خۆیدا، هەڵگری میکرۆبی وێرانکردنی خۆیەتی".(Arendt 1976: 478)

لەوانەش بترازێت، هانا ئارێنت، لە هەمان کتێبدا چەمکی ئازادیی وەک ئەو توانا ناوەکییەی ئینسان وێنا دەکات، کە نەک هیچ هێزێک ناتوانێت لەناوی ببات، بەڵکوو ئازادیی بەردەوام "سەرەتای تازە" دێنێتە کایەوە، کە ئەگەری گۆڕانی تازە دەخاتەوە. ئارێنت لە کتێبی "ڕەگوڕیشەکانی تۆتالیتاریزمدا" بە ڕۆمانسیەتێکی زۆرەوە باس لەوە دەکات لەگەڵ لەدایکبوونی هەر مناڵێکدا "سەرەتایەکی تازە" لەدایک دەبێت و بەمەش ئازادیی خۆی تازە دەکاتەوە.(Arendt 1976: 479) ئەم پێداگرتنە لەسەر سەرەتای تازە و لەسەر تازەبوونەوە و لەسەر ئەگەری وێرانکاریی ناوەکی ناو هەناوی تۆتالیتاریزم خۆی، مانای ئەوەیە تۆتالیتاریزم ناتوانێت هەموو دەنگەکان و هەموو ویستەکان و هەموو ئیرادەکان و هەموو جیاوازییەکان بکات بە یەک و جیاوازییەکانیان بسڕێتەوە. ئەمەش مانای ئەوەی کۆمەڵگەی تۆتالیتاریزم کۆمەڵگەیەک نییە تەنها یەک دید و یەک چاوەڕوانی و یەک ویست و یەک هەقیقەت بیبات بەڕێوە.

لە ساڵە هەرە تاریکەکانی دەسەڵاتی بەعس لە عێراقدا، وەک دەسەڵاتێکی تۆتالیتاری، کۆمەڵگەی عێراقی کورت نەبووەوە بۆ یەک دید و یەک ویست و یەک چاوەڕوانی و یەک هەقیقەت. ئەوەی ڕۆمانی "ساڵی ١٩٨٤"ی جۆرج ئۆروێلی خوێندبێتەوە، تێدەگات تەنانەت لەو دونیا تۆتالیتارییەی ئۆروێلیشدا، کە لە واقیعدا دونیای وا لە هیچ ئەزموونێکی تۆتالیتاریدا نادۆزینەوە و ئەو دونیایەی ئۆروێل دروستی دەکات، دونیایەکی ئەدەبی و خەیاڵی تەریب بە دونیای واقیعە، نەک کۆپیی دونیایەکی واقیعی، دەڵێم تەنانەت لەناو ئەو دونیا ئۆروێلییەشدا چەندان دیدی جیاواز و تێگەیشتنی جیاواز بۆ هەقیقەت و زمان و جنس و ژیان هەیە و لە هەمووشی گرنگتر، بەرگری هەیە، ئەگەرچی ئەو بەرگرییە بە فەشەلیش کۆتایی پێ دێت (بڕوانە: مەریوان وریا قانیع ٢٠٠٦).

لەمەش بترازێت، لە هەموو مێژووی سۆسیۆلۆژیادا نووسەرێک نادۆزینەوە بڵێت کۆمەڵگەی بێ جیاوازی بوونی هەیە، تەنانەت لە کۆمەڵگە هەرە سەرەتاییەکاندا جیاوازی لە نێوان بەهێز و بێهێز، نێر و مێ، زیرەک و نازیرەک، پیر و گەنج، ئازا و ترسنۆکدا هەیە، ئەمە جگە لە جیاوازی لەنێوان ئەوانەی ڕاو دەکەن و ئەوانەی جووتیاری دەکەن، ئەوانەی کۆچەرن و ئەوانەی نیشتەجێن. هەریەکێکیش لەمانە، وێنەیەکی جیاوازیی خۆی و دونیا و هەقیقەتی هەیە و هەریەکێکیشیان ویست و ئارەزوو و خەونی جیاوازیی هەیە.

بە کورتی، هیچ کۆبوونەوەیەکی ئینسانی نییە جیاوازیی بەشێکی گرنگی ئەو کۆبوونەوەیە نەبێت. حیکمەتی ئەوەی کە دەکرێت کۆمەڵگەی بێ جیاوازی بوونی هەبێت، لە هیچ کتێبێکی فیکریدا نادۆزینەوە. کاک کۆشان تەنها بۆ ئەوەی بڵێ من لە قسەکردنمدا لەسەر کۆمەڵگە بە هەڵەدا چووم، بۆچوونێک دەر دەبڕێت، لە هیچ کتێبێکی ئەم دونیایەدا نەسەلمێندراوە و ناشسەلمێنرێت. وێناکردنی کۆمەڵگەی بێ جیاوازیی

وێناکردنێکی یۆتۆپییە و ڕەگەکانیشی دەگەڕێتەوە بۆ ناو فیکریی دینی خۆی. وێنەی کۆمەڵگەی بێ جیاوازیی، وێنەیەکی بەهەشتییە و لۆژیکی خەیاڵێکی بەهەشتی بەڕێوەی دەبات، نەک لۆژیکی کۆمەڵناسی، کە زانستی تێگەیشتنە لە کۆمەڵگە بە هەموو جیاوازییەکانیەوە.

## تێکەڵکردنی خوداناسی بە دین

لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا، باسم لە کێشەی جیانەکردنەوەی ژانرەکان لە یەکتری کرد، کە لە نووسینەکەی کاک کۆشاندا خۆی لە جیانەکردنەوەی ستوونی ڕۆژنامەگەری لە نووسینی ئەکادیمیدا دەبینێتەوە. لەم بەشەدا، لەسەر هەمان کێشە ئەدوێم و باس لە کێشەی جیانەکردنەوەی "خوداناسی" وەک ئەو زانستەی کە قسە لەسەر دین ئەکات، لە خودی دین ئەکەم، وەک دیاردەیەک کە وەحی ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینێت. لە ڕاستیدا جیانەکردنەوەی "خوداناسی" لە دین، ئەو هەڵە گەورەیەیە، کە لە نووسینەکەی کاک کۆشاندا ئامادەیە و سەرچەمی خراپخوێندنەوە و خراپلێکدانەوەکانی ئەو بۆ نووسینەکەی من، لەم هەڵەیەوە سەرچاوە دەگرن.

وەک سەرەتا، کاک کۆشان ڕاست دەکات من لە ستوونەکەمدا "خوداناسی"م لە بەرامبەر "کۆمەڵناسی"دا داناوە و داوای ئەوەشم کردووە لە خوداناسییەوە بپەڕینەوە بۆ کۆمەڵناسی. بەڵام پرسیاری سەرەکی ئەوەیە، ئایا دەستەواژەکانی "خوداناسی" و "کۆمەڵناسی" چی دەگەیەنن؟ ئایا گواستنەوە لە یەکەمیانەوە بۆ دووهەمیان چ مانایەکی هەیە و ئایا داواکاریی ئەنجامدانی ئەم گواستنەوەیە ڕووبەڕووی کێ کراوەتەوە؟ ڕووبەڕووی خوێنەری ئاسایی کراوەتەوە، یان ڕووبەڕووی ئەوانەی لەناو ڕۆشنبیریی کوردیدا فیکر بەرهەم دەهێنن؟ بۆ وەڵامدانەوەی

ئەم پرسیارانە، با لە سادەترین ئاستەوە دەست پێ بکەین، کە ئاستی زمانەوانی زاراوەکانە. هەموو کوردیزانێک دەزانێت پاشگری "ناسی" لە زمانی کوردیدا چووە سەر هەر ناوێک، دەیکات بە زانست. بۆ نموونە ئینسانناسی مانای ئەو زانستەی قسە لەسەر ئینسان دەکات، واتە ئەنترۆپۆلۆژیا، زەویناسی مانای ئەو زانستەی قسە لەسەر زەوی دەکات، واتە جیۆلۆجیا، ئەستێرەناسی، مانای ئەو زانستەی لەسەر ئەستێرەکان قسە دەکات، واتە زانستی فەلەک. ئەی خوداناسی چییە؟ بێگومان وەڵامەکەی ئاشکرایە، خوداناسی ئەو زانستەیە، کە قسە لەسەر خودا دەکات، واتە تیۆلۆژیا کە لە ئیسلامدا بەرامبەر بە "علیمی کەلام"ە. لێرەوە ئەوەی من لە ستوونەکەمدا داوای دەکەم، بریتییە لە پەڕینەوە لە تیۆلۆژیا، یان عیلمی کەلامەوە، بۆ سۆسۆلۆژیا، واتە بۆ کۆمەڵناسی. ئەمەش داواکارییەکە بە هیچ جۆرێک پەیوەندیی نییە بە پەڕینەوە لە دینداریەوە بۆ بێدینی، پەیوەندیی نییە بە بێنرخکردن یان بەنرخکردنی دینەوە، داواکردن نییە لە خوێنەران واز لە دینی خۆیان بهێنن و ببن بە کەسانی بێدین، داوا لە کەس نەکراوە لەنێوان کۆمەڵگە و دیندا یەکێکیان هەڵبژێرێت، باسیش لەوە نەکراوە کە ناکرێت کۆمەڵگە و دین بە یەکەوە بگونجێن. ئەم جۆرە لێکدانەوەیە بۆ نووسینەکەی من، لە خراپحاڵیبوونێکی گەورەوە هاتووە. ئەو داوایەی ستوونەکەی من دەیکات، داوایەکی مەعریفییە و خوازیاری ئەوەیە گۆڕانێکی مەعریفی لە خوێندنەوەی دیاردە دینییەکاندا بێتە کایەوە. ئەو داوایە، داوایەکە بۆ هەوڵدان بۆ بەرهەمهێنانی شێوازێک لە مەعریفە، کە بە شێوەیەکی زانستییانەتر قسە لەسەر دین بکات، جیاواز لەوەی تیۆلۆژیا یان عیلمی کەلام، لە ناوەندی ڕۆشنبیریی ئێمەدا دەیکات. واتە مەسەلەکە پەیوەندیی بە خودی دین خۆیەوە نییە، باس لە باوەڕ و ئیمان و دینداری ناکات، بەڵکوو باس لە گۆڕینی ئەو زانست و عەقڵیەتە مەعریفییە دەکات، کە لەسەر دین قسە دەکات.

وەک لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا ئاماژەم پێ دا، من لە ڕۆژنامەی (ئاوێنە)دا ستوون دەنووسم، نەک نووسینی ئەکادیمی، بۆیە هەردوو دەستەواژەی خوداناسی و کۆمەڵناسی بە مانا ئەکادیمییەکانیان بەکار نەهاتوون، بەڵکوو هێما بۆ دوو جۆر لە عەقڵیەتی مەعریفی جیاواز و ناکۆک دەکەن. ستوونەکە باس لە پێداویستی پەڕینەوە لە عەقڵیەتێکی کەلامییەوە بۆ عەقڵیەتێکی سۆسیۆلۆژی، لە زیهنیەتێکی ڕۆشنبیری و مەعریفیی تەقلیدییەوە بۆ زیهنیەتێکی زانستی هاوچەرخ دەکات. ئەم داوایەش، بە هیچ مانایەک، داوایەک نییە ڕووبەڕووی خوێنەری ئاسایی کرابێتەوە، لە ئەساسیشدا ڕووی نووسینەکە لە خوێنەری ئاسایی نییە، بەڵکوو ڕووی لەوانەیە لەو ناوەندە ڕۆشنبیرییەدا فیکر بەرهەم دەهێنن، بەتایبەتی فیکری دینی و ئەو فیکرەش کە لەسەر دین قسە دەکات. کارێکی بێمانا و ناماقووڵە نووسەرێک داوا لە خوێنەری ئاسایی بکات، ببێت بە کۆمەڵناس، یان خوداناس، واتە ببێت بە زانای قسەکردن لەسەر کۆمەڵگە و لەسەر دین. خوێنەری ئاسایی هەر لە سەرەتاوە لە هاوکێشەکە کراوەتە دەرەوە. ڕووی دەمی ستوونەکەی من لە کەسانی وەک کاک کۆشان و هاوڕێکانیەتی، کە تا ئێستاش لە دیدێکی کەلامییەوە لە دین ئەدوێن و هەموو ناکەلامیش وەک بێنرخکردن و سووککردنی دین دەنرخێنن. بەکورتی، پەڕینەوە لە عیلمی کەلامەوە بۆ سۆسۆلۆژیا لە ستوونەکەی مندا، مانای پەڕینەوەیە لە عەقڵیەت و خەیاڵێکی ڕۆشنبیریی تەقلیدییەوە بۆ عەقڵیەت و خەیاڵێکی زانستی، کە بتوانێت دیاردەکانی دونیای ئێمە بە شێوەیەکی زانستییانەتر لێک بداتەوە و بخوێنێتەوە.

بێگومان ئەم داواکارییە لەناو کایەی دین خۆیدا، مانای ڕزگارکردنی دین لەدەستی ئەو نوخبە دینییە تەقلیدییەی کە تا ئەمڕۆش بە هەمان ئەو عەقڵیەت و میتۆد و گریمانە تەقلیدییانە لە دین دەڕوانن، کە چوارچێوەکانی عیلمی کەلامی تەقلیدی تێناپەڕێنێت، عەقڵیەتێک دوور لە سۆسۆلۆژیا و

سـایکۆلۆژیا و ئەنترۆپۆلۆژیـای دینـی هاوچـەرخ. خوداناسـی دیاردەیەکـی ئاسـمانی نییـە و ئـەو مەعریفەیەشـی بەرهەمـی دەهێنێـت، مەعریفەیەکـی موقـەدەس نییـە، خوداناسـی زانسـتێکی ئینسـانییە و هەرکـەس بیەوێـت دەتوانێـت وەک زانسـتێکی دینـی تەقلیـدی لـە حـەوزە و مزگـەوت و فێرگـە دینییەکاندا فێری ببێت. ئـەوەی لای خوێنـەر مایـەی سەرسوورمانە، ئەوەیـە کاک کۆشـان بازی بەسـەر ئـەم جیاکردنـەوە سادەیەدا داوە و خوداناسـی بـە دین، یان بـە دینداری یەکسـان کردووە و بەمـەش نـەک تەنها مەبەستەکەی منی بەتـەواوی شـێواندووە، بەڵکوو هەمـوو ستوونەکەمی بـە ئاڕاستەیەکی ناڕاسـتدا بـردووە. وەک پێشـتریش وتـم، بیرۆکـەی سـەرەکیی سـتوونەکەی مـن، لەسـەر جیاکردنـەوەی تیۆلۆژیـا لـە سۆسـۆلۆژیا وەک دوو زانسـت دروسـت بـووە و مـن دەمەوێـت بڵێم وشـیاریی مەعریفـی ئێمـە پێویستی بەوەیـە لـە وشـیارییەکی تیۆلۆژییـەوە ببێت بـە وشـیارییەکی سۆسـۆلۆژی، کەچی کاک کۆشـان ئـەو داوایـە وەک گواستنەوە لـە دینداریيەوە بۆ بێدینی یان کەمنرخکردن و سڕینەوەی دین تێگەیشتووە. گـەر کاک کۆشـان ئامادە بووایـە "عیلمی کـەلام" لـە "دین" جیـا بکاتـەوە، بەئاسـانی بۆی دەر ئەکـەوت ستوونەکەی مـن باس لـەوە ناکات دین نەمێنێت، یان نرخـی بۆ دانەنرێت، یان کۆمەڵناسـی شـوێنی بگرێتـەوە. لـە ڕاستیشـدا هـەر داوایەکـی لـەو بابەتـە خۆبەهەڵەدابردنێکـی گـەورەیـە، لـە هیـچ شـوێنێکی دونیـادا کۆمەڵناسـی شـوێنی دینـی نەگرتووەتـەوە تـا ئینسـان لـە کوردسـتاندا داوای لـەو جـۆرە بێنێتـە پێشـەوە. خـودی ئـەم جـۆرە بەرخوردکردنـە، مانـای تێنەگەیشـتنە لـە کۆمەڵناسـی وەک زانسـت و لـە دین وەک دیاردەیەکـی فەرهەنگـی و ڕەمزی و ڕۆحـی. ئەمـەش تێکەڵکردنـی دوو شـتە بـە یەکدی کـە تێکـەڵ ناکرێن. بـەڵام ئەگـەر کۆمەڵناسـی نەتوانێت شـوێنی دین بگرێتـەوە، ئـەوا بێگومـان دەتوانێت لـە زۆر ئاسـتدا شـوێنی عیلمی کـەلام یان تیۆلۆژیا بگرێتـەوە، یان لانـی کـەم وا بـکات تیۆلۆژیـا بـە چەمـک و میتـۆد و عەقڵیەتـی کۆمەڵناسـی کار بـکات و

بەشێوەیەکی ڕادیکاڵ خۆی تازە بکاتەوە. بێگومان تێکەڵنەکردنی دین و عیلمی کەلام بە یەکتری، مانای ئەوە نییە کە نابێت دین ڕەخنە بکرێت. ڕەخنەکردنی دین، بەشێکە لە بەرهەمهێنانی دین خۆی، دینێک جیاواز لەو دینە تووڕە و دۆگمایی و داخراوەی ئەمڕۆ هێزە سەلەفی و دۆگماییەکان لە دونیای ئێمەدا بەرهەمی دەهێنن. لۆژیکی ئەم هێزە دینییانە، بە پەرگیر و میانڕەوییانەوە، لەو خاڵەدا یەکە کە گوایە ئەو بڕ و ڕادەی ئەو ئیسلامەی ئەمڕۆ لە کۆمەڵگەدا هەیە، بەس نییە، بەڵکوو پێویستە لە دەرەوەدا، لەڕێگەی حزب و گروپ و خوێندەوارە دینییەکانەوە، دینی زیاتر بە کۆمەڵگە بدرێت، بە ڕادەیەک، دین بکرێت بە بنەمای ئەخلاق، بنەمای سیاسەت، بنەمای یاسا، بنەمای خوێندن و فێربوون هتد... بە جۆرێک، ئینسان بە هەر لایەکدا ڕوانی، ڕووی بە ڕووی دینا بتەقێتەوە. کێشەکەش لەوەدایە ئەو دینەی لەپاڵ ئەو عەقلیەتە کەلامییەدا بەرهەم دێت و بەرهەم هاتووە، دینێکی دۆگمایی و چەپێنەرە، دینێکە لە دونیای ئێمەدا فشارێکی دەروونی پڕوکێنەری لەسەر کۆمەڵگە و تاکەکەس داناوە.

لەم گۆشەنیگایەوە، ڕەخنە لە دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، بۆ بازدان نییە بەسەر دیندا، بۆ بێنرخکردن و سڕینەوە و بێبایەخکردنی دین نییە، بەڵکوو بۆ موتوربەکردنی دینە بە تێگەیشتنێکی کراوە و موتوربەکراو بە ڕۆحی لێبووردن و قبوڵکردنی جیاوازی. دین بەم ئاراستەیدا کار بکات نەک لاواز نابێت، بەڵکوو بەهێزتر دەبێت و ڕۆڵی لە دارشتنی دونیای ناوەکی ئینسانەکاندا گەورەتر و قووڵتر دەبێت. ترس لە لاوازبوونی دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ترسێکی سایکۆلۆژییە و هەندێک جار لە دۆخی عوسابێکی دەستەجەمعی و لە فۆبیا نزیک دەبێتەوە. سەیر لەوەدایە دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەرگیز بە ڕادەی ئەمڕۆ بەهێز و ئامادە نەبووە. بڕێکی زۆری ئەو دینەش کە هەیە، دینێکی نادۆستە لەگەڵ ئینسان و ئازادی و ژیاندا. کێشەکە لەوەدایە، وازهێنان لە دین بەو

شێوەیەی لەمرۆدا بەرهەم دەهێنرێت، ژیانی ئینسانی ئێمە ناهەموار دەکات، دەوڵەمەندی ناکات، ڕۆحانیەتی لێ دەسێنێت، ڕۆحانیەتی ناداتێ، ئازادییەکانی دەچەپێنێت، ئازادی ناکات، دەیکات بە بوونەوەرێکی بێئیرادە و ترساو، نایکاتە بوونەوەرێکی چالاکی ناو دونیا. ئەمەیە وا دەکات من تەواو باوەڕم بەوە هەبێت، یەکێک لە ئەرکە گرنگەکانی ڕۆشنبیران لە کوردستاندا ئەوەیە چیدی دین بەجێ نەهێڵن بۆ ئەو نوخبە دینییەی کە تێگەیشتنیان بۆ دین، تێگەیشتنێکی دۆگمایی و تەقلیدییە و سنووری پێدراوەکانی عیلمی کەلام تێناپەڕێنێت. کاتی ئەوە هاتووە هێز و ڕۆشنبیرە دیموکراس و کراوە و عەلمانی و ناعەلمانییەکان، دین بە موڵکی خۆیان بزانن و بیکەنە یەکێک لە بابەتە سەرەکییەکانی خوێندنەوە و شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی زانستییانە.

بەکورتی، ئەوەی من لەو ستوونەدا داوای دەکەم، ئەوەیە دین و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بە عەقڵیەتێکی کەلامییەوە نەخوێنینەوە، لەو سەرەتا و پرسیار و گریمانانەوە دەست پێ نەکەین کە عیلمی کەلامی تەقلیدی کاریان پێ دەکات. بەڵکوو بەپێچەوانەوە لە سۆسۆلۆژیاوە وەک زانستێکی هاوچەرخ دەست پێ بکەین، بەتایبەتی لەو دیدە میتۆدییەوە، کە پیتەر بێرگەر ناوی دەنێت "بێ خوداییەکی میتۆدی." ئەوە تەنها لەنێو ڕۆشنبیرییەکی وەک ڕۆشنبیریی ئێمەدا دەکرێت ئینسان هەڵەی گەورەی وەک یەکسانکردنی عیلمی کەلام بە دین ئەنجام بدات و داواکردنی گواستنەوەی قسەکردن لەسەر دین لە عیلمی کەلامەوە بۆ کۆمەڵناسی وەک هێرشکردنە سەر دین و کەمنرخاندنی لێک بداتەوە. بۆ ئەوەی ئەو داوایەی من لە ستوونەکەمدا کردوومە، باشتر بۆ خوێنەر و بۆ کاک کۆشانیش ڕوون ببێتەوە، دەمەوێت زۆر بەکورتی جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان عیلمی کەلام و سۆسۆلۆژیا لێک بدەمەوە. هیوادارم بە نیشاندانی ئەو جیاوازییانە مەبەستەکانی من باشتر و ڕوونتر دەر بکەون.

## تیۆلۆژیا یان عیلمی کەلام چییە؟

عیلمی کەلام، بەو زانستە دەگوترێت، کە دەربارەی عەقیدە یان باوەڕە دینییەکان دەدوێت، دەخوازێت ئەو باوەڕانە هەم لێک بداتەوە، هەم ڕاستبوونیان بسەلمێنێت. هەروەها عیلمی کەلام، دەیەوێت لە ڕێگەی وەلامدانەوەی هەموو ئەوانەشەوە کە گومانیان بەرامبەر بە دین هەیە و ڕەخنەی لێ دەگرن و پێی ناڕازین، بەرگری لە دین بکات و بیپارێزێت. کەواتە عیلمی کەلام ئەو عیلمەیە کە بابەتەکەی باوەڕە دینییەکانە و ئامانجیشی لێکدانەوە و سەلماندن و بەرگریکردنە لەو باوەڕە دینیانە، بڕوانە (ڕەزا برنجکار ل ١٢-١٣-١٤).

بەلام ئەو باوەڕە دینیانە چین کە عیلمی کەلام لێکیان ئەداتەوە و ئەیانسەلمێنێت و بەرگرییان لێ دەکات؟ بە شێوەیەکی گشتی، ئەو باوەڕانە بریتین لە مەسەلەی تەوحید، واتە یەکخودایی، مەسەلەی جەبر و ئیختیار، قەزاوقەدەر، سزا و پاداشت، باشە و خراپە، کوفر و ئیمان، مەسەلەی پێغەمبەرایەتی و مەسەلەی ئیمامەت... هتد. بەم مانایە، عیلمی کەلام، زانستی ناسینی دینە لەناو دونیابینیی دین خۆیەوە، واتە قسەکردنێکی دینییانەیە لەسەر دین. ئەمەش جیای دەکاتەوە لەوەی پێی دەگوترێت ئیلاهیات، لانی کەم لە ڕەوتی فیکر لە ئیسلامدا، چونکە ئیلاهیات لە ئیسلامدا بەشێکە لە فەلسەفە، لە کاتێکدا عیلمی کەلام بەشێک نییە لە فەلسەفە، بەڵکوو زانستێکی دینیی سەربەخۆیە و لە زۆر قۆناغدا لە پەیوەندییەکی هێجگار ناکۆک و سەخت و دژایەتیکەردا بووە لەگەڵ فەلسەفەدا.

عیلمی کەلام بە شێوەیەکی گشتی پرسیارگەلی لەم بابەتە دەکات: تێکستە دینییە پیرۆزەکان، بۆ نموونە قورئان یان ئینجیل، چییان تێدایە؟

دینەکانی دی چی دەڵێن؟ مێژووی دین و مێژووی ئینسان کەی و چۆن دەست پێ دەکات؟ چۆن تێکستە دینییەکان لێک بدرێنەوە؟ چی دەتوانرێت لێک بدرێتەوە چیش حوکمی قەتعییە و ناتوانرێت لێک بدرێتەوە؟ ئایا خودا تەنها خێر و لێبووردن و خۆشەویستییە؟ یاخود ڕق و جەنگ و خراپەشی لێ دەوەشێتەوە؟ چۆن بوونی خودا دەسەلمێنرێت؟ مەلائیکە چییە؟ ئایا هەن یان نین؟ دەرەجەکانیان چۆنە؟ ئایا ئینسان بوونەوەرێکی پاڵپێوەنراوی بێئیرادەیە یاخود کەسێکە توانای هەڵبژاردنی ئازادیی هەیە؟ قیامەت چییە؟ چۆن ڕوو دەدات؟ ئینسان چۆن ڕزگاری دەبێت؟ گوناه و کوفر چین؟ خودا چی پێ خۆشە و چی پێ ناخۆشە؟ سیفەتەکان و سروشت و تواناکانی خودا چین؟ چی دەشێت خودا ڕازی بکات و چیش وای لێ دەکات تووڕە ببێت و وا بکات ئینسان سزا بدات؟ ئەمانە و پرسیارگەلێکی زۆری دیکەی لەم باباتە، ئەو پرسیارە سەرەکییانەن کە عیلمی کەلام دەیانکات.

ئەوانەی مێژووی عیلمی کەلامیان وەک زانست نووسیوەتەوە، دروستبوونی ئەم عیلمە وەک زانستێکی سەربەخۆ دەبەنەوە بۆ سەردەمی عەباسییەکان. لەو سەردەمەدا ئیسلام وەک دینێکی تازە دەکەوێتە ژینگەیەکی دینی و فەرهەنگیی نوێوە، کە تیایدا کۆمەڵێک بیروباوەڕی تێدایە جیاواز لەوەی موسڵمانەکان تا ئەو کاتە زانیویانە و پێی ئاشنا بوون. بەتایبەتی خوداناسیی مەسیحیەت و دینی جوولەکە و مانیزم و بیروبۆچوونی گاڵتەئامێزی زەندیقەکان دەربارەی دین. ئاشنابوون بەم ناوەندە نوێیە و ئامادەگی لەناویدا، ئیسلام ناچار دەکات وەڵامی ئەو پرسیار و ئەرگومێنت و بۆچوونانە بداتەوە کە لە بوون و ئامادەگیی ئەم دین و کەلەپوور و بۆچوونە نەناسراوانەوە دروست دەبوون. لەم ئاستەدا پەیدابوونی عیلمی کەلام وەک زانست، پەیوەندیی بە پێداویستی وەڵامدانەوەی تەحەدا فیکری و دینی و کولتوورییەکانی ئەو دینانەوە

هەبووە کە ئیسلام لە سەردەمی عەباسییەکاندا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە (Lezeenberg 2008: 78-79). ترسیش لەوەی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی ئەم دینە جیاوازانە لەناو موسڵمانانندا کارێک بکات، موسڵمانان دینەکەی خۆیان لەبیر بچێتەوە، هۆکارێکی گرنگی گەشەکردنی عیلمی کەلام بووە.

هۆکارێکی تری گەشەکردن و بەرفراوانبوونی عیلمی کەلام لە مێژووی ئیسلامدا، وەرگێڕانی تێکستە فەلسەفییەکانی یۆنانە بۆ عەرەبی. فەلسەفە وەک شێوازێکی جیاوازی بیرکردنەوە لە دین، کۆمەڵێک مەسەلەی هێنایە کایەوە کە لە دیدی دینییەوە گەر وەک گوناه و کوفریش نەبینرایە، کە بەشێکی زۆریان وا دەبینران، ئەوا وەک بیدعە و نەشیاو و نەکراو مامەڵە دەکران. وەڵامدانەوە و هێرشکردنی عیلمی کەلام بۆ سەر فەلسەفە، یەکێکە لە پێکهاتە سەرەکییەکانی مێژووی عیلمی کەلام لە ئیسلامدا. ئەم هێرشانە لەسەر دەستی ئیمامی غەزالیدا دەگاتە چڵەپۆپە و ناکۆکی نێوان عیلمی کەلام و فەلسەفە لە غەزالی بەدواوە دەگاتە ئاستی دابڕانێکی تەواوەتی. ئەوەشی وای کردووە شارستانیەتی ئیسلام، وەک محەمەد عابد جابری دەڵێت، شارسستانیەتی فەلسەفە نەبێت، بەڵکوو شارستانیەتی فیقە بێت، ئەم هێرشە بەرفراوانەی عیلمی کەلام و زانستە دینییەکانی ترە بۆ سەر فەلسەفە(بڕوانە الجابری ١٩٩١: ل٩٦).

عیلمی کەلام وەک زانست کۆمەڵێک ئامانجی هەیە، لە هەموویان گرنگتر، گەیشتن بە یەقینی تەواوە لە ئیماندا، پیشاندانی ڕێگەی ڕاستەقینەیە بە موسڵمانان و پاراستنی پایەکانی دین لە شوبهە و گومانە، ئەمە جگە لە لێپرسینەوە و مەحکومکردنی ئەوانەی دژایەتی دین ئەکەن(ڕەزا برنجکار ل ١٢-١٣-١٤).

بەکورتی، عیلمی کەلام عیلمی شیکردنەوەی دینییانەی ئیمان و بەرگریکردنە لە دین. ئەم عیلمە بە ڕادەیەکی گەورە قسەلەسەر دونیایەک دەکات کە پێکهاتە سەرەکییەکانی دەکەونە دەرەوەی دونیای بەرچاو و

ئامادەوە. هەم خوداوەند و هەم مەلائیکە و هەم شەیتان و هەم بەهەشت و جەهەنەم... هتد. هەموویان سەر بە دونیایەکن، لە دەرەوەی دونیای ئێستادا. بە مانایەک لە ماناکان، عیلمی کەلام ئەو زانستە دینییە کە ڕێگەی تێپەڕینمان لەم دونیایەوە بۆ دونیاکەی دی نیشان دەدات. پێمان دەڵێت ئەو دونیایەی دی لە چی دروست بووە، هێزەکانی کامانەن، دەرەجەکانی چین، چی بکەین بۆ ئەوەی بچینە بەشە باشەکەی و خۆمان لە بەشە خراپەکەی بپارێزین و چی بکەین بۆ ئەوەی خودای ناو ئەو دونیایەی دیکە ڕازی بکەین.

لەم زانستە کەلامییەدا، کۆمەڵگە و سروشت و دیاردەکانی ناویان کۆمەڵێک شتن دەمانبەنەوە سەر توانا و گەورەیی خودا، کۆمەڵێک دەر کەوتن، کە زانیارییەکی گشتیمان لەسەر بوونی خودا پێ دەبەخشن، نەک لەسەر خۆیان وەک کۆمەڵێک دیاردەی سەربەخۆ. لە عیلمی کەلامدا، کۆمەڵگە و ئینسان و سروشت تەنها لەوێدا مانایان هەیە، کە هێما بۆ بوونی خودا بکەن، ئەوە بەبیر ئینسان بهێننەوە، کە خودا دروستی کردوون و بوون و نەبوونیشیان پەیوەستە بە ئیرادەی ئەوەوە. قسەکردنی عیلمی کەلام لەسەر دین، قسەکردنێکی دینییە، بە لۆژیکی پاساوهێنانەوە بۆ دین و بەرگریلێکردنێکی ڕەها لە دین کار دەکات. عیلمی کەلام چونکە ئامانجی سەرەکیی پاراستنی دینە، هەرشتێک لەگەڵ دیندا یەک نەگرێتەوە، بە ناڕاست دەزانێت. ئەم چوارچێوە فیکرییە وا دەکات ئەم زانستە دینییە وەک ڕێگرێک لە بەردەم گەشەکردنی زانستە ئینسانییەکاندا کار بکات و سنوورێک بۆ بیرکردنەوە دابنێت، بەجۆرێک هیچ شێوازێکی مەعریفە بۆینەبێت ببڕێت و بڕینی ئەو سنوورانەش وەک بێدینی، یان پەلاماردان و دەستدرێژیکردنە سەر دین مامەڵە بکات. ڕەنگە هێماکردن بە کتێبەکەی جەمالەدینی ئەفغانی (وەڵامدانەوەی دەهرییەکان) نموونەیەکی باشی عیلمی کەلامی تازە بێت، لە بەرامبەر ئەو شێوازی

بیرکردنـەوە تازانـەدا، کـە سـنوورەکانی عیلمـی کـەلام دەبەزێنـن. لـەو کتێبەشـدا ئەفغانـی وەڵامدانەوەیەکـی هێرشـئامێز بـە کەسـانێک ئەداتـەوە کـە لـە دەرەوەی عیلمـی کەلامـدا بیـر دەکەنـەوە و دەنووسـن، کـە لـەزۆر ڕووەوە هەمـان ئـەو وەڵامدانـەوە هێرشـئامێزەی ئیمامـی غەزالـی وەبیـری خوێنـەر دەهێنێتـەوە، کـە بەرامبـەر بـە فەلسـەفە ئەنجامـی دا، ئەگـەر ئەمـەی باسـم کـرد، زۆر بەکورتـی ڕووبـەری کارکـردن و ماناکانـی عیلمـی کـەلام بێـت، ئێسـتا بـا سـەرنجێک لـە سۆسـۆلۆژیا بدەیـن و بزانیـن ئـەو چ جـۆرە زانسـتێکە.

## سۆسۆلۆژیا چییە؟

بابەتـی سـەرەکیی سۆسـۆلۆژیا، کۆمەڵگەیـە، ئـەو زانسـتەیە کـە هاریکاریمـان دەکات بـۆ ئـەوەی لـە کۆمەڵگـە و دیـاردە کۆمەڵایەتییـەکان تێبگەیـن. سۆسـۆلۆژیا ڕەگوڕیشـە کۆمەڵایەتییەکانـی هەڵسـوکەوتی تاکەکـەس و گرووپـەکان لێـک دەداتـەوە و بیرکردنەوەیـان بـەو هەلومەرجـە تایبەتـەوە گرێ ئـەدات کـە تێیـدا ئامـادەن و دەژیـن. دیاردەکانـی وەک چینـە کۆمەڵایەتییـەکان، ژیانـی شـار و ژیانـی لادێ، کارکـردن لـە کۆمەڵگەیەکـی پیەشەسـازی و بیرۆکراتیـدا و جیاوازیـی لەگـەڵ کارکـردن لـە کۆمەڵگەیەکـی کشـتوکاڵیدا، گۆڕانەکانـی خێـزان، پەیدابـوون و بزربوونـی کولتـوور و ڕەمـز و ماناکان، جۆرەکانـی تاوانـی کۆمەڵایەتـی و ڕەگوڕیشـە کۆمەڵایەتـی و کولتـووری و دینییەکانـی تـاوان، ئەمانـە و دەیـان بابەتـی دیکـەی لـەم باباتـە، تێمـای سـەرەکیی زانسـتی سۆسـۆلۆژیان. سـەرەکیترین سیفەتێک، سۆسـۆلۆژیا بـە کۆمەڵگـەی ئـەدات، گۆڕانـە؛ سۆسـۆلۆژیا کۆمەڵگـە وەک گشـتێکی ئاڵـۆز و پڕ ناکۆکـی و قابیلـی گـۆڕان دەبینێـت. جگـە لەوانـە، سۆسـۆلۆژیا زیاتـر پـێ لەسـەر بینینـی جیاوازییـەکان دادەگرێـت، بـۆ نموونـە جیاوازییەکـی گـەورە

لەنێوان کۆمەڵگەکانـدا دەبینێت، کوردسـتان وەک هۆڵەنـدا و خـواروی عێـراق وەک نیویـۆرک و بەغـداد وەک پاریـس مامەڵـە نـاکات. خـودی کوردسـتان خۆی و خـودی خواروی عێراق و خـودی نیویۆرکی ئەمڕۆش خۆیـان، وەک کوردسـتان و خـوارووی عێـراق و نیویۆرکـی سـی سـاڵ لەمەوپێش نابینێت. لەنـاو هەریەکێکیـش لـەو شـوێنانەدا هێـزی جیـاواز و خەونـی جیـاواز و چاوەڕوانیـی جیـاواز دەدۆزێتـەوە. بۆیـە سۆسـۆلۆژیا وەک زانسـت پێویسـتی بـە عەقڵیەتێـک هەیـە گۆڕانکارییـەکان ببینێت، ئاڵۆزییـەکان ببینێت، جیاوازییـەکان دەستنیشـان بکات، لـەوە تێبگات ئەوەی ئەمـڕۆ باڵادەسـتە، دەکرێت سـبەینێ باڵادەست نەبێت، یـان هـەر نەمێنێت و بسـڕێتەوە. سۆسـۆلۆژیا ئـەو زانسـتەیە کـە لەگـەڵ ئـەم گۆڕانانـەدا دەژی و خۆشـی هێزێکـی گرنگـە بـۆ بەرهەمهێنانـی وشـیارییەک، جیـاوازی و گـۆڕان، پێکهێنـەرە سـەرەکییەکانی بـن. جگـە لەمانـە، سۆسـۆلۆژیا خۆشـی لەگـەڵ گۆڕانـی کۆمەڵگـەدا گۆڕانـی بەسـەردا دێت، گۆڕانـی دیاردەکان دەبنە هـۆی گۆڕانـی ئـەو وشـیارییە سۆسـۆلۆژییەی لەگـەڵ دیاردەکانـدا مامەڵـە دەکات. بۆیـە سۆسـۆلۆژیای ئەمـڕۆ، سۆسـۆلۆژیای پەنجـا سـاڵ لەمەوبـەر نییـە، سۆسـۆلۆژیای دوای پەنجـا سـاڵیش، وەک سۆسـۆلۆژیای ئەمـڕۆ نابێت. هەمـوو ئەمانـە وا دەکـەن دۆزینـەوەکان و هەقیقەتەکانـی زانسـتی سۆسۆلۆژیا ئەبـەدی نەبن، بەڵکوو کاتی بن، قابیلی گـۆڕان و پێداچوونـەوە و دەسـکاریکردن بـن. ئەمـەش بـە شـێوەیەکی ڕادیـکاڵ لـە تیۆلۆژیـای جیـا دەکاتـەوە. بیروبۆچوونـە سۆسـۆلۆژییەکانی ئـەم سـەدەیە، دەشـێت لـە سـەدەی داهاتـوودا ببـن بـە حیکایـەت، بـەڵام ئـەوەی تیۆلۆژیـا لەسـەر خـودا و مەلائیکـە و بەهەشـت و جەهەنـەم دەیڵێت، بەدەگمـەن نەبێت، ناگۆڕێت. کـەم خودانـاس هـەن بوێـرن، یـان بتوانـن بـەوەی خوداناسـانی سـەرەتای ئیسـلام لەسـەر خودایان گوتـووە، بڵێن لـە پلـەی حیکایەتدایـە و ڕاست نییە.

پێویسـتە خوێنـەر لـەوە ئـاگادار بێـت ئـەوەی مـن لێـرەدا لەسـەر

سۆسیۆلۆژیا و تیۆلۆژیا ئەیڵێم، قسەکردنە لەسەر ئەو دوو زانستە وەک دوو "نمونەی ئایدیالی،" بەو مانایەی ماکس ڤیبەر بە "نموونەی ئایدیال" ی ئەدات. وێنەکانی ئەم دوو زانستە لە واقیعدا لەم جیاکارییەی من لێرەدا نیشانم دا، ئاڵۆزترن، بەڵام ئەم جیاکارییەش پێویستە بۆ نیشاندانی جیاوازییە بنەڕەتییەکانی نێوان ئەو دوو زانستە لەگەڵ یەکدا. بۆ ئەوەی زیاتر جیاوازی نێوان سۆسیۆلۆژیا و تیۆلۆژیا بۆ خوێنەر ڕوون بکەمەوە، بەباشی دەزانم زۆر بەکورتی لەسەر ئەو بەشەی سۆسیۆلۆژیا قسە بکەم کە بابەتی شیکردنەوە و خوێندنەوەکانی خودی دین خۆیەتی. مەبەستم لەوەش سۆسیۆلۆژیای ئایینە.

## سۆسیۆلۆژیای ئایین

یەکێک لە لقە گرنگەکانی زانستی سۆسیۆلۆژیا، بریتییە لە سۆسیۆلۆژیای ئایین. ئەم بەشەی سۆسیۆلۆژیا، بە پێچەوانەی تیۆلۆژیاوە، لە لێکدانەوە و خوێندنەوە و شیکردنەوەی "باوەڕ" یان "ئیمان"ـە وە دەگوازێتەوە بۆ لێکدانەوەی شێوازەکانی ئامادەبوونی دین لە کۆمەڵگەدا، لەنێو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و لەنێو پەیوەندییەکانی دەسەڵات و پەیوەندییەکانی ماناد‌ا. بە زمانێکی سادەتر بدوێین، سۆسیۆلۆژیای دین باس لە دەزگا و هێز و گروپ و تاکەکەسە دینییەکان دەکات، نەک لە ڕاستی و دروستیی باوەڕ و ئیمانیان. سۆسیۆلۆژیای دین، دین وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی مامەڵە دەکات، باس لەوە دەکات چۆن ڕۆڵ دەبینێت لە هێشتنەوەی گروپەکان و بەیەکەوەگرێدانی بەشە جیاوازەکانیان، لەوە ئەدوێت، چۆن دەکرێت ببێتە هۆکارێک بۆ دروستبوونی ئارامی و ئاسایش و هارمۆنیەتی کۆمەڵایەتی، بەڵام باس لەوەش دەکات، چۆن دین دەتوانێت کۆمەڵگە دابەش بکات بۆ هێزی ناکۆک و ناچیز و ناتەبا و چۆن دەتوانێت پشێوی و توندوتیژی

و جەنگ بەرهەم بهێنێت. بەکورتی پرسیاری سۆسیۆلۆژیا لە دین، بە پێچەوانەی عیلمی کەلامەوە، پرسیار نییە دەربارەی ڕاستی و دروستیی باوەڕ و ئیمانی دینی، بەڵکوو پرسیارە لەسەر دەرکەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕەمزییەکانی دین و شێوازە جیاوازەکانی بەکارهێنان و بەگەڕخستنی لە کۆمەڵگەدا. دیدی سۆسیۆلۆژیانە بۆ دین لەوێوە دەست پێ ناکات، کە هەوڵی گۆڕانی قەناعەتە دینییەکانی خەڵک بدات، یان وەک تیۆلۆژیا بەگژ هەندێک قەناعەتدا بچێتەوە و چەپڵەش بۆ هەندێک قەناعەتی تر لێ بدات، هەندێک شت بە حەلال و هەندێک شت بە حەرام دابنێت. سۆسیۆلۆژیا دەیەوێت، بۆ نموونە، ئەو چاوەڕوانیانە بناسێت، کە ئینسانە دینییەکان هەیانە لە چۆنیەتی جێبوونەوەی قەناعەتە دینییەکانیان لەناو ژیانی گشتیی کۆمەڵگەدا. دەیەوێت بزانێت دین چ ڕۆڵێک لە ئامێزانبوون، یان پارچەپارچەبوونی کۆمەڵگەدا دەبینێت. کتێبی "ئەخلاقی پرۆتێستانی و ڕۆحی کاپیتالیزم"ی ماکس ڤێبەر، نموونەیەکی گرنگی قسەکردنی سۆسیۆلۆژیایە لەسەر دین، نموونەیەک پێمان دەڵێت چۆن سۆسیۆلۆژیا دەشێت بڕوانێتە بیروباوەڕە تیۆلۆژییەکان و تەماشای دەرەنجامە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکانیان بکات. چۆن بیروباوەڕی دینی دەکرێت واقیعێکی نادینی بەرهەم بهێنێت.

ئەگەر تیۆلۆژیا باس لەوە بکات چۆن خودا لە ڕێگەی دینەوە دەستی لەناو دیاردەکانی سەرزەویدا هەیە، دەستی لەناو هەڵسوکەوتەکانی ئینسان و لەناو گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگەدا هەیە. ئەوا سۆسیۆلۆژیا ئەم شتانە لە غیابی دەستێوەردانی خودادا دەبینێت و مامەڵە دەکات، دیاردەکان وەک دیاردەی سەرزەمینی مامەڵە دەکات و وەک دیاردەی سەرزەمینیش لێکیان دەداتەوە. بەلام ئەم مامەڵە و خوێندنەوە تایبەتەی سۆسیۆلۆژیا بۆ دین، مانای ئەوە نییە دین گرنگ نییە و بایەخی نەماوە، بەڵکوو مانای ئەوەیە، دین وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دەبینێت و مامەڵە دەکات و

موقەدەس خۆیشی وەک یەکێک لە بەرهەمە کولتووری و ڕەمزییەکان وێنا دەکات و دەخوێنێتەوە. تەماشاکردنی دین وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی، وا دەکات کۆمەڵناس لە خوێندنەوە و لێکدانەوەی دیندا پێویستی بەو سەرەتا میتۆدییە هەبێت کە پیتەر بێرگەر ناوی دەنێت "بێخوداییەکی میتۆدی." وەک پێشتریش وتم، "بێخودایی میتۆدی" ئەو دوو وشەیەیە، کە من لە پیتەر بێرگەری کۆمەڵناسم وەرگرتووە و لە ستوونەکەمدا هێمام پێکردووە. لە بەشی داهاتووی ئەم نووسینەدا باس لەو هەڵانە دەکەم، کە کاک کۆشان لە قسەکردنیدا لەسەر ئەم پێدراوە میتۆدییەی پیتەر بێرگەر دەیانکات.

## کێشەی جیانەکردنەوەی میتۆد و تیۆر لە یەکدی

بەشی یەکەمی ئەم باسە تەرخان بوو بۆ کێشەی جیانەکردنەوەی نووسینی ڕۆژنامەگەری لە نووسینی ئەکادیمی. بەشی دووهەمیشی تەرخان بوو بۆ کێشەی جیانەکردنەوەی خوداناسی لە دین، ئەم بەشەش تەرخانە بۆ کێشەی جیانەکردنەوەی تیۆر لە میتۆد. وەک پێشتریش وتم، نەبوونی توانای جیاکردنەوەی شتەکان لە یەکدی، یەکێکە لە نەخۆشییە بونیادییەکانی ناو ڕۆشنبیریی کوردی، ئەم نەخۆشییەش بە شێوەیەکی ئاشکرا، بە نووسینەکەی کاک کۆشانەوە دیارە و لەم ڕووەوە نووسینەکەی کاک کۆشان وێنەیەکی نموونەییی ئەو جۆرە نووسینانەیە کە ڕۆژانە و بەبێ هیچ بەدواداچوونێکی ڕەخنەیی لە ناوەندی ڕۆشنبیریی ئێمەدا بڵاو دەبنەوە.

بەر لەوەی بێمە سەر کێشەی جیانەکردنەوەی تیۆر لە میتۆد لە نووسینەکەی کاک کۆشان، دەمەوێت ئەو شتانە بەبیری خوێنەر بهێنمەوە، کە کاک کۆشان لەم ئاستەدا لەسەر ستوونەکەی من نووسیبووی.

کاک کۆشان پێی وایە من بە هەڵە بیروبۆچوونەکانی پیتەر بێرگەری کۆمەڵناسم بە خوێنەری کورد ناساندووە و ئەوەی من لەو کۆمەڵناسەم وەرگرتووە، بۆچوونێکی "ئێکسپایەر"ە و تەنانەت خودی پیتەر بێرگەر خۆیشی باوەڕی بەو بۆچوونانەی خۆی نەماوە. کاک کۆشان لێرەدا باس لەو دوو وشەیە دەکات، کە من لە پیتەر بێرگەرم وەرگرتووە، واتە باس لە چەمکی "بێ خودایی میتۆدی" دەکات و بەکارهێنانی ئەم دوو وشەیەش بە ناسینی فیکری ئەم کۆمەڵناسە یەکسان دەکات، ئینجا دوای ئەوە دەڵێت ئەم فیکرە "ئێکسپایەر" بووە. بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت من چیم لەسەر چەمکی "بێ خودایی میتۆدی" نووسیوە، لێرەدا ئەو چەند دێڕە دەنووسمەوە، کە لە ستوونەکەمدا لەسەر ئەو چەمکە نووسیومە. من نووسیومە: "بێ خودایی میتۆدی" مانای ئەوەی "کۆمەڵناس لە شیکردنەوەیدا بۆ کۆمەڵگە لە بوونی خودایەکەوە لەپشتی واقیع و لەپشتی کۆمەڵگە و لە پشتی بوونی کۆمەڵایەتییەوە دەست پێ ناکات، بەڵکوو لە خاڵی کۆبوونەوە و پێکەوەژیانی کۆمەڵێک ئینسان و گروپەوە دەست پێ دەکات." ئەگەرچی ئەم لێکدانەوەیە بۆ چەمکی "بێ خودایی میتۆدی" لە ستوونەکەی مندا دەقاودەق لێکدانەوەکەی پیتەر بێرگەر نییە، بەڵام ئاشکرایە "بێ خودایی میتۆدی" باس لەوە دەکات، چۆن کۆمەڵناس تەماشای دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکات و چ هەڵوێستێکی لە بەرامبەر باوەڕە دینییەکاندا هەیە. واتە ئەم چەمکە باس لە سەرەتایەکی میتۆدی، یان پرنسیپێکی مەنهەجی دەکات.

بۆ ئەوەی خوێنەر لە چۆنیەتی تێگەیشتنی پیتەر بێرگەر بۆ ئەم چەمکە ئاگادار بێت، بە پێویستی ئەزانم زۆر بەکورتی لە ماناکانی ئەم چەمکە لای ئەم کۆمەڵناسە بدوێم و بنەما فیکری و میتۆدییەکانی ئاشکرا بکەم، ئینجا دوای ئەوە نیشانی دەدەم ئایا بەڕاستی پیتەر بێرگەر لەم دەستپێکە میتۆدییە پەشیمان بووەتەوە؟ ئایا بەڕاست "بێ خودایی

میتۆدی" چەمکێکی ئێکسپایەرە، وەک کاک کۆشان دەڵێت، یاخود یەکێکە لە سەرەتا میتۆدییە هەرە گرنگەکانی کارکردنی فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە دونیای ئەمڕۆدا؟

## بێ خودایی میتۆدی چییە؟

بەر لە هەموو شتێک، "بێ خودایی میتۆدی" مانای بێخودایی دینی نییە، مانای بێخودایی بە مانا دینییەکەی نییە، مانای ئەوە نییە ئینسان باوەڕی بە خودا و دین و موقەدەس نەمێنێت، یان دین بە شتێکی زیادە و بێمانا و بێنرخ بزانێت. بێخودایی میتۆدی لە سۆسیۆلۆژیادا مانایەکی تایبەتی هەیە کە پەیوەندیی بە چۆنیەتی لێکدانەوە و شیکردنەوەی دیاردە دینییەکانەوە هەیە. تا ئەو شوێنەی من ئاگادار بم، پیتەر بێرگەر یەکەمین کۆمەڵناسە ئەم چەمکەی بەکار هێنابێت. لەم بارەیەوە پیتەر بێرگەر دەنووسێت: "لێکدانەوەی زانستییانەی دین پێویستی بەوەیە ئەو هەقیقەتە ڕەهایەی ئیمانداران باوەڕیان پێیەتی، بخاتە ناو دوو کەوانەوە"(Berger 1974: 133). واتە لێکدانەوەی زانستییانەی دین، نابێت لە باوەڕهێنان بە هەقیقەتە دینییەکانی باوەڕدارانەوە دەست پێ بکات، بەڵکوو دەبێت لەودیوی ئەو هەقیقەتانەوە دەست پێ بکات و خودی ئەو هەقیقەتانەش بخاتە ناو دوو کەوانەوە، واتە وەک نەبوو مامەڵەیان بکات. پیتەر بێرگەر لە شوێنێکی دیکەدا هەمان دید دووبارە دەکاتەوە و دەنووسێت: "گەر باس لە دیاردە دینییەکان بکرێت، (...) پێویستە وەک دیاردەی ئینسانی مامەڵەیان بکرێت و (...) هەموو لێکدانەوەیەکی دەرە-ئینسانی بخرێتە لاوە." (Berger 1979: 36). لە شوێنێکی دیکەدا ئاشکراتر دەڵێت: " دین لە هەموو دەرکەوتن و بەرجەستەبوونەکانیدا بریتییە لە قڵپکردنەوە و سەپاندنی وێنە و بۆچوون و لێکدانەوەکانی ئینسان بەسەر گەردوونێکی

بەتاڵدا. قڵپکردنەوە و سەپاندنێک، کە دواتر لە شێوەی واقیعێکی نامۆدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئینسان سەرقاڵ بکات. شتێکی بەڵگەنەویستە لە چوارچێوەی لێکدانەوە و تیۆریزەکردنی زانستییانەی دیندا، کارێکی مەحاڵ و نەکردەیە، باوەڕکردن بەم دونیا موفاریقە بسەلمێنرێت یان بەدرۆ بخرێتەوە. ئەم وێناکردنە دینییە دەکرێت تەنها وەک وێناکردن مامەڵە بکرێت، وەک بەرهەمی چالاکیی ئینسان و وەک بەرهەمی وشیاریی ئەو. دەبێت هەموو پرسیارێکیش دەربارەی ئەوەی ئایا ئەم وێناکردنە شتێک نییە زیاتر لە وێناکردن، ئایا ئەم وێناکردنە هێما بۆ شتێک ناکات جیاواز لەو دونیا تەجریبی، یان ئەمپیرییەی، کە ئینسان تیایدا دەژی، پشتگوێ بخرێت. بە مانایەکی دیکە، هەموو لێکدانەوەیەکی مەسەلە دینییەکان کە خۆی لە چوارچێوەی پێدراوە ئیمپیرییەکانی دیندا سنووردار دەکات، دەبێت لەسەر بنەمای "بێ خوداییەکی میتۆدی" ئەنجام بدرێت"(Berger 1967: 100).

بۆ ئەوەی ئەو زمانە سۆسیۆلۆژییە زەحمەتەی پیتەر بێرگەر ئاسان بکەینەوە و وا بکەین خوێنەر بتوانێت لەو پەرەگرافەی سەرەوە تێبگات، دەکرێت بڵێین: بۆ ئەوەی کۆمەڵناسێک لەسەر دەرکەوتە عەمەلییەکانی دین لەناو واقیعدا قسە بکات، یان بۆ ئەوەی تێبگات چۆن باوەڕە دینییەکان لەناو واقیعی کۆمەڵایەتیدا کار دەکەن، نابێت لەوێوە دەست پێ بکات، ئایا ئەو باوەڕە دینییانە ڕاستن یان خورافەتن، ناشبێت لەوێوە دەست پێ بکات ئایا ئەو دونیایەی دیکە، کە دین باوەڕی پێیەتی، هەقیقەتە یان خەیاڵ، ڕاستە یان درۆ. کۆمەڵناس، کە لەسەر دین قسە دەکات دەبێت لەوەیوە دەست پێ بکات، چۆن دین وەک دیاردەیەکی ئینسانی و کۆمەڵایەتی لە واقیعدا بەرجەستە و ئامادەیە. ئەم دەستپێکە پێویستی بەوەیە کۆمەڵناس باوەڕە دینییەکانی خۆی و ئەوانەی کەسانی تریش نەکاتە ئامرازی پاسادانکردن و سەلماندنی ڕاستییە زانستییەکان. لە

ڕاستیدا پیتەر بێرگەر ڕای وایە کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان ناتوانن بوون یان نەبوونی خودا یان ڕاستی و ناڕاستیی ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە ئیمان و باوەڕەوە هەیە، بسەلمێنن، یان بەدرۆ بخەنەوە."بێخودایی میتۆدی" مانای ئەوەی کۆمەڵناس تەماشای دیاردە دینییەکان بکات وەک دیاردەی کۆمەڵایەتی و ئینسانی، نەک وەک دیاردەی "بان- زەمینی" و "دەرە- ئینسانی،" هەروەها مانای ئەوەی باوەڕە دینییەکانی کەسی لێکۆڵەرەوە نەبنە بەشێک لە کارکردنە زانستییانەکەی، بەڵکوو لە دەرەوەی هەقیقەتە مەعریفییەکاندا بمێننەوە. ئەم دەستپێکە میتۆدییە پەیوەندیی نییە بە باوەڕداربوون یان نەبوونی کۆمەڵناسەکە خۆیەوە. پیتەر بێرگەر خۆی مەسیحییەکی لۆسەرییە و کەسێکی بێدین نییە، بەڵام شێوازی مامەڵەکردنی زانستییانەی بۆ دین ناچاریدەکات لە بێخوداییەکی میتۆدییەوە دەست پێ بکات، واتە لەوێوە دەست پێ نەکات، ئایا بوون یان نەبوونی خودا ڕاستە یان نا، ئایا ئیمان خورافەتە یان هەقیقەت، واتە لە ڕاستبوون و نەبوونی ئیمان خۆیەوە دەست پێ نەکات، بەڵکوو لە چۆنیەتی و لە شێوازی ئیشکردنی ئیمانەوە لەناو جیهان و مێژوو و ناوەندە کۆمەڵایەتییەکاندا دەستپێدەکات. مانا زانستییەکانی "بێخودایی میتۆدی" ئەمەیە، ئاشکرایە ئەمەش بە هیچ جۆرێک بێنرخکردنی دین نییە، بەڵکوو هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە دین لە دیدێکی کۆمەڵناسانەوە.

گەر هەر کۆمەڵناسێک لە باوەڕە دینییەکانی خۆیەوە دیاردەکانی لێک دایەوە و ئەو باوەڕانەی کردە پێوەری هەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوکات جگە لە فەوزایەکی مەعریفی و جگە لە پێکدادانی فیرقە دینییەکان لەناو مەعریفەدا و جگە لە شەڕی باوەڕە دینییەکان لەگەڵ یەکدا، شتێکی دیکەمان دەست ناکەوێت. گەر هەر لێکۆڵەرەوەیەک ئیمانی خۆی کردە پێوەر بۆ مەعریفەی زانستی، ئەوکات بەقەد ژمارەی لێکۆڵەرەوەکان مەعریفەی زانستیی جیاوازمان دەبێت. ئەمەش وا دەکات ئەنجامدانی کاری

زانستی، مەسەلەیەکی مەحاڵ بێت. لە ڕاستیدا گەر ئەم سەرەتا میتۆدییە پەیڕەو نەکرێت، ئەوکات شتێکمان نابێت بە ناوی مەعریفەی زانستییەوە و هەموو ئەو دەرەنجامانەی زانستەکان پێیان دەگەن، ڕاستەوخۆ گرێدراوی باوەڕی دینیی کەسی لێکۆڵەرەوەکە دەبن.

دوای ئەم ڕوونکردنەوە سەرەتاییەی چەمکی "بێ خودایی میتۆدی" کاتی ئەوە هاتووە ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، ئایا بەڕاستی ئەم سەرەتا و دەستپێکە میتۆدییە "ئێکسپایەر" بووە؟ ئایا بەڕاست من شتێکی کۆنم بۆ خوێنەری کورد هێناوە، کە کەس باوەڕی پێی نەماوە، یاخود "بێ خودایی میتۆدی" یەکێکە لە سەرەتا میتۆدییە هەرە گرنگەکانی کارکردنی فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە دونیای ئەمڕۆدا؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە هەوڵئەدەم زۆر بە کورتی لەسەر دیدی هابرماز بۆ مەسەلەی "بێ خودایی میتۆدی" بدوێم و لەڕێگەی ئەو لێدوانەشەوە بێبناغەیی و ناڕاستی بۆچوونەکانی کاک کۆشان سەبارەت بە "ئێکسپایەربوون"ی دەستپێکی "بێ خودایی میتۆدی" ئاشکرا بکەم.

## ئایا هابرماز شتی ئێکسپایەر بە خوێنەر دەفرۆشێت؟

لەسەر هەمان دەستپێکە میتۆدییەکەی پیتەر بێرگەر، فەیلەسوفی ئەڵمانی هابرماز لە چەند ساڵی ڕابردوودا کۆمەڵێک نووسینی لەسەر دین نووسیوە. هابرماز "بێخودایی میتۆدی" وەک ئامرازی سەرەکی جیاکردنەوەی مەعریفەی زانستی لە باوەڕ یان ئیمان دەناسێنێت. بێخودایی میتۆدی لای هابرماز، سەرەتایەکە بۆ ڕێگرتن لە تێکەڵکردنی مەعریفەی زانستی بە دین، یان بۆ تێکەڵکردنی کایە و میتۆدی بەرهەمهێنانی مەعریفەی زانستی بە کایەی دین و باوەڕە ئایینییەکان.

هابرماز لە ناساندنی ئەم دەستپێکە میتۆدییەدا باس لەوە دەکات،

لێکۆڵەرەوە نابێت حوکم بەسەر ڕاستی و دروستی باوەڕە دینییەکاندا بدات، بەڵکوو دەبێت سنووریکی ئاشکرا لەنێوان دین و مەعریفەی زانستیدا بکێشێت و بە یەکتریان تێکەڵ نەکات. دیدی زانستی لای هابرماز لە ئینسانەوە دەست پێ دەکات، لە کاتێکدا دیدی دینی لە خوداوە، هابرماز لەم بارەیەوە دەنووسێت: "نابێت مەودا بە هیچ یەکێک لەم دووانە بدرێت تێکەڵ بەوی تریان ببێت (مەبەستی خودا و ئینسانە). هەر کە سنووری نێوان دین و مەعریفە هەڵگیرا و هەر کە پاڵنەرە دینییەکان لەژێر ناونیشانی ناڕاستدا هاتنە ناو فەلسەفەوە، ئیدی عەقڵ دەسەلاتی خۆی ئەدۆڕێنێت و لە خودی خۆی دوور دەخرێتەوە".(Hbermas 2005: 252) هابرماز لە چاوپێکەوتنێکدا لە ساڵی ٢٠٠٢ باس لەوە دەکات پەیڕەوینەکردنی ئەم سەرەتا میتۆدییە وا دەکات فیکر، یان فەلسەفە، لە فەلەسەفەبوون بکەوێت. لە دیدی ئەودا، ئەوەی فیکرێک دەکات بە فیکری زانستی، ئەم سەرەتا میتۆدییە. هابرماز لە وەلامی پرسیارێکدا، کە گوایە شتێک لە کاریگەریی کەلەپووری مەسیحیەت، لە فیکری ئەودا ئامادەیە، دەڵێت بوونی ئەو جۆرە کاریگەرییە دینییانە لەسەر فیکر، کێشە نییە، ئەوەی کە ڕەگێکی دینی لە فیکری ئەم یان ئەو نووسەردا هەیە، مەسەلەیەک نییە، بە مەرجێک ئەو نووسەرە لە کاتی کارکردن و بەرهەمهێنانی فیکردا پەیڕەوی پرنسیپی "بێ خودایی میتۆدی" کردبێت:Habermas 2002) (160. هابرماز دەنووسێت: "دەمەوێت بڵێم پەیوەندیی بیرکردنەوەی من بە کەلەپووری تیۆلۆژییەوە بێزارم ناکات، بەو مەرجەی لێکۆڵەرەوە باوەڕی بە جیاوازیی میتۆدیی نێوان گوتارەکان هەبێت، بەو مەرجەی کە گوتاری فەلسەفی پەیڕەوی هەندێک داواکاریی جیاواز بکات (لە داواکاری دین یان تیۆلۆژیا) بۆ بەخشینی ڕەوایەتی بە خۆی. لە دیدی مندا، فەلسەفەیەک باز بدات بەسەر سنوورەکانی بێ خودایی میتۆدیدا هەموو جیدییەتێکی فەلسەفی ئەدۆڕێنێت".(Habermas 2002: 160) بە مانایەکی

دیکە، هابرماز بەئاشکرا دەڵێت، فەلسەفە و زانستە کۆمەلایەتییەکان بۆ ئەوەی ببن بە فەلسەفە و زانستی کۆمەلایەتی، دەبێت پەیڕەوی پرنسیپی "بێخوداییی میتۆدی" بکەن، دەنا ناتوانن خۆیان وەک کایەیەکی مەعریفی سەربەخۆ لە دین جیا بکەنەوە و بناسێنن. هابرماز ئەم قسەیە لە ساڵی ۲۰۰۲ دا دەکات، بەپێی لۆژیکی کاک کۆشان بێت، هابرماز بۆچوونێکی ئێکسپایەر بە خوێنەری ئەڵمانی ئەفرۆشێت، وەک چۆن پێی وایە من بۆچوونێکی ئێکسپایەرم بە خوێنەری کورد فرۆشتووە.

هابرماز لە دیدێکی "کانت"ییانەوە باس لە پەیوەندیی نێوان دین و مەعریفە دەکات، لە سەردەمی کانتیشەوە مەجالی مەعریفەی زانستی و مەجالی دین لە یەکدی جیا کراونەتەوە. لە هەمان کاتدا کانت باس لەوەش دەکات، کە عەقڵ، وەک سەرچاوەی مەعریفە، سنوورێکی تایبەتی هەیە و ناتوانێت هەموو شتەکان بزانێت. واتە عەقڵ تا مەودایەکی دیاریکراو دەتوانێت بڕوات و دەتوانێت جۆرێکی تایبەتی هەقیقەت بەرهەم بهێنێت. لە کەلەپووری ئیسلامیشدا، بەتایبەتی لای سۆفییە گەورەکان، دیدێکی هاوشێوە بۆ دەستنیشانکردنی سنوورەکانی عەقڵ ئامادەیە و ڕۆحانیەتی سۆفییانە لەسەر تێپەڕاندنی سنوورەکانی عەقڵ دروست بووە. سۆفیزم لەم دیدەدا وەک بازدانێک بۆ ئەودیوی عەقڵ دەر دەکەوێت. مەسەلەی ئەوەی عەقڵ بەتەنها هەموو شتەکان نازانێت، مەسەلەیەکە چ لە فیکری ڕۆژئاوادا و چ لە فیکری ئیسلامیدا قسەوباسێکی زۆری لەسەر کراوە. بەلام ئەوەی لێرەدا دەبێت ئاگامان لێی بێت، تێکەڵنەکردنی دوو ئاستە بە یەکدی. تێکەڵنەکردنی ئاستی "ئیشنەکردنی عەقڵە" بە ئاستی ئەوەی "عەقڵ هەموو شتێک نییە." واتە نابێت ڕێگرتن لە ئیشکردنی عەقڵ بخەینە شوێنی ئەو ڕاستییەی کە عەقڵ سنووردارە و دەشێت بەتەنها بەس نەبێت. عیلمی کەلام لای غەزالی بۆ نموونە لەوێوە ڕەخنە لە عەقڵ ناگرێت کە ناتوانێت بە هەموو ڕاستییەکان بگات، بەڵکوو لەوێوە ڕەخنەی

لێ دەگرێت، کە نابێت هەندێک شت بڵێت و بکات، چونکە ئەو شتانە لەگەڵ پێدراوە دینییەکاندا یەک ناگرنەوە. غەزالی لە ڕەخنەگرتنیدا لە عەقڵ لەوە ئەدوێت، کە عەقڵ ناتوانێت بەسەربەخۆیی بە دڵنیایی بگات و خۆی لە گومانکاری بپارێزێت، بۆیە بۆ گەیشتن بە یەقین، عەقڵ پێویستی بە دینە. غەزالی ئەو دیدەی فەیلەسوفەکان بۆ سەبەبیەت ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێت بۆ هەموو ئەنجامێک، هۆکارێک هەیە، چونکە لە دیدی غەزالیدا، ئەم دیدە بۆ سەبەبیەت ڕۆڵی موعجیزە بەدرۆ دەخاتەوە. سەرەڕای ئەمە، غەزالی پێی وایە باوەڕهێنان بەوەی کە لەپشتی هەموو ڕووداوێکەوە سەبەبێکی تایبەتی هەیە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە حیساب بۆ ئیرادەی خودا نەکرێت. بە بۆچوونی غەزالی، ئەگەر هۆکار و ئەنجام، یان سەبەب و نەتیجە، هەشبن و ڕاستبن، ئەوە بۆیە هەن و ڕاستن، چونکە خودا ئەوەی دەوێت، نەک بەشێک بن لە یاساکانی سروشت خۆی. لای غەزالی، نابێت یاسای سەبەبیەت یاسایەکی سروشتی بێت و بۆ لێکدانەوەی ڕووداوەکان بەکار بهێنرێت، بەڵکوو دەبێت ئەو ڕووداوانە بە ئیرادەی خوداوە ببەسترێنەوە (Lezeenberg 2008: 200-202). ئەم شێوازی بیرکردنەوەیەی غەزالی، نموونەیەکی بەرچاوی بیرکردنەوەیەکی نازانستییە، کە باوەڕە دینییەکان تیایاندا بوونەتە ڕێگر لە بەردەم ئیشکردنی سەربەخۆی عەقڵدا، لە کاتێکدا بێ خودایی میتۆدی ڕێ لەوە دەگرێت ئەو باوەڕە دینییانە ببنە یاسادانکەری یان یاسادانەکەری زانیارییە زانستییەکان.

## پەشیمانبوونەوەی پیتەر بێرگەر

دواهەمین خاڵێک بمەوێت باسی بکەم، مەسەلەی پەشیمانبوونەوەی پیتەر بێرگەری کۆمەڵناسە لە هەندێک لە بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت بە دین. کاک کۆشان ڕاست دەکات، پیتەر بێرگەر لە هەشتاکانەوە بە

هەندێک لەو بۆچوونانەدا چووەتەوە کە لە شەستەکاندا لەسەر دین هەیبوون. بەڵام کێشەی کاک کۆشان لەوەدایە ئەم پێداچوونەوەیەی پیتەر بێرگەر بە هەندێک لە بۆچوونەکانیدا لەسەر دین، یەکسان دەکات بە پەشیمانبوونەوەی ئەم کۆمەڵناسە لە "بێخودایی میتۆدی" وەک میتۆدی سەرەکیی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی دیاردە دینییەکان. ڕاستە پیتەر بێرگەر لە هەندێک بۆچوونی تیۆری سەبارەت بە دین، پەشیمان بووەتەوە، بەڵام لە میتۆدی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی کۆمەڵناسانەی دین، پەشیمان نەبۆتەوە. ئەم هەڵەیەی کاک کۆشان لەوێوە هاتووە کە ناتوانێت تیۆر و میتۆد لە یەکدی جیا بکاتەوە. میتۆدی لێکدانەوەی دین لای پیتەر بێرگەر جیاوازە لەو تیۆرانەی ئەم کۆمەڵناسە لەسەر دین هەیەتی. بەڵام بەر لەوەی باس لە جیاوازییەکانی نێوان میتۆد و تیۆر بکەم، با سەرەتا بزانین پیتەر بێرگەر لە کام بۆچوونی تیۆری خۆی پەشیمان بووەتەوە، یان وردتر بدوێین، کام بۆچوونی تیۆری خۆی دەسکاری کردووە، بۆ ئەوەی خوێنەر لەوە ئاگادار بێت، ئێمە باسی چی و کام مەسەلە دەکەین.

لە ناوەڕاستی شەستەکاندا، پیتەر بێرگەر باوەڕی وا بوو، کە دوو پرۆسەی گرنگ لە دونیای هاوچەرخدا تەحەدای گەورە بۆ بوون و مانەوە و ڕۆڵی دین لە دونیادا دروست دەکەن. ئەو دوو پرۆسەیەش بریتین لە پرۆسەی بەعەلمانیبوون و پرۆسەی بەپلورالبوونی دونیای هاوچەرخ. (پلورالبوون مانای ئاڵۆزبوونی دونیا و هاتنەکایەی گروپ و دید و بۆچونی جیاواز). بە بۆچوونی بێرگەر، پەیوەندییەکی دیالێکتیکی لەنێوان ئەم دوو پرۆسەیەدا هەیە. دونیا چەند بە عەلمانی ببێت، ئەوەندە پلورالبوونی زیاد دەکات و چەندە پلورالبوونیشی زیاد بکات، ئەوەندە عەلمانیبوونی فروانتر دەبێت. ئەمەش مانای ئەوەی لە دونیای هاوچەرخدا بەبەردەوامی شێوازی بیرکردنەوە و شێوەژیان و شێوەی بوونی کۆمەڵایەتیی جیاواز

دێنە کایەوە کە دین ناتوانێت هەموویان کۆنترۆڵ بکات و هەقیقەتەکانی خۆی بەسەر هەموویاندا بسەپێنێت. ئەو پرۆسانە وا دەکەن دید و بۆچوونە دینییەکان لە دید و بۆچوونی ڕەهاوە ببنە دید و بۆچوونی ڕێژەیی. ئەم گۆڕانانەی ناو دین، خۆشی جارێکی دیکە هەم پرۆسەی بەعەلمانیبوون و هەم پرۆسەی بەپلورالبوون بەهێز دەکەن. بەکورتی تا کۆتاییی شەستەکان، پیتەر بێرگەر هەڵگری تیۆرەیەکی تایبەت بوو کە پێی وابوو دین بەرەو لاوازییەکی تەواوەتی دەڕوات و چیدی ناتوانێت ڕۆڵێکی کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی قابیلی باسکردن لە ژیانی کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا ببینێت. لەم تیۆرە تایبەتەدا، پرۆسەی لاوازبوونی دین، پرۆسەیەکی حەتمییە و بەعەلمانیبوونی بەردەوامی دونیا وا دەکات، دین نەتوانێت ئەو ڕۆڵە ببینێت کە لە کۆمەڵگە تەقلیدییەکاندا دەیبینی.

لە سەرەتای هەفتاکانەوە، پیتەر بێرگەر بەم دیدە تیۆرییەدا دەچێتەوە و ئەو باوەڕە سەرەتاییییەی بە حەتمییەتی لاوازبوونی دین هەیبوو، نامێنێت. لە هەمان کاتدا بۆچوونیشی دەربارەی حەتمییەتی بەعەلمانیبوونی دونیا دەگۆڕێت و بەو باوەڕە دەگات، تەنانەت لە مۆدێرنترین کۆمەڵگەکانی سەر زەویدا، بزووتنەوەی دینی نوێ لەدروستبووندان کە حەتمییەتی تیۆرەی بەعەلمانیبوونی دونیا ڕووبەڕووی پرسیاری ڕاستەقینە دەکاتەوە. بەکورتی ئەوەی پیتەر بێرگەر پێیدا دەچێتەوە و باوەڕی پێی نامێنێت "بێ خودایی میتۆدی" نییە، وەک دەستپێکێکی زانستی بۆ شیکردنەوە و خوێندنەوەی دیاردە دینییەکان، بەڵکوو ئەو بۆچوونانەیەتی کە سەبارەت بە ڕۆڵی دین لە دونیای هاوچەرخدا هەیبوو. ئەمانەش دوو شتی تەواو جیاوازن.

لێکجیانەکردنەوەی تیۆر و میتۆد ئەو هەڵە گەورەیەیە کە کاک کۆشانی تێکەوتووە. ئەم بەڕێزە تێکەڵییەک دەکات لەنێوان ئەو ئامرازەی کە یارمەتیمان دەدات بۆ بیرکردنەوە لە دیاردەیەک، لەگەڵ ئەو دەرەنجامە تیۆرییانەی لە لێکۆڵینەوەی ئەو دیاردەیەوە پێیان دەگەین. میتۆد، ئامراز

و شێواز و هەنگاوەکانی بیرکردنەوەیە، تیۆر، ئەو فیکرەیەیە، کە دوای ئیشکردنێکی میتۆدی بەدەستی دەهێنین. میتۆد وەک ڕێگاپیشاندەر وایە، تیۆرە ئەو زانیاریانەیە، کە ئەیاندۆزینەوە، میتۆد کۆمەڵێک ئیجرائاتە، تیۆر کۆمەڵێک دەرەنجامە. ئینسان بۆ ئەوەی تیۆرەیەکی قابیلی سەلماندن و نزیک لە ڕاستی و زانستییانە بەرهەم بهێنێت، دەبێت پێشوەخت میتۆدێکی زانستی بەکار بهێنێت. بۆ ئەوەی ئەم جیاوازییە لە خوێنەر نزیکتر بکەمەوە، ئەم نموونەیە دەهێنمەوە. پیاوێک دەیەوێت بچێتە سەربانێک بۆ ئەوەی بزانێت چی لەو سەربانە هەیە و چی لەوێدا ڕوو دەدات. میتۆد لەو پەیژەیە ئەچێت کە دای دەنێت بۆ ئەوەی بگاتە سەربانەکە. تیۆر بریتییە لەو بیروبۆچوونانەی دەربارەی ئەو سەربانە لای ئەو کەسە دروست دەبێت، دوای ئەوەی بە پەیژەکەدا سەردەکەوێتە سەرەوە. کە وا بوو، بێخودایی میتۆدی بریتییە لەو ڕێگەیەی بە هۆیەوە دەتوانین تەماشای دیاردە دینییەکان بکەین، لە کاتێکدا تیۆری دینی بریتییە لەو بۆچوون و لێکدانەوانەی لەسەر دین لامان دروست دەبێت. یەکەمیان ئامرازی ئیشکردنە، دووهەمیان ئەو لێکدانەوانەیە کە دوای ئیشکردنەکە دروست بووە. ئەوەی کاک کۆشان لە پەیوەندیدا بە دیدە میتۆدییەکەی پیتەر بێرگەرەوە کردوویەتی، ڕێک وەک تێکەڵکردنی پەیژەکەیە لەگەڵ سەربانەکەدا. جیانەکردنەوەی ئەو ئامرازەیە، کە بۆ تەماشاکردن بەکاری دەهێنین، لە خودی ئەو شتانەی کە دەیانبینین.

## مۆدەپەرستی و پاتریارکیەت

هیوادارم تا ئێرە توانیبێتم بۆ خوێنەری ئاشکرا بکەم ئەوەی پیتەر بێرگەر پێیدا چووەتەوە و دەسکاریی کردووە، میتۆدی خوێندنەوەی دیاردە دینییەکان نییە، بەڵکوو نرخاندنەوەی ئەو ڕۆڵەیە کە دەشێت دین لە

کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا ببینێت. بەر لەوەی کۆتایی بەم نووسینە بهێنم دەمەوێت کەمێک لەسەر ئەو شێوازی ئەرگومێنتهێنانەوەیە بدوێم، کە کاک کۆشان لە نووسینەکەیدا بەکاری دەهێنێت. شێوازێک کە تێکەڵێکی سەیرە لە مۆدەپەرستی و پاتریارکیەت. وەک وتم، تێکەڵکردنی شتەکان بە یەکدی، وای کردووە کاک کۆشان بەو ئەنجامە ناڕاستە بگات گوایە من کوفری مەعریفیم کردووە و بۆچوونێکی "ئێکسپایەری" کۆمەڵناسیکم هێناوە کە خۆی باوەڕی پێی نەماوە. بۆ ئەوەی بیشیسەلمێنێت کە ئەو بۆچوونە "ئێکسپایەر" بووە، کاک کۆشان باس لە تەمەنی پیتەر بێرگەر دەکات. کاک کۆشان دەڵێ تەمەنی پیتەر بێرگەر لە ئێستادا ٨٠ ساڵە و بۆچوونە تازەکانیشی، کە لە دیدی کاک کۆشاندا بۆچوونی ڕاستن، هی ئەم قۆناغەی تەمەنیەتی. ئەو شتە "ئێکساپایەر"انەش کە من لێم وەرگرتووە، کاتێک نووسیونی، کە تەمەنی ٤٠ ساڵێک بووە. پێوەری ئەوەی گوایە کەسێک لە ٨٠ ساڵیدا شتی باشتر و ڕاستتر دەڵێت لەوەی کە لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا دەیڵێت و دەینووسێت، پێوەرێکی هێجگار سەرەتایی و سادەیە و بە هیچ جۆرێک پەیوەندیی بە پێوانەی زانستییەوە نییە. ئەم پێوەرە، پێوەرێکی پاتریارکییە و لە ئەخلاقیاتی کۆمەڵگە پاتریارکییەکانەوە هاتووە. پاتریارکیەت سیستمێکە هەقیقەت بە بەرهەمی پیاوە پیرەکان دەزانێت و گەنجان دەکاتە دەرەوەی بازنەی هەقیقەتەوە. گرێدانی هەقیقەت بە پیربوونەوە، پەیوەندیی بە پێوەری زانستییەوە نییە. بۆ سەلماندنی ڕاستی و ناڕاستیی تیۆرەیەک، یان میتۆدێک، چەندەها ڕێگەی زانستی، هەیە کە تەمەن تیایاندا هیچ ڕۆڵێک نابینێت. کردنی تەمەن بە پێوەری زانستی، گواستنەوەی ڕۆحی پاتریارکییەتە لە کۆمەڵگە و کولتوورەوە بۆ ناو زانست.

لە درێژەی نووسینەکەیدا، کاک کۆشان ئەم هەڵە فیکرییە دەکاتە پارادۆکسێکی سەرسوورهێنەر. ئەم بەڕێزە ئەم ڕۆحە پاتریارکییە

کۆنەپەرستە بە شێوەیەکی سەیر بە ڕۆحی مۆدەپەرستی تێکەڵ دەکات. لە دونیای ئێمەدا هەم پاتریارکیەت و هەم مۆدەپەرستی دوو نەخۆشیی کوشندەی ناو واقیعی کولتووری و کۆمەلایەتیی ئێمەن. مۆدەپەرست بەو کەسە دەگوترێت کە بەردەوام بەدوای شتی تازەدا دەگەڕێت و دواهەمین بەرهەم و دواهەمین مۆدە بە جوان و باش و ڕاست دەزانێت. ئەوەی کۆنە بە بێبایەخ و بە ناڕاست و بە "ئێکسپایەر" ناو دەبات. ئەم جۆرە مامەڵەکردنەی فیکر، مامەڵەکردنێکی هێجگار هەڵە و لە ڕاستیشدا بێمانایە. بەم حیسابە بێت، مارکس مادام کتێبی سەرمایەی نووسیوە، کەواتە کتێبی مەختوتاتی ئێکسپایەر بووە. لەوەش سەیرتر ئەوەیە، لە کاتێکدا کاک کۆشان قسە لە ئێکسپایەربوونی فیکرێک دەکات، کە لە شەستەکاندا بەرهەم هاتووە، کەچی خۆی باس لە گرنگی دیدی موعتەزیلە دەکات کە ۱۳۰۰ ساڵێک لەمەوبەر نووسراوە. ئەم جۆرە ناکۆکییانە دەلالەت لەوە دەکەن کە کاک کۆشان نەک تەنها بەزەحمەت شتەکانی بۆ لەیەک جیا دەکرێتەوە، بەڵکوو پێوەرەکانیشی پێوەری ناڕاست و سەرەتایی و نازانستین.

لە ڕاستیدا زۆر خاڵی تری نووسینەکەی کاک کۆشان پێویستی بە وەلامدانەوە هەیە، بەلام لێرەدا دەوەستم و هیوادارم توانیبێتم بڕێک لە مەبەستەکانم بۆ کاک کۆشان و بۆ خوێنەرانیش ڕوون کردبێتەوە.

# سەرچاوەکان

1- Hana, Arendt (1976). The origions of totalitarianism. New York. Harcourt Brace & Company.

2- Tormey, Simon (1995). Making sense of tyranny. Interpretations of totalitarianism. New York. Manchester University Press.

٣. مەریـوان وریـا قانیـع (٢٠٠٦). دیکتاتۆریـەت و تۆتالیتاریـزم لـە نێـوان جـۆرج ئۆرویـل و فریدریـک هایکـدا. سـەردەمی ڕەخنـە. ژمـارە ٢.

٤. ڕەزا برنجـکار (١٣٧٨). اشـنایی بـا علـوم اسـلامی. کلام، فلسـفه، عرفـان. تهـران.

٥. محمـد عابـد الجابـری (١٩٩٩). تکویـن العقـل العربـی. مرکـز الدراسـات الوحـده العربیـه. بیـروت. لبنـان.

6- Lezeenberg, Michel (2008). De Islamitische filosofie. Uitgeverij Bulaaq. Amsterdam.

7- Max Weber (2003). The Protestant ethic and the spirit of capitalism. Mineola, NY: Dover Publicationsnsm-

8- Berger, Peter (1967). The sacred canopy. Elements of a sociological theory of religion. Garden City, NY: Doubleday.

9- Berger, Peter (1974). Some second thoughts on substantive versus functional definition of religion. Journal for the scientific

.study of religion. 126-133

10- Berger, Peter (1979). The heretical imperative: contemporary possibilities of religious affirmation. Garden City. NY: Anchor.

11- Habermas, J. (2002)."A conservation about god and the world", in Religion and rationality: essays on reason, god, and modernity, Ed. Mendietaa. cambridge, UK: Polity Press, pp. 147-167.

# کۆمەڵگە و لێکترازان

## دەربارەی ئیسلام و عەلمانیەت و سیاسەت

نووسەرێکی ئیسلامی بەڕێز بەناوی کاک "فاتح سەنگاوی"یەوە لە ڕۆژنامەی ئاوێنەدا وەلامی ئەو سێ ستوونەی منی دایەوە کە من لە هەفتەکانی ڕابردوودا لەسەر مەسەلەی شوێن و جێی ئیسلام و شەریعەت لە دەستووری داهاتووی کوردستاندا نووسیمن. ئەوەی خوێنەر لێرەدا دەیخوێنێتەوە، وەلامی منە بۆ ڕەخنەکانی ئەو نووسەرە بەڕێزە. وەک سەرەتاش دەمەوێت سوپاسی ئەو بەڕێزە بکەم بۆ ئەو زمانە هێمن و لەسەرخۆیەی لە نووسینەکەیدا بەکاری هێناوە، زمانێک کە تەواو ناکۆکە بەو زمانی حەماسەت و جنێودان و تەشهیرەی ئەمڕۆ بە ناوی فەلسەفە و حیکمەت و ڕەخنە و نووسینی فیکرییەوە لە ناوەندی ڕۆشنبیریی ئێمەدا بالادەستە.

لە سەرەتای باسەکەیدا، ئەو برادەرە، باس لەوە دەکات، کە خەڵکی کوردستان دەنگیان بۆ دەستوورێک داوە، مەبەستی دەستووری عێراقە، کە تێیدا هاتووە ئیسلام سەرچاوەیەکی سەرەکیی یاسادانانە و نابێت هیچ یاسایەک دەر بچێت کە ناکۆک بێت بە شەریعەتی ئیسلام. لێرەشەوە ئەنجامگیری دەکات و دەڵێت: کەواتە خەڵکی کوردستان ئەوەیان قبوڵە کە ئیسلام ببێتە سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانان لە دەستووری داهاتووی

کوردستاندا. ئەوەی کە خەڵکی کوردستان دەنگیان بە دەستووری عێراقی داوە، مەسەلەیەکی ڕاستە و هیچ گومانێک هەڵناگرێت، بەڵام ئەوەی خەڵکی کوردستان دەنگیان بەو دەستوورە داوە لەبەر ئەوەی تێیدا نووسراوە شەریعەت سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانانە و نابێت هیچ یاسایەک دەر بکرێت لەگەڵ شەریعەتدا ناکۆک بێت، ئەمەیان جێی گومانە و لە ڕاستیشدا لێکدانەوەیەکی ناڕاستە. بۆ هەمووومان ئاشکرایە، پاڵنەری سەرەکیی هەڵوێستی سیاسیی خەڵکی کوردستان بەرامبەر بە دەستووری عێراق، پاڵنەری نەتەوەییيە، خەڵکی کوردستان لەبەر ئەوە دەنگیان بەو دەستوورە دا، چونکە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی عێراقیدا مەسەلەی فیدراڵیەت و دروستکردنی ئیقلیمێکی سەربەخۆ لە کوردستاندا لە دەستووردا سەلمێنرا. ئەمە جگە لە هەندێک دەسکەوتی نەتەوەییی دیکە، کە لەو دەستوورەدا چەسپاوە و ئێرە شوێنی باسکردنیان نییە. لەمەش بترازێت، حزبە کوردستانییەکان هەوڵێکی زۆریان دا نەهێڵن ئیسلام لە دەستووره تازەکەی عێراقدا ببێتە سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانان، بەڵام دانان و چەسپاندنی ئەو بەندە پەیوەندیی بە فشاری هێزە دینییەکانی شیعە و سونەوە هەبوو. بەکورتی، ئەوەی گوایە دەنگدانی خەڵکی کوردستان بە دەستووری عێراقی دەنگدانی ئەوانە بەو شێوازەی دین لەو دەستوورەدا چەسپێنراوە، ئەنجامگیرییەکی ناڕاستە و خوێندنەوەیەکی ئایدیۆلۆژیانەی ڕووداوەکانە. خاڵێکی دیکە کە ئەو بەڕێزە باسی دەکات ئەوەیە، کە دەڵێت خەڵکی کوردستان ٩٠٪ موسڵمانن و "هاووڵاتیانی کوردستان، ئیسلام ئایینیانە و پشکدارە لە ژیان و گوزەرانیاندا." دوای ئەمەش بەم حیسابە ئەنجامگیرییەکی دیکە دەکات و دەڵێت وەک ڕێزلێنان لە ویستی ئەو ڕێژەیە لە خەڵکی کوردستان، دەبێت شەریعەت سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانان بێت لە دەستووردا. لەڕاستیدا بەکارهێنانی ئەم ڕێژەی ٩٠٪ یەکێکە لەو بەهانە بەردەوامانەی کە هێزە ئیسلامییەکان بۆ بەرگریکردن

لە هەندێک لە داخوازییە سیاسییەکانیان بەکاری دەهێنن. ئەم بەهانەیە لە باشترین دۆخدا لە دوو سەرەوە هەڵەیە. لە سەرێکەوە دیموکراسیەت مانای ئەوە نییە زۆرایەتی چی ویست بێ قەید و شەرت ئەوە ڕوو بدات، دیموکراسیەت سیستمێکە تێیدا قورساییەکی بەرچاو بۆ ویست و خواست و ئارەزووی کەمینەکانیش دادەنرێت. بۆیە گەر واشی دابنێین ٩٠٪ ی خەڵکی کوردستان موسڵمانن، هێشتا ئەمە مافی ئەوە بە خەڵکی کوردستان نادات ئەوەی ئەوان بە ڕاستی دەزانن بەسەر لە ١٠٪ کەی دیکەدا بیسەپێنن. ئەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ دیموکراسیەت، تێگەیشتنێکی دەسەڵاتگەرانە و ناڕاستە بۆ دیموکراسیەت و لە سەردەمی جۆن ستیوارت میلەوە لە ئەدەبیاتی سیاسیدا ناوی "ستەمگەریی زۆرینەی" لێ نراوە. هەڵەی دووهەم مامەڵەیەکی ناڕاستی ڕێژەی ٩٠٪ کەیە و بوونی گریمانێکی هەڵەیە لە پشتی ئەو ڕێژەیەوە، ئەم بەڕێزە کە دەڵێت ٩٠٪ی خەڵکی کوردستان موسڵمانن، ناڕاستەوخۆ دەڵێت ئەو لە سەدا نەوەدە، هەموویان، دین وەکوو تاقە سەرچاوە، یان وەک سەرچاوەی سەرەکیی شووناسی خۆیان مامەڵە دەکەن و دەشیانەوێت ئیسلام ببێتە سەرچاوەی سەرەکیی ئەو یاسایانەی کە ژیان و پەیوەندییەکانی خەڵک لە کوردستاندا ڕێک دەخات. ئەمەش دیسانەوە لە باشترین دۆخدا گریمانێکی ناڕاستە. هەموومان دەزانین بەشێکی گەورەی ئەو لە سەدا نەوەدەی ئەو بەڕێزە باسی دەکات، نە نوێژ دەکات، نە ڕۆژوو دەگرێت، نەدەچێت بۆ حەج و نە زەکاتیش ئەدات... هتد. واتە هیچ یەکێک لەو "فەرزە" دینییانە جێبەجێ ناکات، کە بەڕێزی باسیان دەکات. بگرە بەپێچەوانەوە، بەشێکی زۆری ئەوانە لەشێوازی ژیان و شێوازی هەڵسوکەوت و جۆری مامەڵەکردنیاندا تەواو ناکۆکن بەو سەرەتا و داخوازییە دینییانە، کە بەشێکی گەورەی هێزە ئیسلامییەکان لە کوردستاندا داوای دەکەن. هەر لە مەسەلەی خواردنەوە و ڕابواردن و ئاهەنگ و پێکەوەبوون و تێکەڵبوونەوە بیگرە،

تا بە مەسەلەی تێگەیشتنیان بۆ ژیان و سیاسەت و ئەخلاق و کولتوور و کۆمەڵگە دەگات. جگە لەمە، مەرج نییە ئەوەشی نوێژی کرد و خودای پەرست و ڕۆژووی گرت، مانای ئەوەیە دەیەوێت دین ببێتە سەرچاوەی سەرەکیی یاسادانان لە کوردستاندا. بەکورتی لە پشتی ئەو بۆچوونە سادەوە کە دەڵێت ٩٠٪ ی خەڵکی کوردستان موسڵمانن، بۆیە دەبێت فڵان یان فیسار شت بکرێت، دیدێکی ئایدیۆلۆژی و خواستێکی سیاسیی دیاریکراو هەیە، نەک ڕاستییەکی سۆسیۆلۆژی و کولتووری و ئەخلاقی سەپاو و باوەڕپێکراو. بۆیە ناکرێت لەسەر ئەم جۆرە گریمانە ناڕاستانە، داواکاری سیاسیی تایبەت بهێنرێتە پێشەوە، بەتایبەتی داواکارییەک کە پەیوەندیی بە شێوازی ڕێکخستنی یاسای پەیوەندییە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگەی کوردستانییەوە هەبێت.

لە شوێنێکی دیکەی وتارەکەیدا، ئەم بەڕێزە باسی ئەوە دەکات، کە ئیسلامییەکان باوەڕیان بەوەیە، کە مرۆڤ ئازادە "لە بیروڕا و دەربڕیندا و سەربەستە لەوەی ئینتیما بۆ چ کۆمەڵ و ئاڕاستەیەکی فیکری و سیاسی دەکات، " هەروەها دەشنووسێت دەبێت "هاوولاتیان لە بەردەم دادگا و قەزادا یەکسان بن و بۆ هەر کەسەش بەو شەریعەتەی بڕوای پێیەتی، کاروباری خۆی ببات بەڕێوە." گەرچی ناتوانین لە ڕووی مێژووییەوە نموونەی ئەزموونێکی ئیسلامی بدۆزینەوە کە ڕاستی ئەم بۆچوونە بسەلمێنێ و پاسادانی بکات، چونکە زۆربەی هەرەزۆری ئەزموونە ئیسلامییەکانی دونیا ئەزموونی چەپێنەر و نادیموکراس و خوێناوی بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت ئەم بۆچوونە لە ڕووی تیۆرییەوە قبول بکەین و باوەڕ بەوە بهێنین، کە دەشێت هێزێکی ئیسلامی دەسەڵات بگرێتە دەست و ڕەچاوی سەرجەمی ئەو خاڵانە بکات، کە ئەو بەڕێزە باسی کردوون. بەڵام دوای ئەمەش، هێشتا هەر کێشەیەک لەو بۆچوونەدا دەمێنێتەوە، ئەویش ئەوەیە، چۆن هەر کەسە بەپێی شەریعەتی خۆی

کاروبارەکانی ببات بەڕێوە؟ لە هیچ شوێنێکی دونیادا هیچ کۆمەڵگەیەک ناتوانێت سیستمێکی یاسایی هەبێت، تیایدا هەر گروپێک "بەپێی شەریعەتی خۆی" مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا دەوڵەت دەبێت خاوەنی سیستمێکی یاسایی یەکگرتوو بێت، نابێت بە خەڵک بڵێ تۆ برۆ باوەڕت بە چ شەریعەتێک هەیە بەوە داوەریت بکرێت و بڕواشت بە چی نییە، دەبێت وازی لێ بهێنرێت. هەموو دەوڵەتێکی مۆدێرن، پێویستی بە یەک سیستمی یاسایی و دەستووری هەیە، کە دەربڕی ویست و ئیرادەی هەمووان بێت. لێرەدا پێ لەسەر دەستەواژەی "هەمووان" دادەگرم، نەک زۆرینەی خەڵک. سیستمی یاسایی و قەزایی و دەستووری، دەربڕی ویست و ئیرادەی هەموو کۆمەڵگەیە، نە تەنها هی زۆرینەی ئەو کۆمەڵگەیە و نە تەنها هی کەمینەکانی ئەو کۆمەڵگەیە، نە تەنها هی هێزە دینییەکان و نە تەنها هی هێزە عەلمانییەکانە، نە تەنها هی ئەوانەی کە پێیان وا یە کۆمەڵگە بێ دین "لێک ئەترازێ" و نە هی ئەوانەش کە پێیان وایە ئامادەگیی دین مانای ئامادەگیی دواکەوتوویی و خورافەت و غەیبانیەت. دەوڵەت هی هەمووانە و دەبێت ئەم مەسەلەیەش لە پرنسیپە هەرە گشتییەکانی دامەزراندن و چۆنیەتی کارکردنی ئەو دەوڵەتەدا ڕەنگ بداتەوە. بۆیە گەر لەبەر خاتری زۆرینەی کۆمەڵگە گوترا دینی ئەم دەوڵەتە ئیسلامە، ئەمە نابێت وا بکات سیستمە یاساییەکەی ئەو دەوڵەتە بەپێی شەریعەت بڕوات بەڕێوە، چونکە خەڵکانێکی زۆر هەن لەو کۆمەڵگەیەدا یەکەم ئیسلام نین، دووهەم شەریعەتیان وەک سیستمی یاسا قبوڵ نییە، سێهەم، کۆمەڵێک یاسای تریان دەوێت، کە ئازادیی ئەوان نەک تەنها لە بواری دەربڕیندا، بەڵکوو لە بواری شێوەژیان و ویست و ئارەزوو و دەرکەوتە ئەخلاقییەکانیشدا دەستەبەر بکات. بێگومان هیچ یەکێک لەمانە ڕەها نین و هەموو کۆمەڵگەیەک، کۆمەڵێک سنووری دیاریکراوی هەیە بۆ پیادەکردنی پانتاییی ئازادی و ویست و چێژ و شێوەژیان و... هتد. بەڵام

ئەم سنوورانە بەتەنها سنووری دینی نین، بەڵکوو کۆمەڵێک سنووری مەدەنیشن، کە لە پرنسیپی بەرپرسیاریەت بەرامبەر بە ئازادیی ئەوانی دیکەوە سەرچاوە دەگرێت. بەکورتی، کە باس لە سیستمی یاسایی دەکەین، باس لەوە دەکەین نابێت سیستمی حەلاڵ و حەرامی هێزێک لە هێزەکان، یان دینێک لە دینەکان، یان گرووپێک لە گرووپەکان، ببێت بە سیستمی حەلاڵ و حەرامی دەوڵەت و بەسەر کۆمەڵگەشدا بیسەپێنێت.

خاڵێکی دیکە، کە شایانی قسە لەسەرکردنە، ئەو هاوئاهەنگییە ئاسانەیە کە ئەم بەڕێزە لە نێوان ئیسلام و مافەکانی مرۆڤدا دروست یان پێشنیاری دەکات. بێگومان من خۆشحاڵم کە ئەم بەڕێزە ئەم تێگەیشتنەی بۆ ئیسلام هەیە و لە هەمان کاتیشدا باوەڕم بەوەیە کە دەکرێت دین، لەوانەش ئیسلام، بە جۆرێکی وا لێک بدرێتەوە، لەگەڵ سەلماندن و داننان بە مافەکانی مرۆڤدا یەک بگرێتەوە. بەلام دەبێت ئەو خاڵە لەیاد نەکەین، کە مەرجەعی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ، دین نییە، هیچ یەکێک لە دینەکان لەپشتی بەندەکانی ئەم تێکستە گرنگەی دونیای مۆدێرنەوە نین. مەرجەعی سەرەکیی ئەم تێکستە، مێژووی پڕ ململانێ و خەباتی بەردەوامی مرۆڤایەتییە لە سەدەی هەژدەهەمەوە تا دوای دووهەم جەنگی جیهانی. واتە مەرجەعی ئەم بەیاننامەیە ململانێکانی مێژووی هاوچەرخە، کە تێیدا مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی شێلگیر خەباتی بۆ چەسپاندن و زیادکردنی مافەکانی مرۆڤ کردووە، نەک تێکستە دینییە کۆنەکان. بێگومان دەکرێت لە تێکستە دینییەکاندا پرنسیپی تایبەت بدۆزینەوە بۆ ڕێزگرتن لە ژیان، وەک چۆن دەکرێت پرنسیپی دیکەش بدۆزینەوە دژ بە ژیان، بەلام لە هەموو دۆخێکدا ناتوانین لە تێکستە دینییەکاندا ئەو لۆژیکە ناوەکییە یەکگرتووە بدۆزینەوە، کە بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤی پێ نووسراوە. لۆژیکێک تێیدا ڕێز و ئازادی و مافەکانی ئینسان وەک تاکەکەسێکی سەربەخۆ، خاڵی سێنترالە.

بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ، تێکستێکی سیاسییە، کە لە جەنگێکی بەردەوامدا دژ بە سەرجەمی نایەکسانییەکانی دونیای مۆدێرن هاتووەتە کایەوە، لەوانەش جەنگ دژ بە دین. ئەو ڕۆحی یەکسانخوازی و مافپەروەری و یەکسانییەش کە ئەم بەیاننامەیە بەو کۆگیرییە و بێ ناکۆکی هەڵی گرتووە، لە هیچ یەکێک لە دینەکاندا بوونی نییە. جگە لەمانە دەتوانم هێما بۆ هەندێک بەندی بەیاننامەکە بکەم، کە نەک تەنها ئایینی ئیسلام، بەڵکوو هیچ دینێک لە دونیادا قبوڵی ناکات. بۆ نموونە یەکێک لە بەندە گرنگەکانی ئەو بەیاننامەیە باس لە ئازادیی ویژدان دەکات، لەوە ئەدوێت، مرۆڤ ئازادە لەوەدا دینی هەبێت، یان نەیبێت، ئازادە لەوەدا دینی خۆی بگۆڕێت، لە دینێکەوە بچێت بۆ دینێکی دیکە و لەوێشەوە بگوازێتەوە بۆ بێدینی. لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا، دینێک نادۆزینەوە ئەم بەندەی بەخۆشی خۆی قبوڵ کردبێت، ڕەنگە لێرەولەوێ، تاکەکەسی ئیماندار بدۆزینەوە ئەم مەسەلانە قبوڵ بکات، بەڵام دین وەک سیستم، وەک دەسەڵات و وەک مەرجەع، ئەمەی قبوڵ نەبووە و تا ئەمڕۆکەش لە بەشێکی گەورەی دونیادا، قبوڵی نییە. قبوڵکردنی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ، لە دونیای مۆدێرندا، پەیوەندیی بەو ڕێکەوتنە کۆمەڵایەتییە نوێیانەوە هەیە کە لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا هاتوونەتە کایەوە، ڕێکەوتن لەسەر سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی دونیا و کۆمەڵگە و ئینسان و خودا و دین. هەمووشیان بە ئاراستەی هەرچی زیاتر بە دیموکراسیکردنی موقەدەسە، بە شێوەیەک، موقەدەسی دینی، سەرجەمی موقەدەسەکانی دیکە بێدەنگ نەکات، هەقیقەتی دینی، هەقیقەتەکانی دیکە نەفی نەکات، حوکمە دینییەکان، سەرجەمی دید و بۆچوون و هەڵسوکەوت و ئاکارە نادینییەکان نەسڕنەوە.

لە ڕاستیدا کەسێک کە گوتی من مافەکانی مرۆڤم قبوڵە، مانای ئەوەی دیدێکی ڕێژەییی بۆ دین هەیە، دین وەک بەشێکی بچووکی دونیا دەبینێت

نەک وەک هەموو دونیا، وەک ئەگەرێک لە ئەگەرەکانی ئەخلاق تەماشای دەکات، نەک وەک هەموو ئەخلاق، وەک دیوێک لە دیوەکانی بوونی ئینسانی دەبینێت، نەک وەک هەموو دیوەکانی. لە هەمان کاتدا وەک ئاستێک یان ئەگەرێک لە ئەگەرەکانی هەقیقەت مامەڵەی دەکات، نەک هەموو هەقیقەت. لەپشتی ئەم دیدەشەوە بۆ دین و بۆ هەقیقەت، بازدانێکی گەورە هەیە بەسەر سەرجەمی ئەو سیستمی حەڵاڵ و حەرام و ئەشێ و ناشێ و فەرز و نافەرزانەی دین لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت. کە ئەمە دەڵێم، ئەمە مانای ئەوەی نییە کەسێکی دینی ناتوانێت ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ بگرێت، نا، دینیبوون دەکرێت دژ بە مافەکانی مرۆڤ نەبێت، بەڵام ئەم شێوازە لە تێگەیشتنی دینی لە دۆخێکدا دروست دەبێت، کە دینیبوون خۆی وەک دۆخێکی ڕێژەیی ببینێت، نەک وەک بەرنامەیەکی گشتی بۆ ژیان یان بۆ هەمووان، یان بۆ هەموو سەردەمەکان. هەر بەم مانایەشە دینێکی گونجاو لەگەڵ پێدراوە ئینسانییەکانی مۆدێرنەدا، جیاوازە لە دینێک لە دەرەوەی مۆدێرنەدا. دینی گونجاو لەگەڵ ڕووە گەشەکانی مۆدێرنەدا، مانای تواندنەوەی دین نییە لەناو بێدینیدا، یان لەناو دونیادا وەک کاک فاتح باسی دەکات، بەڵکوو دینێکە لە سنووری دیاریکراوی ئەگەر و ویست و داخوازییەکانی خۆی ئاگادارە، دینێکە ناچێتە بری کۆی بیروبۆچوون و ئەخلاق و وێناکردنە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی دی، دینێکە گونجاو لەگەڵ ئەو ڕۆحیەتی ڕێکەوتن و پەیوەندیکردن و گۆڕینەوەی ئەرگومێنت و ڕێژەییبوونەدا کە مۆدێرنە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. لێرەدا مەبەستم لە مۆدێرنە، ڕووە گەش و ئینسانی و دیموکراسی و یەکسانخوازی و مافپەروەرییەکەی مۆدێرنەیە، نەک ڕووە فاشی و نوخبەوی و نادیموکراسییەکەی. لە ڕاستیدا هەردوو دیوەکەی مۆدێرنەش دەکرێت لەگەڵ دیندا یەک بگرنەوە، واتە دین دەشێت ببێت بە بەشێک لە پرۆژەی فاشییەت، وەک چۆن دەکرێت بشبێت بە بەشێک لە پرۆژەی دیموکراسیەت.

بەم مانایە، دین هێزێک نییە هەمیشە و هەردەم ڕادیکاڵ و پەرگیر و نەفیکەر بێت، بە ناوی موتەعالییەوە خەتێکی ڕاست و چەپ بەسەر مۆدێرنە و عەلمانیەت و ڕۆشنگەریدا بهێنێت. خاڵێک لێرەدا بەلامەوە گرنگە جەختی لێ بکەم ئەوەیە، ئەو دینەی لەگەڵ مافەکانی مرۆڤدا تەبایە، ئەو دینە نییە کە ئەمڕۆ هێزە ئیسلامییەکان لە کوردستاندا کاری پێ دەکەن، جیاوازە لەو تێگەیشتنەی ئیسلامییەکان ئەمڕۆکە لە کوردستاندا بۆ دین هەیانە. بۆیە ئەوەی کاک فاتح دەیڵێت گوایە ئیسلامییەک وا دەڕوانێتە ئیسلام "کە لە بناغەدا ئایینی ئازادی و دادپەروەرییە و وەزیفەیەکی بەرفراوانی پێ دراوە، " پێدراوێک نییە مێژووی کۆن و مێژووی هاوچەرخی سیستمە سیاسییە دینییەکانی ناوچەکە و ئاکاری هێزە ئیسلامییەکان پاسادانی بکەن. وەک چۆن پێدراوێک نییە تێزە ئەخلاقی و کولتووری و فیکرییەکانی ئەو هێزە ئیسلامییانەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا ئامادەن، بیسەلمێنن.

یەکێک لە کێشە گەورەکانی هێز و ڕۆشنبیرە ئیسلامییەکان لەوەدایە، دەیانەوێت دین لە دەرکەوتەکانی دین لەناو مێژوودا جیا بکەنەوە، دەیانەوێت بە دین جەوهەرێکی پاک ببەخشن لە دەرەوەی شێوازی ئامادەگیی دین لە مێژوودا. ئەمە لە کاتێکدا، دین یەکسانە بە مێژووی دین، بە مێژووی ئامادەبوونی دین لەناو کۆمەڵگەکاندا، بە مێژووی تێگەیشتن و لێکدانەوەکانی ئینسان بۆ دین. تێکستە دینییە سەرەکییەکانیش کۆمەڵێک تێکستی بێ مێژوو نین، ئەوانیش مێژووی تایبەتی خۆیان هەیە و بڕێکی گەورەی ئەو نهێنی و شەفرە و مانایانەی هەڵیان گرتووە لەدایکبووی ئەو مێژووە تایبەتەن. بۆیە کارێکی نەکراو و ناڕاستە دین لە مێژووی دین دابڕین. مێژووی دینیش سەرەڕای ساتەوەختی کورت و کەمی پڕ جوانی و درەوشانەوە و ڕۆحانیەت، مێژوویەک نییە ئینسان هەست بە ئومێد و بەختەوەری بکات لە بەردەمیدا. مێژوویەک نییە حیکایەتی جوانترکردنی ژیان و پاکبوونەوەی ئینسانمان لە گوناه بۆ

بگێڕێتەوە. مێژووی ئیسلام نیشانمان دەدات کە شتێک بەناوی "دینی خالیس، " یان "دینی بێگەرد"ەوە بوونی نییە. ئیسلام بریتییە لە کۆی تێگەیشتنە جیاوازەکانی موسڵمانەکان بۆی، ئەم تێگەیشتنانەش ناکرێت لە ویست و ئارەزوو و تەماح و شوێن و جێی کۆمەڵایەتی و ڕەگەز و جنسی ئینسانەکان جیا بکرێنەوە. لە کوردستانی ئەمڕۆشدا چەندان تێگەیشتنی جیاواز بۆ دین هەیە، لە تێگەیشتنی فاشییانەوە بۆ دین، بۆ تێگەیشتنی نزیک بە دیموکراسیەت، وەک ئەو تێگەیشتنەی کاک فاتیح لە نووسینەکەیدا بەرجەستەی کردووە. لە ڕاستیدا تێگەیشتن لەم ڕاستییە، هەنگاوی یەکەمی تێگەیشتنە لەو ڕاستییەی کە ناکرێت سیاسەت بە ناوی ڕاستییەکی ڕەهاوە، بە ناوی موقەدەسێکی خوداییەوە، بە ناوی هەقیقەتێکی ئەفلاتوونییەوە، بکرێت. ئاگاداربوون لە ڕێژەییبوونی لێکدانەوە و تەفسیر و ڕاڤەکردنەکان، سەرەتای دروستکردنی دونیایەکە کە تێیدا ئارامی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی بەرجەستە ببێت.

لە بەشێکی دیکەی باسەکەیدا کاک فاتیح باس لە ترس لە عەلمانییەکان دەکات و ئەم ترسەش یەکسان دەکات بە ترس لە هێزگەلێک، کە دەسەلات قۆرخ دەکەن و پرۆژەی " بێدینکردنی کۆمەڵگە و نەهێڵانی ناسنامەی خود" یان پێیە. سەرەتا یەکسانکردنی عەلمانیەت بەو سیستمە دیکتاتۆریەتانەی لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا دونیای ئێمە بە خۆیەوە دیویەتی، لە باشترین دۆخدا، یەکسانکردنێکی ئایدیۆلۆژیی ناڕاستە. عەلمانیەت سەرچاوەی دیکتاتۆریەت نییە و نەبووە، سەدام حوسەین عەلمانیەت دروستی نەکرد، گوناهێکی فیکرییە ڕەگوڕیشەکانی بەعسیزم بە عەلمانیەتەوە گرێ بدەین. بەداخەوە من لێرەدا مەودای شیکردنەوەی تەواوی ئەم تێزەم نییە، بەلام هەر ئەوەندە دەڵێم، لەو ناوچەیەدا کە سەدام حوسەینی تێدا دروستبوو، چەندان دیکتاتۆریەتی تر دروستبوون، کە دیکتاتۆری دینی بوون، خومەینی نموونەیەکی ئاشکرایە. ڕەگەکانی

دیکتاتۆریەت پەیوەندیی بە کۆمەڵێک گۆڕانکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە هەیە، کە عەلمانیەت لێیان بەرپرسیار نییە. ئەو سیستمانەی لە ناوچەکەدا ئامادە بوون، سیستمی دەسەلاتگەربوون، بۆ بەخشینی رەوایەتیش بەم دەسەلاتگەرییە، جارێک پەنایان بردووەتە بەر ئایدیۆلۆژیا عەلمانییەکان و جارێکی دیکەش بەر دین. سەدام حوسەین باشترین نموونەی ئەو دیکتاتۆرانەیە کە سەردەمانێک خۆی وەک سۆسیالیست و سەردەمانێکی تر وەک موجاهیدێکی دینی نیشان دەدا.

ئەوەی لەم بۆچوونەی کاک فاتیحدا شوێنی سەرنجە، دیتنی ئەو رژێمە دیکتاتۆرییانە و لەوێشەوە دیتنی عەلمانیەتە وەک "پرۆژەی بێدینکردنی کۆمەڵگە و نەهێڵانی ناسنامەی خود." ئاشکرایە ئەم بۆچوونە لەسەر خوێندنەوەیەکی هەڵە و ئایدیۆلۆژیی ئەو رژێمانە دروست بووە کە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دروست بوون. کەمال ئەتاتوورکی لێ دەر چێت، هیچ دیکتاتۆرێکی دیکە لە ناوچەکەدا نەیویستووە کۆمەڵگە بێدین بکات، ئەتاتورکیش ئەوەندەی ویستوویەتی سنوورێک بۆ دین دابنێت، ئەوەندە لە هەوڵی بێدینکردنی کۆمەڵگەدا نەبوو. لە راستیدا ئەوەی لە پەیوەندیدا بە دینەوە لە ناوچەکەدا رووی داوە، رێک پێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەو بەڕێزەیە. لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا، واتە لە قۆناغی دوای کۆلۆنیالیزمدا، کۆمەڵێک دەوڵەتی دیکتاتۆری دروستبوون کە ئەفسەرەکانی سوپا دەیبردن بەڕێوە. کێشەی سەرەکیی ئەم رژێمانە لەگەڵ هێزە دیموکراس و چەپەکاندا بوو، نەک هێزە دینییەکان. بۆیە هاریکاریکردن و هێنانە پێشەوەی هێزە ئیسلامییەکان و بەخشینی شوێن و پێگەی تایبەت پێیان، بۆ لاوازکردنی هێزە چەپەکان، سیاسەتی سەرەکیی ئەو دەوڵەتە دیکتاتۆرییانە بوو. لە سادات و شای ئێرانەوە بیگرە، بۆ هاریکاریی ئیسرائیل بۆ دروستبوونی حەماسی شێخ یاسین دژ بە رێکخراوە چەپەکانی فەلەستین، لە سودانی سالانی هەشتاوە بیگرە

بۆ هاریکاریی ئیسلامییەکانی ئەفغانستان و ئەلقاعیدە لەلایەن ئەمریکا و بڕێکی زۆری دەوڵەتەکانی ناوچەکە. بە مانایەکی دیکە، بەدرێژاییی سەدەی بیستەم، سیاسەتی بێدینکردنی کۆمەڵگە لە هیچ شوێنێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پیادە نەکراوە، بەڵام لە هەمان کاتدا تا ڕۆژگارێکی درێژ سیاسەتی بە دینیکردنێکی ڕادیکاڵی ژیانی سیاسی و کولتووری و کۆمەلایەتیش پیادە نەکراوە. لە دوای شۆڕشی ئێرانیشەوە، هەم هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان و هەم دەوڵەتەکانی ناوچەکە، بوون بە هەڵگری گوتارێکی دینی و هەردووکیان بە شێوازی جیاواز خەریکی پرۆسەی بەدینیکردنێکی بەرفراوانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی بوون لە ناوچەکەدا. بۆیە ئەو بۆچوونەی گوایە هێزگەلێک هەبوون لەم ناوچەیەدا ویستوویانە کۆمەڵگە بێدین بکەن، تێزێکی هێجگار ناڕاستە و بەشێکە لەو حیکایەتە ئایدیۆلۆژییەی هێزە ئیسلامییەکان بۆ مەبەستی سیاسی و ئایدیۆلۆژی دەیگێڕنەوە. ئەو هەڵئاوسان و قەبەبوونە دینییە گەورەیەی ئەمڕۆکە لە ناوچەکەدا هەیە، دەرەنجامی سیاسەتێکی دووروودرێژی بەدینیکردنێکی بەرفراوانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتوورییە، نەک بێدینکردنی کۆمەڵگە.

دواهەمین خاڵ کە بمەوێت بەکورتی لێی بدوێم، یەکسانکردنی ئەم هەڵئاوسانە دینییەیە بە "ناسنامەی خود" و بە ڕەسەنایەتی و بە گەڕانەوە بۆ ئەسڵ و فەسڵ و ڕیشە و ڕەچەڵەک. من یەکێکم لەو نووسەرانەی کورد کە گومانێکی گەورەم بەرامبەر ئەم گوتاری ڕەسەنایەتی و خۆماڵیبوون و شووناسە خودییە هەیە. بە بۆچوونی من، یەکێک لە هۆکارە هەرە گرنگەکانی ئەو هەڵئاوسانە دینییەی لەدوای شۆڕشی ئێرانییەوە لە ناوچەکەدا دروست بووە، پەیوەندیی بە دۆلارەکانی نەوتی سعودیە و بە دۆلارەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاوە هەیە، پەیوەندیی بە ململانێی ناوچەیی نێوان سعودیە و ئێرانەوە هەیە بۆ پەیداکردنی هەیمەنە

لە ناوچەکەدا، پەیوەندیی بە ستراتیژیەتەکانی جەنگی ساردەوە هەیە، نەک بە گەڕانەوە بۆ زات و بۆ ڕەگوڕیشە و بۆ تێکستە خۆماڵی و ڕەسەنەکان. لەمانەش بترازێت، هەموو ئەوانەی باسی "شووناسی خود" و باس لە "ڕەسەنایەتی" و باس لە "پاراستنی" دینی کۆمەڵگەیان کردووە، ئەوانەن کە لەسەر داخرانی شووناس و دروستکردنی دوژمن و سازدانی ناکۆکییەکی جەوهەری لەنێوان خود و ئەوی دیدا کاریان کردووە. ئەمانە هێزگەلێکن تا ئەمڕۆ جگە لە مۆدێلەکانی خومەینی و سعودیە و سودان و ئەفغانستان... هتد. شتێکی دیکەیان پێشکەش نەکردووە. هەموو ئەو ناکۆکی و جیاوازییە جەوهەرییانەش ئەم هێزانە لەنێوان مەسیحیەت و ئیسلام و لەنێوان "کولتووری ڕۆژهەلات" و "کولتووری ڕۆژئاوادا" پێشنیاری دەکەن، بە ئاراستەی بەهێزکردنی گوتارێکی پەرگیر لەسەر ڕەسەنایەتی و هەڵئاوسانی حەماسەتی دینی و داخران بە ڕووی دونیای دەرەوەدا، کاری کردووە و کار دەکات.

خاڵێکی دیکەی ئەم گوتاری خۆماڵیبوونە، ئەو باسکردنە بەردەوامەی مەترسیی "لەیەکترازانی کۆمەڵگە" و "هەڵوەشاندنەوەی" جومگەکانی و "پووکانەوەی" سیستمی بەهاکانە، گوتارێک کە لەسەر بەرهەمهێنانی ترسێکی ناواقیعی و فووتێکراو دروستبووە بە مەبەستی نیشاندانی دین وەک ئەو هێزە سیحرییەی کە گوایە دەیەوێ و دەتوانێت بەر بەم لێکترازان و لەناوچوون و هەڵوەشاندنەوە سەرتاسەرییە بگرێت. لە ڕاستیدا ئەم تێزە یەکێکە لە تێزە هەرە ناڕاست و لە هەمان کاتدا لە هەرە لاوازەکانی ئیسلامی سیاسی. بە بۆچوونی من، دوو پاڵنەر لە پشتی ئەم تێزە ناڕاستەوە ئامادەیە. یەکەمیان پاڵنەرێکی سیاسییە کە بە هۆیەوە ئیسلامییەکان خۆیان وەک پاڵەوان و ڕزگارکەری کۆمەڵگە لە پووکانەوە و لە لەبەریەکترازان و لە هەڵوەشاندنەوە نیشان دەدەن. دووهەمیان فۆبیایەکی کولتوورییە و بە قسەی قوتابخانەی شیکردنەوەی

دەروونـی، دەربـڕی جۆرێکـی تایبەتـە لـە عوسـابی دەسـتەجەمعی. لـە هەمـوو مێژووی هاوچەرخدا نموونـەی کۆمەڵگەیـەک نادۆزینـەوە لەبەریـەک ترازابێـت، یـان هەڵوەشـابێتەوە، وەک چـۆن کۆمەڵگەیـەک نادۆزینـەوە سیسـتمێکی ئەخلاقـی و بەهاییـی نەبێـت، کـە پەیوەندیـی ناوەکـی ئینسـانەکانی لەگـەڵ یەکدا ڕێـک بخـات، جـا گرنـگ نییـە ئـەو سیسـتمە لەسـەر دیـن بینـا کـراوە، یـان لەسـەر پرنسـیپی و تێگەیشـتنی نادینـی. لەمانـەش بترازێـت، کۆمەڵگـە لەبەریـەک ناترازێـت و هەڵناوەشـێتەوە، کـەس ناتوانێـت نموونـەی کۆمەڵگەیەکمـان بداتـێ لەبەریـەک هەڵوەشـابێتەوە، کۆمەڵگـە دەگۆڕێـت و تـازە دەبێتـەوە. ترسـی لێکتـرازان و هەڵوەشـاندنەوەی کۆمەڵگـە، ترسـێکی دروسـتکراوە و دوورە لـە سـادەترین پێدراوی سۆسـۆلۆژی و زانسـتییەوە، ئـەوەی هەڵدەوەشـێتەوە و لەبەریـەک دەترازێـت، دەوڵەتـە، نـەک کۆمەڵگـە. دەوڵەتـە پارچەپارچـە دەبێـت بـۆ کۆمەڵگـە و نەتـەوە و ئەتنیەتـی جیـاواز. دینیـش بـەو هەمـوو هێـزە سـیحرییەوە کـە ئیسـلامیەکان پێـی دەبەخشـن، نەیتوانیـوە ڕێ لـە هەڵوەشـاندنەوەی دەوڵەتـان بگرێـت. کـە پاکسـتان لەسـەر بنەمـای ئیسـلامبوون لـە هینـد جیـا بـووەوە، ئیسـلام نەیتوانـی ڕێ لـەوە بگرێـت، پاکسـتان خۆشـی دابـەش نەبێـت و دەوڵەتـی بەنگلادیشـی لـێ جیـا نەبێتـەوە، کـە ئیسـلام دینـی ڕەسـمیی ئەویـش بـوو.

لـە کۆتاییـدا هیـوادارم ئیسـلامییەکان لـەو ڕاسـتییە سـادەیە تێبگـەن کـە چـۆن دیـن بـەردەوام بەشـێک بـووە لـە پێکهاتـەی کۆمەڵگـە جیاوازەکان، بـە هەمـان شـێوە بێدینییـش بەبەردەوامـی بەشـێک بـووە لـە ژیانـی کۆمەڵگەکان. چارەسـەری کێشـەکانی کۆمەڵگـەش بـەوە نابێـت دیـن بچێتـە شـوێنی بێدینـی، دینییـەکان بێدینـەکان بێدەنـگ کـەن، حوکمەکانـی دیـن بچێتـە شـوێنی حوکمـە نادینییـەکان... هتـد. بێگومـان ئەمـە بـۆ پێچەوانەکەشـی هـەر ڕاسـتە. هەنـگاوی یەکەمـی هـەر چارەسـەرێکی ڕاسـتەقینە لەوێـوە دەسـت پـێ دەکات، پەیمانێـک ببەسـترێت کـە تێیـدا هـەر هێزێـک لـە هێزەکان ئامـادە بێـت لـە بڕێکـی زۆری

موقەدەسـە تایبەتەکانی خۆی دابەزێت، پێکهاتـەی موقەدەسـی خـۆی بکاتـە پێکهاتەیـەک بـۆ قسەلەسـەرکردن و پیاچوونـەوە و گـۆڕان و تەنانـەت وازلێهێنـان. واتـە ئـەوەی پێویسـتە، سیاسـەتێکی دیکـەی بەرهەمهێنـان و پیادەکردنـی موقەدەسـە کـە تیایـدا هـەر هێزێـک لـە دۆخـی گفتوگـۆ و دانوسـانێکی بەردەوامـدا بێت لەسـەر دەستنیشـانکردنی ماناکانـی موقەدەسـی خـۆی و موقەدەسـی ئەوانـی دی. ئەمـەش مەحاڵـە دروسـت ببێت، گـەر هـەم دیـن و هـەم نادیـن لـە ڕێژەییبوونـی خۆیـان تێنەگـەن، هیـچ یەکێکیـان بـە نـاوی هەمـوو نەتـەوە و هەمـوو کۆمەڵگـە و هەمـوو ڕەسـەنایەتی و هەمـوو شـووناس و هەمـوو بـاوەڕ و هەمـوو ئەخلاقـەوە قسـە نـەکات و داواکارییـە سیاسییەکانی خۆی ڕێژەییتر و سـنووردارتر و سـەرزەمینیتر و شـەرمنانەتر بـکات. واتـە داواکارییەکانـی بکاتـە داواکاریـی عەلمانیانـە. بەعەلمانیبوونـی دیـن، مانـای تواندنـەوە و کۆتاییهاتنـی دیـن نییـە لەنـاو مۆدێرنـەدا، بەڵکـوو مانـای بەسـەرزەمینیبوون و بەئینسـانیبوون و بەدیموکراسـیبوونی دینـە.

# دین و سیاسەت و ڕۆحانیەت
# لە کۆمەڵگەی کوردیی ئەمڕۆدا

## چاوپێکەوتن لەگەڵ تەلەڤیزۆنی KNN دا.

**- چۆن خوێندنەوە دەکەیت بۆ پێگەی دین لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا؟**

لە ڕاستیدا دین لەمڕۆکەی کۆمەڵگەی ئێمەدا، شوێنێکی ئاڵۆزی هەیە، لە زیاد لە ئاستێکدا ئامادەیە و لە زیاد لە کایەیەکیشدا ئیش دەکات، هەروەها زیاد لە وەزیفەیەکیش دەبینێت. بۆ نموونە، دینمان هەیە بەتەواوەتی دینێکی سیاسییە و ڕۆڵێکی سیاسی و ئایدۆلۆجی دەبینێت، بەشێکە لە پێکهاتەی کۆمەڵێک ڕێکخراو و حیزبی سیاسی، واتە دینێکی ڕێکخراوە، بەڵام دینیشمان هەیە دینی خەڵکی سەرجادەیە، دینی ئینسانە سادەکانی کۆمەڵگەی ئێمەیە، دینی دایک و باوک و کەسوکار و خزم و دراوسێکانی ئێمەیە. ئەم شێوە دینە، دینێکی میللییە و زیاتر لەسەر گرنگیدان بە هاریکاریکردنی یەکتری و بەدەنگەوەچوون و گەرمکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کار دەکات. شێوازێکی دیکەی دینمان هەیە، پەیوەندیی بە مەسەلەی ڕۆح و ڕۆحانیەتەوە هەیە، ئەم شێوازی دینە لە هەندێک دەقی شیعریدا، یاخود لە هەندێک بزووتنەوەی سۆفی و لە

هەندێک ئەخلاقی تاکەکەسی تایبەتدا ڕەنگی داوەتەوە. واتە کەسانێک هەن دین وەکوو ڕەهەندێکی ڕۆحی دەبینن، وەکوو پەیوەندییەک دەبینن، کە ئینسان بە دەرەوەی بوونی تایبەتی خۆیەوە، ئینسان بە نادیارەوە، بەو شتانەی کە دەکەونە دەرەوەی دنیاوە، گرێ دەدات. شێوازی تری ئامادەگیی دینمان هەیە شێوازێکی سیاسی نییە، ئەگەرچی دینێکی ڕێکخراوە لە فۆرمی بزووتنەوە یان ڕێکخراوی دینی سەر بە تەریقەتێکی دیاریکراو، یان سەر بە کۆمەڵێک کەسایەتی دینی جیاواز. بەکورتی ئەمڕۆ، کە باس لە دین دەکەین، لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، ناکرێت تەنها باس لە یەک شێواز لە دین بکەین، شێوازەکانی ئامادەگیی دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا جیاوازە، ماناکانی ئامادەبوونیان جیاوازە و هێزی جیاوازیش هەڵی گرتوون و کاری پێ دەکەن لە کۆمەڵگەی ئێمەدا.

**- بە جیاوازی ئەم ئاراستانە کە دین ئیشیان تیا دەکات، هەست دەکەیت ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگەی کوردیدا بە چ ئاڕاستەیەکدا دەڕوات، بە لەبەرچاوگرتنی زۆربەی ئەو بوارانەی کە باست کرد، بۆ نموونە لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا، تەنانەت لە ئاستی ناسیۆنالیستی و کوردبوون، یاخود شۆڕشگێڕیدا؟ وەک ئاشکرایە زۆرجار دین ڕۆڵی هەبووە، بە درێژاییی مێژووی شۆڕشەکان، ڕۆڵی دین لەم ئاستە جیاوازانەدا چۆن دەبینیت؟**

ڕۆڵی سیاسیی دین، ڕۆڵێکە ڕۆژگارێکی درێژە لە دونیای ئێمەدا ئامادەیە، واتە دەکەوێتە بەر لە دروستبوونی ئیسلامی سیاسییەوە. بە بۆچوونی من، ڕۆڵی سیاسیی دین، بە شێوەیەکی ئاشکرا لە سەردەمی حاجی قادری کۆییەوە دەست پێ دەکات، ڕۆڵێک جیاواز لە ڕۆڵەکانی دین لە قۆناغەکانی پێشتردا. لەو سەردەمەوە دین لە مێژوی ئێمەدا ڕۆڵێکی

ڕاستەوخۆ دەبینێت لە دروستبوونی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردیدا. بێگومان بەو مانایە نا کە دین بزووتنەوەکە دروست دەکات، بەڵکوو بە مانای بوونی بە بەشێک لە بزووتنەوەکە. بۆ نموونە دین کۆمەڵێک چەمکی گرنگ بە مەسەلەی نەتەوایەتی دەبەخشێت، لە چەمکی فیداکاری و شەهیدبوونەوە بیگرە بۆ چەمکی خۆشویستنی نیشتیمان، چەمکی خۆشویستنی نیشتیمان (حب الوطن من الأمان) لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەبێت بە یەکێک لە چەمکە هەرە گرنگەکانی فیکری ناسیۆنالیستی کوردی و عەرەبی و فارسی و نەتەوەکانی تری ئەم ناوچەیە. واتە دین لە ئاستی بەخشینی کۆمەڵێک چەمک و پێناس و وێنەدا بە ناسیۆنالیزم دەورێکی گرنگی بینیوە. لە ئاستی ڕێکخراویشدا، ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە. گەر تەماشای سەرکردە دینییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بکەین، دەبینین بۆ نموونە لە شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییەوە بیگرە، بۆ دواتر لە سەدەی بیستەمدا لای کەسێکی وەک شێخ مەحمود و دواتریش لای یەکێکی وەکوو بارزانی، ئەو بونیادە دینییە ڕێکخراوەی کە هەبووە، ئەو هەموو مزگەوتە زۆرەی لە کوردستاندا هەبووە، بوونی تۆڕێکی بەرفراوانی پەیوەندیکردن لە نێوان شێخەکان و موریدەکانیان لە ناوچە جیاوازەکاندا، وەک جۆرێک لە ڕێکخراو بۆ کارئاسانی ئەم بزووتنەوەیە بەکار هاتووە. واتە دین توانیویەتی فۆرمە ڕێکخراوەییەکەی خۆی بەکار بهێنێت و تەرجەمە بکات بۆ فۆرمی سیاسی، ئەو دەزگا دینییانەی کە لە بنەڕەتدا ڕۆڵێکی دینییان بینیوە، توانراوە بەکار بهێنرێن بۆ کۆکردنەوەی خەڵک و چەکدار کردنیان و جۆشدانیان بۆ بەشداربوون لە بزوتنەوەکەدا. ئاستی سێهەمی ئامادەگی دین لەناو بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی ئێمەدا ڕەنگە بریتی بێت لە سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی هەندێک چەمکی دینی بە جۆرێک، بتوانێت ببێت بە سەرچاوە بۆ دروستبوونی چالاکیی سیاسی. بۆ نموونە چەمکی غەدر، یان زوڵم، یان مەزڵوم، کاتێک گوترا میللەتی ئێمە

مەزڵومە، غەدری لێ کراوە، ئەمانە بە مانای سیاسیی تازەبەکارهاتوون. لە کاتێکدا چەمکەکانی غەدر و زوڵم و مەزڵوم چەمکی دینین و زۆربەیان لەناو کەلەپووری سۆفیزمەوە هاتوون. بەشێکی تریان لەناو کەلەپووری تەقلیدیی دین خۆیەوە هاتوون، بەڵام ئەم چەمکانە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، سەرلەنوێ پێناوسە کراونەتەوە و مانای نەتەوەیی و سیاسییان پێ بەخشراوە.

- تەنانەت شەهیدبوونیش وابەستەیەکی گەورەیە بە ڕۆحی دینەوە؟

چەمکی شەهید، یەکێکە لە چەمکە هەرە ئاڵۆزەکانی ناو فیکری دینی، بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، واتە لە حاجی قادری کۆیی بەدواوە، ئەم چەمکە سەرلەنوێ پێناسە دەکرێتەوە و لە مانا دینییە تەقلیدییەکەی خۆی دەر دەکرێت. شەهید، بە مانا ئیسلامییە کۆنەکەی زۆر شت دەگەیەنێت، یەکێک لە سەفەردا مردبێت شەهیدە، ئافرەتێک شووی نەکردبێت و مردبێت شەهیدە، کەسێک لە غەریبیدا بمرێت شەهیدە، کەسێک لە کاتی گەڕان بەدوای زانین و فێربووندا مردبێت شەهیدە، کەسێک لە دەریایەکدا نوقبوم بووبێت و خنکابێت شەهیدە، کەسێک خانوویەک بەسەریا ڕووخابێت، کەسێک بە دەردێکی خراپ مردبێت شەهیدە. شەهید ئەم هەموو جۆرە جیاوازانەی مردنی گرتووەتەوە کە زۆربەیان هیچ پەیوەندییەکیان بە مەسەلەی جەنگ و شەڕ و گیانفیداییەوە لەپێناوی دین و خودادا نییە. بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، فیکرەی شەهیدبوون ڕاستەوخۆ دەبەسترێتەوە بە گیانبەخشین لەپێناوی نیشتیماندا، گیانبەخشین لەپێناوی نەتەوەدا. دواتر لەلایەن ڕەوت و ئایدیۆلۆجیا عەلمانییەکانەوە دەبێت بە گیانبەخشین لەپێناوی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراودا، بۆ نموونە گیانبەخشین بۆ پارتی

کۆمۆنیستی عێراق، یان گیانبەخشین بۆ ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم، بۆ سۆسیالیزم یان بۆ لیبڕالیزم. هەموو ئەم ئایدیۆلۆژیا و بزووتنەوە تازانە ئەم چەمکە دینییە وەر دەگرن و کۆمەڵێک ئەرکی نوێی پێ دەبەخشن، لەناو کۆمەڵێک پێدراوی ئایدۆلۆجیی تازەدا. لەبیرمان نەچێت گەورەترین شەهیدی پەنجا ساڵی یەکەمی مێژووی عێراق بریتییە لە فەهد، کە سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی عێراقی بوو.

دەمەوێت بڵێم، رۆڵی دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، ڕۆڵێکی ئاڵۆزە. وەک باسیشم کرد، لە زۆر ئاستدا ئامادەیە. گەر هەر لە سەدەی نۆزدەهەمدا بمێنینەوە، دەبینین ئێمە لە کاتێکدا حاجی قادری کۆییمان هەیە کە بە مانایەک لە ماناکان دین دەکات بە دینێکی سیاسی، دین دەکات بە دینێکی ئەکتیڤیستی، واتا دەیکات بە دینێک، کە چالاکەوانی سیاسیی و کۆمەڵایەتی دروست دەکات، دینێک، خەڵکانێک دروست دەکات لەپێناوی نەتەوەدا شەڕ بکەن، دەبینین لە هەمان کاتدا شێوازێکی دیکەی دینمان هەیە لای شاعیرێکی گەورەی وەک مەحوی. دین لای مەحوی مانای سیاسی و ئەکتیڤیستیی نییە، بەڵکوو دەربڕی پەیوەندیی نێوان ئینسان و خوداوەندە. دین وەک هێما بۆ ئامادەگی ڕۆحانیەتێکی قووڵ و وەک دەربڕی ڕەهەندێکی ڕۆحیی یەکجار گرنگ ئامادەیە، واتە دین وەک ڕەهەندێک بۆ دەوڵەمەندکردنی ژیانی ڕۆحی ئامادەیە، دین بریتییە لە ئامرازێک بۆ ئیشکردنی ئینسان لەسەر زاتی خۆی و قوڵکردنەوە و دەوڵەمەندکردنی ئەم زاتە. بەکورتی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، لە ئەدەبیاتی ئێمەدا، لەناو سیاسەتی ئێمەدا، شێوازی جیاوازی ئامادەگیی دین هەبووە. ئەم شێوازە جیاوازانەی ئامادەگیی دین، بەرەو ئەوەمان دەبات ئەو تێزە عەلمانییەی کە پێی وایە دین لە دونیای مۆدێرندا ڕۆڵی کۆمەڵایەتی نامێنێت، یان ڕۆڵی سیاسی نابینێت، وەک تێزێکی لاواز، ببینین.

١

**- کە باس لە مەسـەلەی شـەهیدبوون، یاخود ئـەم ڕۆڵانـەی دین دەکەین، دەکرێت چەمکی ئیرادە زۆر بەقوولـی بێتە نـاوەوە، ڕەنگە تـا ڕادەیەکیش بتەوێت پراکتیکی بکەیت سـەبارەت بـەم دۆخـەی ئێسـتا، تێگەیشـتن لـە ئاسـتی ئیسـلامیِ سیاسـیدا تەنانـەت بۆ چەمکـی شـەهیدبوون خۆشـی، لەوانەیـە تووشـی ئیشـکالی گەورەمـان بـکات، پەیوەندیـی نێـوان دیـن و ئیـرادە چۆنـە لای تـۆ؟**

پەیوەندیی نێوان دین و ئیرادە پەیوەندییەکی ئاڵۆزە، فۆرمێک لـە دین هەیە لەسـەر نەفیکردنی ئیرادەی ئینسـان دەژی، ئەم فۆرمـە لـە دین پێمـان دەڵێت ئەوەی ئینسـان دەیکات، شتێکە پێشـوەخت بۆی نووسـراوە، ئینسـان بوونەوەرێکە لـەو ڕۆژەوەی لەدایک دەبێت، لەسـەر شـانی نووسـراوە چـی بـکات و چـی نـەکات، چاکـە بـکات یـان خراپـە بـکات، بـەرەو کـوێ بـڕوات، کـەی بمرێـت و چەنـد بـژی، تووشـی کام نەخۆشـی ببێـت، چـی فێـر بێـت یـان چـی فێـر نەبێت. واتـە جۆرێـک لـە دیـن، یـان تێڕوانینێـک بەرامبـەر بـە دیـن هەیـە وا وێنـای ئینسـان دەکات وەک ئـەوەی بوونـەوەرێکـی بێئیـرادە بێت، وا دەکات ئیرادەی ئینسـان لەنـاو ببات، ئینسـان دەکاتـە بوونەوەرێکـی تەسلیمبوو بـە هێزێکی نادیـار. بێگومـان ئەوانـەی کـە تەفسـیری ئـەم هێـزە دەکـەن، هەمیشـە ئـەو هێـزە وەک خوداوەنـد وێنـا دەکـەن، بـەم مانایـە، ئـەوان ئینسـان دەکـەن بـە کۆیلـەی خوداوەنـد، یـان کۆیلـەی هـەر هێزێکـی دیکـە کـە لـە دەرەوەی ئیـرادەی ئینسـاندا بێـت و زۆرجـار بـە نـاوی خوداوەنـدەوە قسـە بـکات. بـەڵام هـەر لەنـاو فیکـری دینـی خۆیـدا ئاراسـتەیەکی دیکـە هەیـە، بـاس لـەوە دەکات ئینسـان بوونـەوەرێکـی ئیرادەگـەرە و دیـن بەشـێکی چالاکـە لـە ئیرادەی ئینسـان، لـەم دیدەدا دیـن ئامڕازێکـە یارمەتیـی ئینسـان ئـەدات لـە دونیـا تێبگـات، لـە خـۆی تێبـگات، لـە عەقڵـی خـۆی و لـە تواناکانـی خـۆی بـۆ دروسـتکردنی دونیـای دەوروبـەری تێبـگات، لـە وەزیفـەی خـۆی

و لـه بەشـداربوون لـە سـەرلەنوێ پێناسـەکردنەوەی دونیـا و سـەرلەنوێ دروسـتکردنەوەیدا تێبـگات. بۆیـە ناتوانیـن یـەک وەڵامـمـان هەبێـت بـۆ پرسـیارەکەی ئێوە کـە دەپرسـێت، ئایـا دیـن چ تێڕوانینێکـی بەرامبـەر بـە ئیرادەی ئینسـان هەیـە؟ وەکـوو وتـم، دوو هێڵـی سـەرەکی لەنـاو فیکـری دینیدا هـەن، یەکێکیـان ئینسـان وەک بوونەوەرێکی ئیرادەگـەر دەبینێت، ئەوی دیکەیـان وەکوو بوونەوەرێکی تەسلیمبوو، یـان وەک کۆیلـەی خوداوەند یان ئەوانـەی بـە نـاوی خوداوەنـدەوە قسـە دەکـەن، یان وەک کۆیلـەی هێزێکـی دەرەوەی سروشـت، دەرەوەی مێـژوو. لەنێـوان ئـەم دوو ئاڕاستەیەشـدا بێگومـان چەنـدان ئاڕاسـتەی تـر هەیـە، کـە هەریەکێکیـان بـە ڕادەیـەک لـە ڕادەکان لـەم ئاراسـتەیان، یـان لـەوی تریـان نزیکـە. کـە دەشـێت ئینسـان وەکوو بوونەوەرێک ببینـن، نیوەی کۆیلـە و نیوەی ئیرادەگـەر، لە بەشـێک لـە کردەوەکانیدا کۆیلـە، بـەڵام لـە بەشـێک لـە کردەوەکانـی تریدا ئیرادەگـەر. ئـەوەی گرنگـە بیزانیـن ئەوەیـە، کـە ئـەم تێڕوانینـە دینییـە بـۆ وێناکردنـی ئینسـان چ وەک کۆیلـە، یـان وەک بوونەوەرێکـی ئیرادەگـەر، لـە قۆناغەکانـی دواتردا کە ئایدیۆلۆژیا عەلمانییە گـەورەکان دێن، بە هەمان شێوە دووبارە دەبێتـەوە. بـۆ نموونـە لەنـاو مارکسـیزمدا ئێمـە دەکەوینـە بەردەمـی هەمـان کێشـە. تەفسـیرێکی مارکسـیزم هەیـە ئینسـان وەکـوو کۆیلـەی مێژوو وێنـا دەکات، پێـی وایـە ئینسـان لەسـەر مێژوو ئیش بـکات، یـان نـەکات، چـالاک بێت یـان نـا، مێژوو بۆخۆی بـەرەو مەنزڵگا و شوێنێکی دیاریکراو دەڕوات، کە تیایدا کۆتاییهاتنی دەوڵـەت و کۆتاییهاتنی چەوسانەوە و دروستبوونی کۆمەڵگەیەکـی بـێ کێشـە و بـێ ململانـێ و بـێ توندوتیـژی دێتـە کایـەوە. بـەڵام لـە هەمـان کاتدا ئێمـە تەفسـیرێکی لینینیانـەی مارکسـیزممان هەیـە کـە بـاس لـەوە دەکات ئینسـان خـۆی دەبێت لەسـەر واقیـع کار بـکات و خـۆی مێـژوو بگۆڕێـت. نـەک هـەر ئـەوە، لینیـن پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگرێـت، بـۆ ئـەوەی مێژوو بگۆڕێت، دەبێت نوخبەیەکی شۆڕشگێڕ و پێشڕەو دروست

ببێت، خاوەنی وشیارییەک بن جیاواز لە وشیاریی خەڵکی سادە، واتە خاوەنی وشیارییەکی شۆڕشگێڕ بن. لە دیدە لینینییەکەدا ئەم وشیارییە شۆڕشگێڕە، وشیارییەکە تەبایە لەگەڵ جووڵەی مێژوودا، وشیارییەکە دەزانێت مێژوو بەرەو کوێ دەچێت و گۆڕانەکان بەرەو ئەو شوێنە ئاراستە دەکات. لای لینین ئەم وشیارییە لە ڕێگەی حیزبی سیاسییەوە، لە ڕێگەی ڕێکخراوی سیاسییەوە، لە ڕێگەی ڕۆژنامەوە جارێکی دیکە بە خەڵک، یان بە کۆمەڵگە دەبەخشرێتەوە. ئەمەش وا دەکات خەڵک ببێتە بوونەوەرێکی سیاسیی ئیرادەگەر و شۆڕشگێڕ. بەکورتی، لەم دیدە لینینییەدا کۆمەڵگە لە ڕێگەی ئەوانەی کە پێشڕەوی کۆمەڵگەن، کە پێشڕەوی سیاسی و پێشڕەوی فیکرین، کۆمەڵێک دید و فیکر و بیروبۆچوونی شۆڕشگێڕانە بەرهەم دەهێنرێن و دەدرێنەوە بە کۆمەڵگە. لەڕێگەی ئەم شتانەوە دەکرێت ئینسانە سادەکان ببن بە ئینسانی ئیرادەگەر. مەبەستم لەوەیە بڵێم تێڕوانینە دینییەکە، کە ئینسان، یان وەک ئینسانێکی تەسلیمبوو و یان ئینسانێکی ئیرادەگەر دەبینێت، لەناو ئایدیۆلۆژییە عەلمانییەکانیشدا بە هەمان شێوە ئامادەیە. دین یان فیکری دینی، بە شێوەیەک لە شێوەکان، لەناو ئایدیۆلۆژیا عەلمانییە سەرزەمینییەکانیشدا ئامادەیە. بە هەمان شێوە لەدوای دروستبوونی ئایدیۆلۆژیا عەلمانییەکانەوە، لەدوای ئەوەی دیدی عەلمانییانە دەبێت بە فیکر و خەڵک پێیان ئاشنا دەبێت و ڕۆشنبیرە دینییەکانیش دەیانخوێننەوە، ئەم ئایدیۆلۆژیا عەلمانییانەش کاریگەریی گەورە لەسەر ئەوەی ئینسانە دینییەکان چۆن تەماشای دین دەکەن، بەجێ دەهێڵن. بۆ نموونە لە دوای ئاشنابوونی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ، دوای ئاشنابوون بەوەی کە مرۆڤەکان، دیندار و بێدین یەکسانن، نێر و مێ یەکسانن و هەمان بەها و نرخیان هەیە، هەمان ئازادییان هەیە و هەمان هەڵسەنگاندنیان بۆ دەکرێت، ئەم شێوە تێڕوانینە وادەکات هەندێک لە ئینسانە دینییەکان، ئایین بە

شێوەیەک سەرلەنوێ لێک بدەنەوە کە باس لە یەکسانی نێوان نێر و مێ بکات، باس لە یەکسانی نێوان دیندار و بێدین بکات. مەبەستم لەوەیە کاریگەرییەکان کاریگەریی دوو لایەنەن. لە سەرێکەوە دین کاریگەریی هەبووە و هەیە لەسەر بەرهەمهێنانی ئایدیۆلۆژیا عەلمانییە گەورەکان لە دنیادا...

- بە پێچەوانەشەوە هەندێکجار ئایدیۆلۆژیاکانیش خەسڵەتی دین وەر دەگرن؟

بێگومان ئەوە ڕاستە، ئایدیۆلۆژیاکانیش خەسڵەتی دین وەر دەگرن، بەڵام لە هەمان کاتدا، ئایدیۆلۆژیاکانیش جارێکی دیکە کاریگەری لەسەر فیکری دینی بەجێ دەهێڵن و وا لە فیکری دینی دەکەن بگۆڕێت و بەشێوازێکی دیکە ئامادە بێت. بۆ نموونە تیۆرەی حیزبی لینینی، کە ئێستا باسم کرد و تیایدا پێویستە گروپێکی پێشڕەو هەبێت لە ڕێگای ڕۆژنامەوە، لە ڕێگەی دروستکردنی حیزبەوە، دەست بکەن بە پرۆسەی بە شۆڕشگێڕکردنی خەڵکی سادەی ناو کۆمەڵگە و هەوڵ بدەن لە ڕێگەی ئەو خەڵکە سادەیەوە مێژوو و کۆمەڵگە بگۆڕن. دەڵێم ئەم تێڕوانینە لینینیە بۆ گۆڕان و تازەبوونەوە، گواستراوەتەوە بۆلای کۆمەڵێک لە تیۆریستە بەناوبانگەکانی ئیسلامی سیاسی لە سەدەی بیستەمدا، بۆ نموونە بۆ لای سەید قوتب. لای سەید قوتب، بۆ ئەوەی ئیسلام جارێکی دیکە ببێتەوە بە ئیسلامی ڕاستەقینە و کۆمەڵگەش ببێتەوە بە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی ڕاستەقینە، باس لەوە دەکات دەبێت نوخبەیەکی ئیسلامی پێشڕەو دروست ببێت، سەرکردایەتی ئەم کارە بکات. ئەم نوخبەیە پێویستە سەرەتا خۆی لە کۆمەڵگە داببڕێت، خۆی ڕێک بخات، خۆی پەروەردە بکات، دوای ئەوە هەوڵ بدات کۆمەڵگە بگۆڕێت، هەوڵبدات ئەو ئیسلامەی ئەم نوخبەیە

بەرهەمی هێناوە بداتەوە بە کۆمەڵگە. ئاشکرایە، سەید قوتب ئیسلامی باڵادەست لەناو کۆمەڵگەدا بە ئیسلامێکی هەڵە، یان بە شێوەیەکی تازە و هاوچەرخی جاهیلیەت دەزانێت. گەر لەم گۆشەنیگایەوە تەماشا بکەین، دەبینین هەموو پرۆژەکەی سەید قوتب پرۆژەیەکی لینینییە. گرنگترین کتێبی سەید قوتب خۆشی کە (معالم فی الطریق)ە زۆر بەئاسانی دەتوانین برگە بە برگە و بەش بە بەشی بە کتێبی (ما العمل؟)ی لینین بەراورد بکەین. چونکە لەوێشدا لینین باس لەوە دەکات چۆن نوخبەیەکی سۆسیالیستی پێشڕەو ئەتوانێت کۆمەڵگە بکات بە کۆمەڵگەیەکی سۆسیالیستی، چۆن بیگۆرێت و ئامرازەکانی بەردەستی چین. بە هەمان شێوەش سەید قوتب لە کتێبی (معالم فی الطریق)دا باس لەوە دەکات چۆن نوخبەیەکی دینی نوێ ئەتوانێت فیکرێکی دینی نوێ بەرهەم بهێنێت و چۆن دەتوانێت هەموو کۆمەڵگە بکاتەوە بە کۆمەڵگەیەکی دینی. واتە ئەوەی کە پێمان وا بێت لە پەیوەندی نێوان عەلمانیەت و دیندا، کە عەلمانیەت هات دین نامێنێت، یان کە دین هات عەلمانیەت نامێنێت، ئەم تێگەیشتنە زۆر ناڕاستە و تێگەیشتنێکی زۆر سادەیە بۆ پەیوەندی نێوان عەلمانیەت و دین.

**- بوونی دینێکی ڕاستەقینە کە پڕ نەبێت لەو ئیشکالاتانە لای تۆ چۆنە؟**

دینی بێ ئیشکالیەت، بوونی نییە. شتێک نییە ناوی دینێکی خالیس بێت. وەک چۆن زۆر قورسە دوو ئینسان بدۆزینەوە، کە زەوقیان یەک بێت، تامیان یەک بێت، چێژیان یەک بێت، یان دەموچاویان یەک بێت، بە هەمان شێوە زۆر قورسە دوو ئینسان بدۆزیتەوە، کە هەمان تێڕوانینیان بۆ دونیا هەبێت و جیاوازی نەبێت لەنێوانیاندا. ئەم دیدە بۆ مامەڵەکردنی دینیش ڕاستە، زۆر قورسە دوو ئینسان بدۆزیتەوە کە

هەمان تێڕوانینیان بۆ دین هەبێت. دین بریتییە لە کۆی تەفسیرەکانی دین، تەفسیرەکانی دینیش لە قۆناغی مێژوویی جیاوازدا دەگۆڕێن، بەپێی پێشکەوتنی کۆمەڵگە تەفسیرەکان دەگۆڕێن، لە ئینسانێکەوە بۆ ئینسانێکی دیکە دەگۆڕێت. وەک پێشتریش وتم، کە بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤت هەبوو، تیایدا نووسرابوو نێر و مێ یەکسانن، ئەو کاتە دەکرێت تەفسیرێک بۆ دین بکەیت، کە پێش لەدایکبوونی ئەم بەیاننامەیە بوونی نەبووە، ئەوەش لەلایەن زۆر ڕۆشنبیری دینی ئەم سەردەمەوە کراوە. لە سەردەمێکدا کە ئاستێکی مەعریفی گەشەکردوو دروست دەبێت، بۆ نموونە کە زانستی کۆمەڵناسی، ئینسانناسی، دەروونناسی، دروست دەبێت، دین مانایەک وەر دەگرێت، زۆر جیاوازە لەو مانایانەی پێش دروستبوونی ئەم زانستانە هەیبووە. ماناکانی دین پابەستە بە ئاستی مەعریفەی سەردەمێکی دیاریکراوەوە، بە شێوازی ئەو زانستانەی کە لەو سەردەمەدا ئامادەن، پەیوەستە بە شێوازی پەیوەندیی ئینسان بە دونیاوە لە سەردەمێکی دیاریکراودا، پەیوەستە بە ئاستی ئەو پەیوەندییانەی لە قۆناغێکی دیاریکراودا لە نێوان ئینسانەکاندا دروست دەبن. با لێرەدا نموونەیەک بهێنینەوە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا، مەسیحی و جولەکە و دینەکانی دیکە لەناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لەتەنیشت یەکەوە توانیویانە بژین، بەڵام لە شوێنێکی وەک سعودیەی ئەمڕۆدا، زۆر قورسە بتوانن پێکەوە بژین، لە کاتێکدا بەدرێژایی مێژووی ئیسلام، گروپە دینییە جیاوازەکان، لەتەنیشت یەکەوە توانیویانە پێکەوە بژین، بەڵام لەمڕۆدا ئەم پێکەوە ژیانە لە ئەفغانستان، لە سودان مەحاڵە. سونی بیت و لە ئێراندا بژیت، دۆخت باش نییە، شیعە بیت و لە سعودیە بژیت، وەکوو ئینسانی پلە دوو مامەڵە دەکرێیت. ئەمڕۆ جۆرێک لە توندڕەویی دینی هەیە، کە پەیوەندی بە شێوازی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی ئینسان لەگەڵیەکدا و شێوازی تێڕوانینی ئێمە بۆ خۆمان و کۆمەڵگە هەیە. ئەم

تێڕوانینانە لە دونیای ئەمڕۆدا تەواو جیاوازە لە شێوازی تێڕوانینەکانی ئینسان لە سەدەی نۆزدەهەمدا. لێرەوە زۆر قورسە بتوانین یەک پێناس بۆ دین بکەین، تەنانەت زۆر قورسە دین هەر لە سەرەتاوە پێناسە بکەین و بڵێین چییە، چونکە ئەگەر باوەڕبوون بە بوونی خوداوەند، یان بوونی هێزێکی دەرەوەی دونیا، بریتی بێت لە یەکێک لە گرنگترین ئاکار، یان سیفەتە سەرەکییەکانی دین، واتە ئەگەر گریمانکردنی بوونی خودایەک بۆ دین زۆر پێویست بێت، ئەوا دین هەیە فیکرەی خودای تیا نییە، وەک بووزییەت. بووزییەت دینێکی بچووکیش نییە، بەڵکوو یەکێکە لەو دینانەی بە سەدان ملیۆن ئینسان بڕوایان پێیەتی. لێرەوە شێوازی ئامادەگی دیین لە دونیادا و فۆرمەکانی هێجگار جیاوازن، لەبەر ئەوە زۆر قورسە وەڵامی ئەو پرسیارەی تۆ کردت، بدەینەوە. تەنها کەسانێکی دۆگمایی دەتوانن وەڵامی ئەو پرسیارەی تۆ بدەنەوە و بێدوودڵی کۆمەڵێک شتت بەدوای یەکدا بۆ ڕیز بکەن و بڵێن دین ئەمە بووە و ئەمەیە و هەر ئاواش دەمێنێتەوە. بە بۆچوونی من، دین بریتییە لەکۆی تەفسیرەکانی، لە کۆی شێوازی ئامادەبوونە جیاوازەکانی لەناو مێژوودا.

- بەشێک لە ڕووناکبیران پێیان وایە بەقەدەر ئەوەی دین لە کۆمەڵێک ڕەهەندی جیاواز، لە کۆمەڵێک بۆچوونی جیاواز، لە کۆمەڵێک شوێنگەی جیاواز هاتووەتە ناوەوە، بەقەدەر ئەوەش، عەلمانیەت وەکوو تێگەیشتنە ڕاستەقینەکەی لە کۆمەڵگەی کوردیدا بزرە. ڕای تۆ چییە؟

عەلمانیەت لە دەرەوەی کۆمەڵگەی کوردیشدا، تێزێکە کێشەی زۆر هەیە. گرنگترین تێزی عەلمانیەت ئەوەیە کە دین ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و ڕۆڵی سیاسی لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگەدا نەمێنێت، دین بگەڕێتەوە بۆ ناو سنوورەکانی ژیانی شەخسی ئینسانەکان خۆیان. عەلمانیەت وەک

ئێمە دەیناسین، داوای ئەوە دەکات دین ببێت بە پەیوەندییەکی شەخسی لەنێوان ئینسان و خوداوەنددا. بە بۆچوونی من، ئەم شێوازە لە دین، مەبەستم دینی شەخسییە، بەر لە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیاش هەر هەبووە، بەشێکی زۆری سۆفیزم لەسەر بەشەخسیکردنی پەیوەندی نێوان ئیماندار و خوداوەند کار دەکات. واتە لەم ئاستەدا پێویستت بە تیۆرەی عەلمانیەت نییە بۆ ئەوەی بەرگری لە بوونی فۆرمێکی دین بکەیت، کە فۆرمێکی شەخسییە، یان فۆرمی بەشەخسیکردنی دین، یان بە ڕۆحانیکردنی دینە، واتە فۆرمی کردنی دینە بە پەیوەندییەکی شەخسی لەنێوان ئینسان و خوداوەنددا. وەک وتم، ئەم شێوازە لە دین، لە مێژووی دیندا بەر لە تیۆرەی عەلمانیەت بوونی هەبووە. وەک وتم، بەشێکی گەورەی فیکری سۆفیزم لە ئیسلام و دینەکانی دیکەشدا لەسەر بەشەخسیکردنی دین کاریان کردووە.

تیۆرەی عەلمانیەت، تیۆرەیەکە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە هاتووە، بەتایبەتی لە بۆچوونەکانی دۆرکهایم و ماکس فیبەرەوە هاتووە. ئەم نووسەرانە، خوێندنەوەیەکی دیاریکراویان بۆ کۆمەڵگە ئەوروپییەکان کردووە و باسیان لەوە کردووە، کە گوایە لەو کۆمەڵگەیانەدا دین بووە بە شتێکی شەخسی و ڕۆڵی نەماوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری و گشتیدا. کێشەکە لەوەدایە، ئەم تێزە لە هیچ شوێنێکی دنیادا ناسەلمێنرێت، لە ڕووی مێژوویی و تەتبیقییەوە ئەم تێزە تێزێکی ناڕاستە. نە مێژووی فەرەنسا، نە مێژووی ئەڵمانیا و نە مێژووی ئەمریکا و نە مێژووی هۆڵەندا، کە ئەمانە دەوڵەتە عەلمانییە گەورەکانی دونیان، ئەم گریمانەیە ناسەلمێنێت. لە هیچ یەکێک لەم وڵاتانەدا دین بێ ڕۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی نەبووە، دین لە مێژووی مۆدێرنی ئەم کۆمەڵگەیانەدا رۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتیی بەرچاوی بینیوە و تاکوو ئێستاش دەیبینێت. دین لە کۆمەڵگەی ئەمریکیدا دینێکی

بەهێزە، لە پەرلەمانی هۆڵەنداوا هێزی دینی هەیە، دین بەشێکە لە شووناسی کۆمەڵایەتی. جیاوازیی ئەمە لەگەڵ لای خۆماندا لەوەدایە لە کاتێکدا دین لەم وڵاتانەدا تەنها بڕێک لە ڕۆڵەکان دەبینێت و تەنها ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی شووناسە، هێزە سیاسییە دینییەکانی لای خۆمان، دەیانەوێت دین بکەن بە هەموو شووناسی کۆمەڵایەتی و هەموو ڕۆڵەکانی بدەنێ. لە کاتێکدا دین بەشێکە لە سیاسەت، لە مێژووی مۆدێرنی کۆمەڵگە ئەوروپییەکاندا، هێزە سیاسییە دینییەکانی لای خۆمان دەیانەوێت دین بکەن بە هەموو سیاسەت. خودی کێشەکە لێرەدایە. کێشەکە لە نەفیکردنی ڕۆڵە کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسییەکانی دیندا نییە، کێشەکە لەوەدایە دین بکەیت بە بەدیل و بە ئەڵتەرناتیڤی هەموو شێوازەکانی تری سیاسەتکردن و کولتوور و شووناس و بیرکردنەوە. هەقیقەتی دینی وەک تاقە هەقیقەت و وەک هەقیقەتێکی ڕەها نیشان بدەیت، کە هەموو هەقیقەتەکانی دیکە گوێمستی بن. واتە کێشەکە لەوەدایە دین بکەیت بە تاقە ئایدیۆلۆژیایەک، کە لە کۆمەڵگەدا هەبێت و باڵادەست بێت. کێشەی دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا لەم خاڵەدایە. لەوەدایە دین خۆی وەکوو هێزێکی ڕێژەیی نابینێت، وەکوو هێزێکی ڕێژەیی تەماشای خۆی ناکات، باوەڕی بەوە نییە، کە تەنها بەشێک لە هەقیقەتی لەلایە، باوەڕی بەوە نییە، کە تەنها بەشێک بێت لە سیاسەت. بەکورتی دین لای ئێمە بەوە ڕازی نابێت کە ئەتوانێت ببێت بە بەشێک لە سیاسەت، بە بەشێک لە سیستمی ئەخلاقی لە کۆمەڵگەدا، بەڵکوو دەیەوێت ببێت بە هەموو سیاسەت و بە هەموو ئەخلاق و بە هەموو کۆمەڵگە. دەیەوێت ببێت بە هەموو شووناس و بە ناوی هەموو ڕەسەنایەتییەوە قسە بکات.

**- ئەمە لە غیابی تێگەیشتنێکی ڕاست نییە بۆ عەلمانیەت؟ یاخود ئەمە لاوازیی هێزە بەناو عەلمانییەکان نییە؟**

ئەمە پەیوەندیی بە عەلمانیەتەوە نییە، ئەمە پەیوەندیی بە دیموکراسیەتەوە هەیە، پەیوەندیی بە کۆمەڵێک شتەوە هەیە کە پەیوەندییان بە عەلمانیەتەوە نییە. تێزی سەرەکیی عەلمانیەت بریتییە لەوەی کە دین بگەڕێتەوە بۆ مەجالی شەخسی و ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری نەبینێت. بەڵام مێژووی کۆمەڵگە هاوچەرخەکان، بە مێژووی ئەمریکا و ئەو وڵاتانەی ترەوە کە ئەمڕۆ وڵاتی عەلمانین، ئەم تێزە ناسەلمێنن. دین لە هەموو ئەم کۆمەڵگەیانەشدا تاکوو ئەمڕۆش، ڕۆڵ دەبینێت، بەڵام پاوانی هەموو ڕۆڵەکان ناکات، دین بووە بە دینێکی دیموکرات.

**- ئیشکالت هەیە لەسەر ئەوەی پەیوەندیی نێوان دین و سیاسەت پێویستە، یان بەتایبەت، ڕۆڵی دین لە دەوڵەت جیا بکرێتەوە؟**

پێم کێشە نییە دین دەوڵەتی هەبێت، یان دەوڵەت دینی هەبێت، یاخود هێزی سیاسی هەبن لەسەر ئەساسی دین کار بکەن. کێشەکە لەوەدایە، دەوڵەت کار بکات بۆ ئەوەی دینێک بسەپێنێت بەسەر کۆمەڵگەدا، دەوڵەت ئیش بکات بۆ ئەوەی سیستمی ئەخلاقی دینی بکات بە تاکە سیستمی ئەخلاقی لەناو کۆمەڵگەدا. کێشەکە لەوەدایە هێزێکی سیاسی دینی دروست ببێت، باوەڕی بەوە بێت هەموو ڕاستییەکان لای ئەوە و دەبێت هەمووان باوەڕیان بەم ڕاستییە موتڵەقە بێت. کێشەکە لەوەدایە هێزگەلێکی دینیت هەبێت باوەڕیان وا بێت ئێمە لە ئێستادا دیدە جیاوازەکان و هێزە سیاسییەکانی دی قبوڵ دەکەین، نە لەبەر ئەوەی باوەڕمان بە ڕێژەییبوونی هەقیقەت و ڕێژەییبوونی سیاسەت

و ڕێژەییبوونـی دیـن خۆشـی هەیـە، بەڵکـوو لەبـەر ئـەوەی لـە ئێسـتادا دەرەقەتـی هێزەکانی تـر نایەین. کـەی دەرەقەتیـان هاتین، وەکـوو خۆمانیان لـێ دەکەیـن و ناچاریـان دەکەیـن هەقیقەتەکانـی ئێمـە قبـوڵ بکـەن. ئـەم تێڕوانینـە بـۆ دیـن، واتـە تەماشـاکردنی دیـن وەک هەقیقەتێکـی ڕەهـا و وەک تاقـە هەقیقـەت ترسـناکە. ئـەم تێڕوانینـە ترسـناکە بـۆ دیـن، بـەوە چارەسـەر نابێـت کـە پێـی بڵێیـت دەبێـت ئێـوەش ببـن بـە عەلمانـی، یـان بڵێیـت بـا دیـن لـە دەوڵـەت جیـا بکەینـەوە، بەڵکـوو بـەوە دەبێـت بـاس لـە ڕێژەییبوونـی هەقیقـەت بکەیـت. کێشـەی تیـۆرەی عەلمانیـەت لەوەدایـە لەباتـی داواکردنـی ڕێژەییبوونـی هەقیقەتـەکان، داوای نەمانـی ڕۆڵـی دیـن ئـەکات لـە ژیانـی سیاسـی و گشـتی کۆمەڵگـەدا. لـە کاتێکـدا کێشـەکە بـەوە چارەسـەر دەبێـت هەمـووان بـاوەڕی ڕاسـتەقینەیان بـە دیموکراسـیەت هەبێـت، باوەڕیـان بـە بەشبەشـبوونی هەقیقـەت هەبێـت، باوەڕیـان بـەوە بێـت کـە کۆمەڵگـە پێکهاتێکـی فرەدەنگ و فرەڕەنگ و فرەکولتوور و فرەئەخلاق و فرەشـوناس و شـتیترە. باوەڕیـان بەوەبێـت ئـەوە لـە ئەساسـدا لاوازکردنـی ژیـان و فەقیرکردنیەتـی کـە تـۆ یـەک دیـد بسـەپێنیت بەسـەر هەمـوو دیدەکانـی تـردا، یـەک ئەخـلاق بسـەپێنیت بەسـەر هەمـوو ئەخلاقەکانـی تـردا، یـەک تەفسـیر بسـەپێنی بەسـەر هەمـوو تەفسـیرەکانی تـردا. بـۆ چارەسـەکردنی ئـەم کێشـانەش، پێویسـتت بـە عەلمانیـەت نییـە بـەو مانایـەی مـن لێـرەدا باسـی دەکـەم، بـۆ ئەمەیـان پێویسـتت بـە تازەبوونـەوەی وشـیاری و بـە ڕێژەییبوونـی تێگەیشـتنمان بـۆ هەقیقـەت هەیـە.

**– بـاس لـە پەیوەندیـی نێوان دین و دیموکراسیەت دەکەیت، کـە زەرورەتن، بـە دیوەکـەی تریشـدا دابـڕاو نییـە لـە دیموکراسـیەت، بـۆ عەلمانیەتیش بـە هەمـان شـێوە پێویسـتت بـە دیموکراسـیەت هەیـە؟**

دەمێنێتەوە سەر ئەوەی چۆن عەلمانیەت پێناسە دەکەین، جیاوازی هەیە لەنێوان پێناسەکردنی عەلمانیەت وەک جیاکردنەوەی دین لە دەسەڵات و وەک ڕێگرتن لە دین کە ڕۆڵی سیاسی و ڕۆڵ لە ژیانی گشتیدا بگێڕێت، لەگەڵ ئەو پێناسەیەدا کە عەلمانیەت یەکسان دەکات بە دیموکراسیەت، بە بەرگری لە مافەکانی مرۆڤ و بە بەشبەشکردنی هەقیقەت و بە پێداگرتن لەسەر مافی جیاوازبوون. بە بۆچوونی من، هەردوو پێناسەکە ناڕاستن، یەکەمیان، واتە مەسەلەی باوەڕبوون بەوەی کە دین ڕۆڵی گشتی لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا نەمێنێت، داوایەکە لە هیچ شوێنێکی دونیادا ڕووی نەداوە و دین بە شێوەی جیاجیا ڕۆڵی سیاسیی بینیوە و بەشێک بووە لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگە. دووهەمیان، مەبەستم یەکسانکردنی عەلمانیەتە بە دیموکراسیەت و مافی مرۆڤ و شتی دیکەی لەم بابەتە، کێشەکەی لەوەدایە کە ئەم پێناسەیە لەگەڵ مێژووی دەسەڵاتە عەلمانییەکاندا ناگونجێت. مێژووی عەلمانیەت بریتی نییە لە مێژووی دیموکراسیەت، یان مێژووی بەرگریکردن لەو پرنسیپانەی ئێستا باسم کردن، لەوانە مافەکانی مرۆڤ و جیاوازی و... هتد. مێژووی عەلمانیەت، دیکتاتۆری گەورەی وەکوو ستالینی دروست کرد، دیکتاتۆری گەورەی وەکوو هیتلەری هێنایە کایەوە، جەمال عەبدولناسر و سەدام حسین لە قۆناغێکدا عەلمانی بوون، لە قۆناغێکی دیکەدا سەدام بوو بە سیاسییەکی دینی. بە بۆچوونی من، کێشەکە لە مەفهومی عەلمانیەت خۆیدایە، لە ناوەکەدایە، ئەگەر باس لە پاراستنی مافی مرۆڤ بکەین، باس لە دیموکراسیەت و عەقلانیەت بکەین، گەر باس لە سیستمێک بکەین موقەدەسی موتڵەقی تێدا نەبێت، مەرج نییە ئەمانە ببەستینەوە بە بوونی عەلمانیەتەوە و بڵێین عەلمانیەت یەکسانە بەم شتانە، یان گەر عەلمانیەت نەبێ، ئەم شتانە ڕوو نادەن. چونکە مێژووی عەلمانیەت نیشانمان ئەدات دەکرێت دیکتاتۆری عەلمانیت

هەبێت، کە ڕێزی هیچ یەکێک لەو پرنسیپپانە نەگرێت، واتە نە ڕێزی عەقڵانیەت بگرێت، نە ڕێزی دیموکراسیەت، نە ڕێزی مافەکانی مرۆڤ. لەبەر ئەوە، کێشەکە لە ئەساسدا یان تەحەدا سەرەکییەکە بریتییە لەوەی چۆن ناوەندێکی سیاسی دروست بکەین تیایدا هێزەکان لە ڕێژەییبوونی خۆیان تێبگەن، بە ناوی موتڵەقەوە قسە نەکەن، هەقیقەتە تایبەتەکانی خۆیان وەک ڕا لە مەجالی گشتیدا نمایش و مامەڵە بکەن. ڕاستە هێزی دینی هەن بە ناوی موتڵەقەوە قسە دەکەن، خۆیان بە خاوەنی هەقیقەتێکی موتڵەق دەزانن، بە ناوی هەقیقەتێکی موتڵەقەوە ئەدوێن، بەڵام بە هەمان شێوە دەشێت هێزی ناسیۆنالیستی و هێزی عەلمانیش هەبن هەمان شت بکەن. تەواو وەک هێزە دینییەکان، هێزە عەلمانییەکانیش ئەتوانن بە ناوی موتڵەقێکەوە قسە بکەن و بڵێن ئێمە نوێنەری ڕاستییەکی موتڵەقین، وەک زۆرێک لە هێزە مارکسی و سۆسیالیستی و کۆمۆنیستییەکان نیشانیان داین. واتە هەردوو لایەنەکە دەتوانن موقەدەسێک دروست بکەن و لەپاڵ ئەو موقەدەسەدا سیاسەت بکەن. ئەمەش هەردووکیان دەکاتە لایەنی سیاسیی نادیموکراس. لە کاتێکدا دیدی ڕاستەقینە بۆ سیاسەت و دیدی ڕاستەقینە بۆ کۆمەڵگە ئەوەیە، کە ڕێزی فرەدەنگی و فرەڕەنگی و فرەکولتووریی ناو کۆمەڵگە بگیرێت، هیچ کۆمەڵگەیەک نییە لە دونیادا یەک کولتووری هەبێت، تەنها یەک دەنگی تیا بێت، یەک شوناسی هەبێت، یەک سیستمی ئەخلاقی تیابێت. هەموو کۆمەڵگەیەک، بە حوکمی ئەوەی کۆمەڵگەیە، پێکهاتووە لە کۆمەڵێک ویست و دید و چاوەڕوانیی جیاواز، پڕیەتی لە بۆچوونی ئەخلاقیی جیاواز و تێڕوانینی جیاواز بۆ دین و ئەم شتانە. هەر هێزێک هات و وتی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا یەک کولتوور هەیە، یەک دین یان یەک تێگەیشتن بۆ دین هەیە، یەک شێوازی ڕەسەنایەتی هەیە، دەبێت یەک شێوازی سیاسیش هەبێت، یەک هەقیقەت هەیە، ئەو هێزە هێزێکی

ترسناکە، جا ئەو هێزە بە ناوی دینەوە قسە بکات، یاخود بە ناوی ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی نادینییەوە، بە ناوی نەتەوەوە بیکات یان بە ناوی هەموو کۆمەڵگەوە، هێزێکی ترسناکە و ناکۆکە بە سەرەتاییترین پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ و پاراستنی جیاوازی و بەشبەشکردنی هەقیقەت و دیموکراسیەت.

- ئەو تەوزیفە سیاسییەی کە لە کوردستاندا بۆ دین دەکرێت، یاخود ئەو دینەی کە لە دەموچاو و ڕووخساری هێزە ئیسلامییەکانی ئێمەدا دەخوێنرێتەوە، تۆ یەکێکیت لەوانەی لە ڕابردوودا و لە نوێترین وتاریشتدا بە ناونیشانی "کەی ئیسلامییەکانی ئێمە گەورە دەبن؟" خوێندنەوەت بۆ کردووە، پێت وایە ئیشکال لە تەوزیفکردنی دین بەو بۆچوونە سیاسییە چۆنە؟

کێشەیەکی گەورەیە، هێزێکی ئیسلامیت هەبێت لە وڵاتەکەتدا لە مەجالی گشتیدا بە ناوی کولتووری کوردەوە قسە بکات، بە ناوی ڕەسەنایەتی و خودا و تێکستە دینییەکان و موقەدەسەوە قسە بکات. لەوە تێنەگات تۆ وەکوو من بەشەریت، تۆ وەکوو ئەو عەقڵت هەیە، لە من عەقڵت زیاتر نییە و لە من عەقڵت کەمتر نییە، تۆ تێکستێک دەخوێنیتەوە بە جۆرێک لێی تێدەگەیت و من دەیخوێنمەوە بە جۆرێکی تر لێی تێدەگەم. پرسیارەکە ئەوە نییە تۆ من وەکوو خۆت لێ بکەیت، یان من تۆ وەکو خۆم لێ بکەم، پرسیارەکە ئەوەیە، تۆ ڕێزی ئازادیی من بگریت و منیش ڕێزی ئازادیی تۆ. ڕێزگرتنی ئازادی بەوە نابێت تۆ خۆت بە خاوەنی هەقیقەتێکی ڕەها بزانیت و من بە هەڵە و بە کافر دابنێیت. لە هەر شوێنێکدا بە دەستەواژەی کافر و دیندار، خاوەن دین و بێدین، لەگەڵ یەکتردا قسەمان کرد، لەو شوێنەدا ناتوانین پێکەوە بژین،

دەبێت یەکێکمان ئەوی ترمان لەناو ببات. کێشەی ئەم هێزە ئیسلامییانەی وڵاتی ئێمە لەوەدایە تا ئەمڕۆکە نەگەیشتوونەتە ئەو ڕاستییەی کە ئەوان هەڵگری تەفسیرێک لە تەفسیرەکانی دینن، هەڵگری مانایەک لە ماناکانی موقەدەسن، نوێنەرایەتی بەشێکی دیاریکراوی کۆمەڵگەی ئێمە دەکەن، نوێنەرایەتی دین ناکەن بە مانا موتڵەقەکەی. لە ئەساسدا دین بە مانا موتڵەقەکەی نە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا و نە لە هیچ کۆمەڵگەیەکی دیکەدا، بوونی نییە. ئەو تێڕوانینەی دایکی من بۆ دینی هەیە، زۆر جیاوازە لەو تێڕوانینەی کە هێزە سیاسییە ئیسلامییەکانی کوردستان بۆ دین هەیانە. ئەو تێڕوانینەی مەحوی بۆ دین هەیبوو، زۆر جیاوازە لەو تێڕوانینانەی کە بەشێکی زۆر لە هێزە ئیسلامییە سیاسییەکان بۆ دین هەیانە، ئەو تێڕوانینەی ڕۆشنبیرە دینییەکانی سەدەی نۆزدەهەمی دونیای عەرەب، بۆ دینیان هەبوو، لە محەمەد عەبدەوە بیگرە بۆ تەهتاویی و بۆ ئەفغانی و بۆ ئەوانی تر، زۆر جیاوازە لەو تێڕوانینەی لای ئیسلامییەکانی سەدەی بیستەم دروست دەبێت. ئەسڵەن ئەو ڕیفۆرمیستە گەورانەی سەدەی نۆزدەهەم، لای هێزگەلێکی وەکوو ئەلقاعیدە و هێزە توندڕەوەکانی تر، وەک کەسانی دیندار وێنا ناکرێن، بەڵکوو دەیانخەنە قاڵبی بێدین و کافر و کۆمەڵێک تۆمەتی دیکەی لەم بابەتەوە. لە سەید قوتبەوە ئەم دیدە پەرگیرە ئامادەیە. ئەوەی من دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە، کێشەی سەرەکیی هێزەکانی ئیسلامی سیاسی لە دونیای ئێمەدا ئەوەیە، تاکوو ئێستا عەقڵیەتی ڕێژەییبوون نەبووە بە بەشێک لە شێوازی مامەڵەکردنیان لەگەڵ دین و موقەدەس و شتەکانی دیکەدا، ڕاکانی خۆیان لە مەجالی گشتیدا وەک هەقیقەتی ڕەها نمایش دەکەن، ئەوەشی ئەو ڕایانەی ئەوانی نەبێت، دەکەوێتە دەرەوەی دین و دەرەوەی موقەدەس و دەرەوەی ڕەسەنایەتییەوە.

**- لە چیدا دەر دەکەوێت کە هەست دەکەیت هەندێک جار باوەڕیان بەم ڕێژەییبوونە نییە؟**

ئیسلامییەکانی لای ئێمە، گوتارێکی ئایدیۆلۆژییان هەیە، تێکەڵێکی سەیرە لە باوەڕبوون بە دیموکراسیەت و باوەڕبوون بە مافی جیاوازی لە سەرێکەوە، بەڵام لە سەرێکی دیکەوە، بە ناوی کولتووری نەتەوە و ڕەسەنایەتی و موقەدەسەوە قسە دەکەن. ئەمە کۆکتێلێکی ئایدیۆلۆژییە، کە ڕەگەزە جیاواز و دژبەیەکەکانی زەحمەتە پێکەوە بژین. کە باست لە جیاوازی کرد، ناتوانیت بە ناوی موقەدەسەوە قسە بکەیت، ناکۆکییەکی مەنتیقی لە نێوان موقەدەس و جیاوازیدا هەیە، کە وتت شتێک موقەدەسە، مانای ئەوەی ناتوانیت سازشی لەسەر بکەیت، چونکە لەسەر موقەدەس ناکرێت دانوسان بکرێت، بەتایبەتی موقەدەسی دینی کە لە دیدی ئەواندا موقەدەسێکە ڕووی لە هەموو بەشەریەتە. کە تۆ باوەڕت بەوە بوو بە ناوی موقەدەسەوە قسە بکەیت، ناتوانیت لە دیوی ئەودیوەوە بڵێیت من باوەڕم بە جیاوازی هەیە. ناتوانیت بڵێیت تۆش مافت هەیە وەکوو من هەبیت و وەک من موقەدەسی خۆت هەبێت. لێرەدا ناکۆکییەکی مەنتقی هەیە کە دەرەنجامی سیاسیی مەترسیداری لێ دەکەوێتەوە. باشترین نموونە کە ئەم مەیل و ئیرادەیەی بە ناوی موقەدەسەوە قسەکردن نیشان بدات، ڕەنگە ئەو بەیاننامەیە بێت کە یەکگرتووی ئیسلامی لە ماوەی پێشوودا لەسەر گۆڤاری "وێران" بڵاوی کردەوە و کۆمەڵێک دەنگەدەنگی زۆری دروست کرد. ئەو بەیاننامەیە لە یەک کاتدا بە ناوی موقەدەسەوە قسە دەکات، بە ناوی کولتووری کوردی و ڕەسەنایەتییەوە قسە دەکات، بە ناوی دینەوە قسە دەکات، بە ناوی نەتەوەوە قسە دەکات. ئەگەر سەرنج بدەیت، گۆڤاری وێران گۆڤارێکە، ڕەنگە هەمووی ٢٠٠ نوسخەیەکی لە کوردستاندا لێ بڵاو ببێتەوە، شیعرێکی تیا بڵاو بۆتەوە،

کـە ئیسـلامییەکانی ورووژانـدووە. ڕەنگـە لـە هەمـوو کوردسـتاندا ١٠-١٥ کەس ئەو شیعرەیان نەخوێندبێتەوە. کەچی یەکگرتوو ئەم شیعرە وا پیشـان دەدات وەک ئـەوەی هەڕەشـەیەکی گـەورە بێت بۆ سـەر کولتووری کوردی و هەوڵدانێک بێت بۆ وێرانکردنی ئەخـلاق لـە کۆمەڵگـەی ئێمـەدا، هەروەهـا ئـەو شـیعرە وەک هەڕەشـە لـە ئاسایشـی کۆمەڵایەتی و لـە شـیرازەی خێزان وێنـا دەکات و پێی وایـە گەنجـان بـەرەو بێڕەوشـتی و عەبەسـیەت دەبـات. بەکورتـی ئیسـلامییەکان دۆخێکی هێجگار سـەیریان دروسـت کـردووە، لـە کاتێدا وڵاتـی ئێمـە پڕە لـە تەلەڤزیۆنـی دینی، پڕە لـە ڕادیـۆ و ڕۆژنامـەی دینـی، چەنـدان حیزبـی دینـی هـەن، وەزارەتێک بۆ کاروبـاری دینـی هەیـە، هەزارەهـا مزگـەوت و فەرمانبـەری دینـی لـە وڵاتـدا هـەن، دیـن وەزیـری هەیـە، لـە زانکۆکانـدا دەخوێنرێت، لـە خوێندنـی سـەرەتاییەوە تاکوو زانکۆ دەخوێنرێت، بەکورتـی لـە کاتێکدا کۆمەڵگـەی ئێمـە لە زیاد لە ئاراسـتەیەکەوە پڕ دەکرێت لـە دیـن و بـە شـێوازی جیاواز ڕۆژانـە دین بەرهـەم دەهێنرێت، کەچی ئـەوان بـاس لـە هێرش بـۆ سـەر دیـن و بـاس لـە مەترسـی لەسـەر بوونـی دیـن دەکـەن. پێـم وا بێـت دیـن یەکێکـە لـەو شـتە هێجـگار کـەم و دەگمەنانـەی کـە کۆمەڵگـەی ئێمـە بەرهەمـی دەهێنێـت، هەموومـان دەزانیـن کۆمەڵگـەی ئێمـە هیـچ بەرهـەم ناهێنێت، تەنانـەت سـەوزە و میـوەی خۆشـی بەرهـەم ناهێنێـت، کەچـی بەبەردەوامـی دیـن بەرهـەم دەهێنێـت. دەمەوێـت بڵێم لـە کاتێکدا ئـەو هەمـوو کەناڵە زۆر و زەبەندەیە بۆ بەرهەمهێنانی دین لـەم کۆمەڵگەیـەدا هەیـە و کراوەیە، کەچی لـە شـوێنێکدا کـە شـیعرێک بـڵاو دەبێتـەوە و لەوانەیـە لـە هەمـوو کوردسـتاندا ١٠ کـەس نەیخوێندبێتـەوە، ئـەم هێـزە دینییانـە لەسـەر ئـەم شـیعرە قیامەتێـک دروسـت دەکـەن. وای نیشـان دەدەن کـە گەورەتریـن هەڕەشـەی لەسـەر ئەخلاقی کۆمەڵگـە و نـەوە نوێکان هەیـە. ئـەم شـێوازی مامەڵەکردنـە لەگـەڵ ئـەوی دیدا، لەگـەڵ ڕای جیاوازدا، ئەوەمـان بەبیـر دێنێتـەوە کـە ئـەم هێزە ئیسـلامییانە باوەڕیـان بـەوە نییـە

ڕێژەیی بن و بە ناوی هەمووانەوە قسە نەکەن، باوەڕیان بەوە نییە خەڵکێکی دی هەبێت دیدێکی جیاوازی بۆ دین هەبێت. لەم ساتەوەختانەدا بۆمان دەر دەکەوێت، کە ئێمە کۆمەڵێک هێزی دینیمان هەن، گەورە نەبوون، واتە نەبوون بە هێزی سیاسیی کامڵ، بۆچوونەکانی خۆیان وەک ڕایەک لەناو ڕاکاندا مامەڵە ناکەن، بەڵکوو وەکو هەقیقەتێکی ڕەها نیشانی دەدەن.

- هەندێک ئیشکال هەیە لەناو هێزە سیاسییە ئیسلامییەکان خۆشیاندا، خەڵک هەیە لە قیادەی ئەواندا جیا بووەتەوە لەسەر ئەوەی پێی وایە چیتر پێویستە وەزیفەی ئیسلامیبوون نەبێتە شووناسی هێزێکی سیاسی. هەندێکیش لە چاودێران پێیان وایە تەجروبەی پارتی داد و گەشەپێدان کە هەڵگری باکگراوندێکی ئیسلامین و لەسەر گەشەپێدانی ئابووری دادپەروەری و کۆمەڵایەتی کار دەکەن، کەمتر لەسەر ئەم فۆرمە ئیسلامییە توندە کار دەکەن، هەست دەکەیت لە بەردەم دروستبوونی مۆدێلێکی نوێداین لە حیزبی ئیسلامی؟

لە ئەدەبیاتی سیاسیدا لەسەر ئیسلامی سیاسی، بەتایبەتی ئەمڕۆ، کۆمەڵێک لەوانەی کە زۆر شارەزان لە بواری ئیسلامی سیاسیدا، قسە لە قۆناغی دوای ئیسلامیزم دەکەن. قسە لە قۆناغی دوای بەسیاسیکردنی ئیسلام دەکەن. دوای ئیسلامیزم یان "پۆست ئیسلامیزم،" دوو شت ئەگەیەنێت. یەکەمیان ئەوەیە ئیسلام لای بەشێک لە هێزە ئیسلامییەکان و لای بڕێک لە ئینسانە دیندارەکان، مانا سیاسییەکانی خۆی لەدەست داوە. لەباتی ئەو مانا سیاسییانە، ئیسلام بووە بە جۆرێک لە شووناس، بەتایبەتی شووناسی تاکەکەسی. لێرەدا ئیسلام دەبێت بە جۆرێک لە دینداری شەخسی، بۆ نموونە تەرجەمە دەبێت بۆ لەبەرکردنی جل

و پۆشاکێکی دیاریکراو، هێشتنەوەی ڕیشێکی تەنک یان زۆر، واتە ئیسلام دەبێتە ئسلوبێکی تایبەتی ڕێکخستنی ژیانی تاکەکەسی، ئەبێت بە جۆرێک لە شێوازی خۆپیشاندان و ئامادەبوون لەناو فەزای گشتیی کۆمەڵگەدا. واتە دیوێکی گرنگی قۆناغی پۆست ئیسلامیزم بریتییە لە دروستبوونی ئەو فۆرمە لە ئیسلام، کە نایەوێت وەک سیاسەت دەر کەوێت، یان ڕەهەندە سیاسییەکانی خۆی واز لێ دێنێت و ڕەهەندی شەخسی وەر دەگرێت. ئەو ڕەهەندە شەخسییەش دەبێت بە شووناسی تاکەکەسی ئینسانەکان. ئەمە دیوێکی ئەو قۆناغەیە، ئەم دیاردەیە لە زۆر شوێنی دونیادا ئامادەیە، بەتایبەتی لەناو موسڵمانەکانی ئەوروپادا. ئەگەر تەماشای موسڵمانەکانی ئەوروپا بکەیت، دەبینیت ئافرەتی موسڵمان لە ئەوروپا هەیە باوەڕی بە خودا و پێغەمبەر هەیە و حیجاب دەپۆشێت، بەڵام لە هەمان کاتدا دانس و سەما دەکات، لە چاخانە و قاوەخانەکان دادەنیشێت، لەگەڵ هاوڕێ و برادەرەکانیدا، کە هەموویان ئافرەت نین، بە سەفەر دەڕۆن. دین لەم دۆخەدا و بۆ ئەو جۆرە کەسانە، بووە بە بەشێک لە شووناسی تاکەکەسی، نەک بە پرۆژەیەکی سیاسی. ئەم شێوازە لە دینداری، بە دوای ئەوەوە نییە کۆمەڵگە و دەوڵەت و یاساکان بکات بە کۆمەڵگە و دەوڵەت و یاسای دینی و دین بەو شێوەیە بەو دەزگایانەوە گرێ بدات. بێگومان ئەم شێوە لە دینداری شەخسی، مەرج نییە هەمیشە دینداریییەکی کراوە بێت، بەو شێوەی من باسم کرد، بەڵکوو دەکرێت شێوازێکی هێجگار داخراو و کۆنزەرڤاتیڤی دینیش بگرێتە خۆی، لە شێوەی پۆشینی نیقاب و تەوقەنەکردن لەگەڵ پیاودا و شتی دیکەی لەم بابەتە. مەسەلەی سەرەکی ئەوەیە، لەم دۆخەشدا دین پرۆژەیەکی سیاسی نییە، بەڵکوو بەشێکە لە ژیانی شەخسیی ئینسانەکان و ئسلوبێکە لە ئسلوبەکانی ژیان لەناو کۆمەڵگەدا.

دیوی دووهەمی قۆناغی دوای ئیسلامیزم، بریتییە لە گۆڕان لە

شێوازی کارکردن و گۆڕان لە ئایدیۆلۆژیای هەندێک لە هێزەکانی ئیسلامی سیاسی خۆیاندا. بۆ نموونە، دروستبوونی هێزێکی دینی وەک پارتەکەی ئەردۆگان لە تورکیادا. لەم مۆدێلەدا ئەخلاقی دینی و حەرام و حەلاڵە دینییەکان، بنەمای سیاسەت نییە. سیاسەت لێرەدا بەدوای سەپاندنی کۆمەڵێک یاسای ئەخلاقی و کۆمەڵێک ئەحکامی ئەخلاقیدا نییە، ئەمانە ئەساسی سیاسەتکردن نین. سیاسەت لای ئەم پارتە بووە بە چالاکیی ڕێکخستنی کۆمەڵگە، ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان گروپەکان لەگەڵ یەکتردا، لەسەر بنەمای داننان بە بوونی یەکدا وەک هێزی جیاواز. سیاسەت لێرەدا کەمترین شێوەی ئەو ڕەهەندە ئەخلاقی و دینییەی لەخۆ گرتووە، کە هێزە سیاسییە دینییەکانی کۆمەڵگەی ئێمە تا ئەمڕۆش پێی لەسەر دادەگرن. خاڵێکی دیکەی ئاکاری ئەم هێزە پۆست ئیسلامیزمانە ئەوەیە کە باوەڕیان بە تەکفیرکردن و بەکارهێنانی توندوتیژی نەماوە.

- بەقەدەر ئەوەی کە هێزە ئیسلامییەکان ئیشێکی سلبی یان نابابەتییان کردبێت لەسەر دین، هێزە بەناو عەلمانییەکانیش، مەبەستم یەکێتی و پارتییە، بە شێوەیەکی عەجیب و غەریب مامەڵە دەکەن لەگەڵ دین یان لەگەڵ موقەدەسدا یان لەگەڵ ئیسلامدا، تەنانەت لەگەڵ دینەکانی تریشدا؟

هەردوو شێوەکەی ئامادەگیی عەقڵیەتی دینی لە دونیای ئێمەدا، شێوازی خراپی دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بەرهەم دەهێنن، هەم هێزە ئیسلامییەکان، شێوازێکی خراپ و ناڕاستی دین بەرهەم دەهێنن، ناڕاست بەو مانایەی شێوازێک لە دین بەرهەم دەهێنن ئینسانی ئێمە دەترسێنێت، ئیرادەی لێ دەسێنێتەوە، لە هەندێک دۆخدا گاڵتە بە عەقڵیەتی ئینسان دەکات. تەماشای کۆمەڵێک لەو بەرنامانە بکە، کە لە تەلەڤزیۆنە دینییەکانەوە پیشان دەدرێت، ئینسان شەرم دەکات گوێی لەوەیە ئینسانێک

لـە سـەدەی بیسـت و یەکدا ئـەم جۆرە قسـانە دەکات، مـن خـۆم گوێـم لـە خەتیبی دینی بووە، بەتەفاسیل باسـی ئەوەت بۆ دەکات، چۆن دەچیت بۆ لای خـودا، بـە تەفاسـیل باسـی نـەک تەنهـا بەهەشـت دەکات، بەڵکـوو بـاس لەو قسـە و باسـانەش دەکات کـە ئینسـانەکان لـە بەهەشـتدا لەگـەڵ یەکدیـدا دەیکـەن. گوێـم لـە مەلایـەک بـوو باسـی بەهەشـتی دەکـرد و دەیچـووان بـە بـازاڕی شـێخەڵا لـە هەولێـر. بەکورتـی ئەمڕۆکـە کۆمەڵێـک تەسـەوراتی زۆر بـازاڕی بـە نـاوی دینـەوە دەخرێتـە نـاو کۆمەڵگـەی ئێمـەوە، زۆربـەی هێـزە دینییـەکان بەبەردەوامـی ئـەم کـارە دەکـەن. هێـزە عەلمانییەکانیـش لـە ڕاسـتیدا هەمـان کار دەکـەن، ئەوانیـش دەیانەوێـت وای نیشـان بـدەن، کـە لـە هێـزە دینییـەکان کەمتـر دینـی نیـن، لـە هەمـان کاتـدا، ئـەو دینەشـی کـە ئـەوان بەرهەمـی دەهێنـن، دینێکـە مانـا قـووڵ و ڕۆحانییەکانـی خـۆی لەدەسـت داوە. ئـەم شـێوازە باڵادەسـتانەی دیـن لـە کۆمەڵگـەی ئێمـەدا، ئینسـانی ئێمـە نـاکات بـە ئینسـانێکی بەرپرسـیار، نایـکات بـە ئینسـانێکی ئیرادەگـەر، نایـکات بـە بوونەوەرێکـی عەقڵانـی. هەروەهـا ئـەم شـێوازە لـە دیـن، بەشـێکە لـە پرۆژەیەکـی سیاسـیی دەسـەڵاتگەر، نـەک لـە پرۆژەیەکـی سیاسـیی دیموکـراس. ئـەو ڕۆڵەشـی دیـن لـە تەوزیفکردنـی سیاسـیدا لـە کۆمەڵگەی ئێمـەدا دەیبینێت، ڕۆڵێک نییە بە ئاڕاستەی کرانەوە و یەکتری قبوڵکـردن و بەڕێزەییکردنـی هەقیقەتـەکان و ئـەو شـتانەی دیکـە کار بـکات کـە باسـم کـردن، بەڵکـوو ڕۆڵێـک ئەبینێت، لـە ئاسـتی تاکەکەسـیدا ئینسـانی ترسـاو و بچـووک و وەڕس لـە ژیـان دروسـت دەکات، ئینسـانێک لـە ژیـان و لـە ئیـرادە و لـە لەشـی خـۆی بترسـێت، لـە حەزەکانـی بترسـێت، لـەش و حەزەکانـی وەک پانتاییـەک بـۆ کوفـر وێنـا بـکات. ئینسـانێک ژیانـی خـۆی پـڕ بکات لـە حـەرام و حەڵاڵـی دینـی و ئەخلاقـی و کولتووری. بێگومـان مـن لەگەڵ ئـەوەدا نیـم ئینسـان حـەرام و حەڵاڵـی نەبێت، یـان ئەخـلاق نەمێنێت، مـن لەگـەڵ ئـەوەدام ئینسـان خـۆی توانـای ئـەوەی هەبێـت دەستنیشـانی

ژیانی خۆی بکات، خۆی دەستنیشانی بڕیارەکانی خۆی بکات، خۆی بتوانێت ئیرادەی خۆی بخاتە گەڕ، خۆی حەلاڵ و حەرامەکانی خۆی دەستنیشان بکات. ئینسانێک نەترسێنرێت، دین ئەگەر لەسەر ترساندنی ئینسان ئیشی کرد، هەموو ڕەهەندە ڕۆحییەکانی خۆی لەدەست دەدات. بێگومان مێژووی ئیسلام ئەو شێوازەی لە بیرکردنەوەی دینیی تێدایە کە لەسەر ترساندنی ئینسان کار ناکات. رابیعەی عەدەوی، کە یەکێکە لە سۆفییە هەرە گەورەکانی مێژووی ئیسلام، ڕۆژێک سەتڵێک ئاو بە دەستەوە دەگرێت و بە ڕۆژی نیوەڕۆ بەناو بازاڕدا دەسوڕێتەوە. لێی دەپرسن ئەم سەتڵە ئاوەت بۆ چییە؟ لە وەلامدا دەڵێت، دەمەوێت ئاگری جەهەنەمی پێ بکوژێنمەوە، چونکە ئینسانی باوەڕدار نابێت لە ترسی ئاگری دۆزەخ باوەڕی هەبێت، بەڵکوو دەبێت لەبەر خۆشویستنی خودا باوەڕدار بێت. لای ئەم ئافرەتە، ترس لە دۆزەخ، یان تەماح لە بەهەشت، ئەساسی دین نییە، بەڵکوو خۆشەویستی ئەساسی دینە. بەم شێوەیە، شێوازێک لە دین لە ئیسلام و لە دینەکانی دیکەشدا هەیە، لەسەر دەوڵەمەندکردنی دونیای ڕۆحی ئینسانەکان ئیش دەکات. بەلام بەداخەوە، ئەمڕۆ ئەو شێوازە دینەی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەیە و بالادەستە، لەسەر ترساندن بە ئاگر و سنووردارکردنی ژیان بە کۆمەڵێک حەلاڵ و حەرامی دینی کار دەکات. ڕووە سیاسییەکەی دینیش بریتییە لە بەسیاسیکردن و بە موئەسەسەکردنی دین، بە مەبەستی دروستکردنی نوخبەیەکی دینیی بالادەست کە ئەوان بڕیار بدەن چی لە ولاتەکەدا حەرام بێت و چیش حەلاڵ، چی چاپ بکرێت، کام گۆڤار دابخرێت، کێ و کەی بە ناوی کولتوور و بەناوی ڕەسەنایەتییەوە قسە بکات. پێم وایە هەم هێزە ئیسلامییەکان و هەم هێزە عەلمانییەکانیش، بە شێوازێکی زۆر خراپ، دین بەکار دەهێنن و ڕۆڵێکی زۆر خراپ بە دین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا دەبەخشن.

# ئیسلام و بەعس و دیموکراسیەت*

- ئایا کەوتنی بەعس و هاتنی هێزە ئیسلامییەکان، مەسەلەی دیموکراسیەت لە عێراقدا بە کوێ دەگەیەنن. ئایا دەشێت ئەم هێزە دینییانە ببنە هێزی دیموکرات، یان عێراق لە بەردەم ئەگەری دروستبوونی فاشیزمێکی دینیدایە؟

کەوتنی حزبی بەعس لە عێراقدا کەوتنی ئەو کولتوورە سیاسییە نییە کە لە کۆتاییی شەستەکانەوە ئەم حزبە لە هەموو کون و قوژبنێکی ئەو وڵاتەدا چاندوویەتی، تەنانەت لەناو زۆربەی هەرەزۆری ئەو هێزە سیاسییە ئۆپۆزسیۆنەشدا کە لە دۆخی ڕووبەڕووبوونەوەدا بوون لەگەڵیدا. بەعسیبوون دەستگێڕانێکی شێوێنەرانەبوو بەناو کۆی ڕەهەندە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری و تاکەکەسییەکانی ژیان و بوونی ئینسان لە عێراقدا. لە ڕاستیدا بەعسیبوون، ڕەهەندێکی ڕەمزیی هێجگار بەهێزی هەیە و ئەو ڕەهەندە تا ئەمڕۆش لەناو کۆی دەرکەوتە واقیعییەکانی ژیانی کۆمەڵگە و ئینسانی عێراقیدا ئامادەیە، ئەمەش وا دەکات بەعس لە عێراقی دوای سەدامدا، هێشتا وەک تارماییەک لەناو زۆربەی دەزگا و دامەزراو و بڕیار و بیرکردنەوەکاندا ئامادە بێت.

بە بۆچوونی من، بەعسیبوون لە زۆر ڕووەوە یەکسانە بە فاشیبوون،

یەکسانە بەو فۆرمە لە دەسەڵات، کە چەند لەسەر سڕینەوە و لەناوبردنی شێوازێکی تایبەتی ئینسان و کۆمەڵگە و فیکر و کولتوور دەژیا، لەوەش زیاتر لەسەر بەرهەمهێنانی شێوازێکی تری ئینسان و کۆمەڵگە و فیکر و کولتوور دەژیا. واتە لە کاتێکدا جۆرێکی تایبەتی لە مۆدێلی کۆمەڵگە و ئینسانی لەناو دەبرد، جۆرێکی دیکەی کۆمەڵگە و ئینسانی بەرهەم دەهێنا کە لەگەڵ خەونەکانی خۆیدا بۆ پەیداکردنی هەیمەنەی سەرتاسەری یەکانگیر بێت. لەم پرۆسەی تێکدان و دروستکردنەوەیەدا، بەعس کۆمەڵگە و ئینسانێکی دەسەڵاتگەر و سەرکردەپەرست و دژ بە جیاوازی و نادیموکراسیی دروست دەکرد. کۆمەڵگە و ئینسانێک کە لەسەر تێکەڵێکی سەیر لە ئیتاعەت و ملکەچی لە سەرێکەوە و ئامادەیی بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی لە سەرێکی دیکەوە دەژیا. ئینسان و کۆمەڵگەیەک لە ساتێکدا هەست بە تەنیاییەکی کوشندە دەکەن و خۆیان وەک ئینسانی بەجێماو و تێکشکاو وێنا دەکەن، لە هەمان کاتدا خۆیان بە بەشێک لە بزووتنەوەیەکی گەورە بزانن کە دەخوازێت جیهانیان بۆ بگۆڕێت. بەم مانایە، بەعس بریتییە لە پرۆژەیەکی گەورەی شێواندنی سایکۆلۆژیا و شێواندنی توانای بیرکردنەوەی لۆژیکی لە ئینساندا.

بەکورتی، بەعس مانای هێزێک، کە بەدرێژاییی ٥٣ ساڵی ڕەبەق، لە هەموو دەرکەوت و هەڵسان و جووڵانەوەیەکیدا دژ بە دیموکراسیەت و ئیرادەی تاکەکەس و بیرکردنەوەیەکی سەربەخۆ و عەقڵانی کاری کردووە. بۆیە کۆی ئەو هێزانەی لە پەیوەندییەکی دیاریکراودا بوون لەگەڵ بەعسدا، چ پەیوەندیی ئۆپۆزسیۆن بێت یان پەیوەندیی هاریکاری، هەر هەموویان، بە جۆرێک لە جۆرەکان برێک لە ئاکار و دید و هەڵسوکەوتی بەعسیان تێدا چێنراوە. پریشکێکی ئەو عەقڵیەتە تۆتالیتارییە پڕ زەبروزەنگ و بێ یاساییەیان بەر کەوتووە، کە بەعس بە هەموو شوێنێکدا بڵاوی دەکردەوە.

بێگومـان هێزە ئیسـلامییەکانی عێراق لـەم هاوکێشـەیە بـەدەر نین، ئەگـەر لە هەمووان زیاتر هەڵگری تەماهیکردن نەبن لەگەڵ بەعسدا. ئیسـلامییەکانی عێراق مەترسـیی ئەوەیـان لێ دەکرێت کـە فاشـیزمی بەعسییانە تێکەڵ بکەن بـە فاشـیزمێکی دینـی و بەمـەش بـڕی ئـەو فشـار و توندوتیژییـە ڕەمـزی و مادییـەی لەسـەر تاکەکـەس و کۆمەڵگـەی عێراقـی هەبـووە و هەیـە، گـەورەتر و ترسـناکتر بکەن. هەڵسوکەوتی ئەندامانی جەیشـی مەهدی و هەڵسوکەوتی بڕێکی زۆری هێزە دینییە سوونییەکان، نموونەیەکی بەرچاوی ئەم شـێوازە ترسـناکەی تێکەڵکردنـی بەعسـن بـە تێگەیشـتنێکی فاشـییانە بـۆ دیـن. لـە ڕاستیدا، مەترسـیی تێکەڵکردنی کەلەپووری فاشـییەتی عەلمانییانـەی بەعس، بـە فاشـییەتی دینـی، مەترسـییەکە بەشـی هـەرە گـەورەی هێـزە دینییەکانـی ئەمـڕۆی عێـراق هەڵگریـن. ئـەم هێـزە دینیانـە هێزگەلێکـن لـە جەوهـەری خۆیانـدا دیموکراسـی نیـن و بەئاسـانیش نابنـە هێـزی دیموکـراس. کردنـی موقتـەدای سـەدر بـە پیاوێکی دیموکراس، پێویستی بـە زیـاد لە ئەفسانەیەک هەیـە، گۆڕینـی جەیشـی مەهـدی و جەیشـی موحەمـەد و جەیشـی بـەدر بـە هێزێکی مەدەنی، کـە بتوانـن بـۆ بەرقەراربوونـی دیموکراسـیەت کار بکـەن، مەسـەلەیەکە سـنووری هەمـوو حیکایەتێک تێدەپەڕێنێت. بـەڵام خۆشـبەختانە ئـەو خاڵـەی کـە وا دەکات ئـەم هێزانـە نەتوانـن ببنـە دامەزرێنەری سیسـتمێکی فاشییانە، ئەوەیـە کـە هیـچ یەکێکیـان ناتوانـن هەمـوو دەسـەڵاتەکانی نـاو ئـەو وڵاتـە بگرنـە دەسـت. نەخشـەی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و دینـی و نەتەوەیـی لـە عێراقدا بـە شـێوەیەک دابـەش و پارچەپارچەیـە، هیـچ یەکێـک لـەو هێـزە دینییانـە، بەتایبەتـی هێـزە زۆر توندڕەوەکان، نەتوانن بەتەنیا حوکـم بکـەن و دیدی خۆیـان بەسـەر سـەرجەمی کۆمەڵگـەی عێراقیدا بسـەپێنن.

فاشـیزم، چ لـە فۆرمـە دینییەکەیـدا و چ لـە فۆرمـە عەلمانییەکەیـدا، پێویسـتی بـە بوونـی گروپێکـی بەهێـز هەیـە کـە بتوانێـت کـۆی توانـا و دەسـەڵاتەکانی دەوڵـەت مۆنۆپۆڵ بکات. پێویسـتی بـە هێزێکە بتوانێت ڕەگـە

ئابوورییە هەرە گرنگەکانی وڵات بگریتە دەست، ئایدیۆلۆژیایەکی هەبێت، کە بەشی هەرە زۆری ئەندامانی کۆمەڵگەکەی پێ پەروەردە بکات و کۆمەڵگەش ئامادە بێت قبوڵی بکات. فاشیزم پێویستی بە بوونی حزبێکە، کە بتوانێت لە هەموو بەشە جیاوازەکانی ئەو وڵاتەدا ئامادە بێت و ئەم ئامادەییەشی لەسەر حیسابی لەناوبردن و بێدەنگکردنی هێزە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکانی دیکە بێت، پێویستی بە گەشەدانە بە سیستمێکی سانسۆر، کە هەموو ئاستەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی لەو وڵاتەدا چاودێری بکات، پێویستی بە دەزگایەکی گەورەی پۆلیسی نهێنی هەیە، کە بەوەفا بن بۆ تاقە حزب و تاقە سەرکردە و تاقە ئایدیۆلۆژیا. وەک ئاشکرایە هیچ یەکێک لەم مەرجانە لەمڕۆی عێراقدا ئامادە نین و لەوەش ناچێت لە دە ساڵی داهاتووشدا هەلومەرجی ئامادەبوونیان دروست ببێت. بۆیە من پێم وایە، عێراق وەک چۆن لە بەردەم ئەگەری سیستمێکی دیموکراسیی ڕاستەقینەدا نییە، بە هەمان شێوە لە بەردەم ئەگەری دروستبوونی فاشیزمێکی دینیدا نییە.

غیابی ئەگەری واقیعییانەی فاشیزم وای کردووە هێزە عێراقییەکان، گەرچی زۆربەی هەرە زۆریان ئەگەر یان مەیلی فاشیبوونیان تێدایە، ناچار بن دەسەڵات لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن و دانووستان لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو وڵاتە بکەن. ئەمەش مانای ئەوەی ئەم هێزانە لە ئێستادا ناچارن بە دەستی خۆیان ئەو ئەگەری فاشیبوونەی لە هەناوی هەریەکێکیاندا ئامادەیە، بچەپێنن. فاشیزمەکەی ناو هەناویان دوا بخەن و نەوێرن یان نەتوانن موغامەرەکانی ئەزموون بکەن. هێزێکی وەک هێزەکەی موقتەدا سەدر، کە ناتوانێت هەموو عێراق بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، واتە ناتوانێت فاشیزمە ناوەکییەکەی خۆی بکاتە ئەزموونێکی فاشییانەی واقیعی و لە دەوڵەت و کۆمەڵگەدا پیادەی بکات، ناچارە دەسەڵات لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دابەش بکات، دانوستان بکات و پێکەوە کار بکات. ڕا و

ئەرگومێنت بگۆڕێتەوە، فێر بێت هەندێک جار توندی و هەندێک جار نەرمی نیشان بدات. کۆی ئەم شتانەش توانای چەپاندنی ئەو پرۆژە فاشییە دینییە کە ئەم هێزە هەڵگریەتی، ئاسانتر دەکات. ئەم کارکردنە لەگەڵ ئەوانی دیدا چەندە هەنگاوێکە بە ئاراستەی دوورکەوتنەوە لە فاشیزم، ئەوەندەش هەنگاوێکە بە ئاراستەی نزیکبوونەوە لە دیموکراسیەت. واتە ئەوەی لە عێراقدا دەیبینین، هەنگەشەلێیەکی سیاسییە لەنێوان فاشیزم و دیموکراسیەتدا، بەڵام لە فۆرمی نائامادەیی و غیابی هەردووکیاندا. بەم جۆرە لە عێراقدا دۆخێک لەئارادایە کە دەکرێت بە جۆرێک لە شکڵانیەتی دیموکراسی ناونووسی بکەین، کە کۆمەڵێک هێزی بە جەوهەر فاشی بەڕێوەی دەبەن.

بێگومان ئەو پاڵنەرەی کە ئەخلاقی سیاسیی ئەم هێزانە بەڕێوە دەبات، توانای بێدەنگکردنە. هەریەکێک لەو هێزانە لە کوێدا بتوانێت هێزەکانی دیکە بێدەنگ و کەنارگیر و پەراوێز بکات، دەیکات و بە فاشیزمەکەی ناوی ئەگەری بەرجەستەبوونێکی واقیعی لەو شوێنەدا دەبەخشێت. واتە فیدراڵیەتی عێراقی، وەک لە وتارێکدا کە بەر لە دوو ساڵێک لەمەوبەر نووسیومە، لە فیدراڵیەتێکی دیموکراسییەوە بگۆڕێت بۆ فیدراڵیەتی دیکتاتۆرە لۆکاڵییەکان. بۆیە ئەوەی ئەمڕۆ لە عێراقدا پێی دەگوترێت دیموکراسیەت، شتێک نییە لەسەر کۆمەڵێک کۆڵەکەی پتەو وەستابێت، بەڵکوو دیموکراسیەتێکە لەسەر بنەمای چەپاندنی ئەگەرە فاشییەکانی ناو هەریەکێک لە هێزەکان دروست بووە، بەبێ ئەوەی ئەم چەپاندنە چەپاندنێکی سەد دەر سەد بێت. کە هێزێک لەوانی دی لەو شوێنانەدا زۆر بەهێزترە، ڕادەی ئەم چەپاندنە زۆر نزمترە. لەمەش بترازێت، یەکەمین دەرسێک لە فرۆید و قوتابخانەی شیکارگەریی دەروونییەوە فێری بووبین ئەوەیە، کە هەموو چەپێنراوێک ئەگەری سەرلەنوێ گەڕانەوە و تەقینەوەی نوێی هەیە. چەپاندنی هێز و ئەگەرێک مانای کۆتاییی ئەو هێز

و ئەگەرە ناگەیەنێت، بەڵکوو مانای بێدەنگکردن و کەنارگیرکردنێکی کاتی دەگەیەنێت، کەی ئەم چەپێنراوە هەلومەرجی بۆ ڕەخسا، ئەوا جارێکی تر دێتەوە دەرەوە، زۆرجاریش لە شێوەی هێزێکی توندوتیژی و لە فۆرمێکی تەقینەوەئامێزدا دێتە دەرەوە. بۆیە ئەوەی ئەمڕۆ لە عێراقدا هەیە، دۆخێکی زۆر ناجێگیرە، چ بۆ هێزێک بیەوێت دیموکراسیەت بنیاد بنێت، چ بۆ ئەو هێزانەی هەڵگری ئەگەری فاشیزمن. واتە نە هێزە دیموکراسییەکان دەتوانن دیموکراس بن و نە فاشیستەکانیش دەتوانن فاشی بن. ئەم هێزانە لە ئێستادا ناچارن پێکەوە بژین و پێکەوە هەڵبکەن.

**- تۆ باست لە ئەگەری هاتنەکایەی فاشیزمی دینی کرد، بەڵام ئایا ئەمە بەو مانایەیە، کە دین بەدرێژاییی خەت دژ بە دیموکراسیەتە؟ ئایا ئیسلام و دیموکراسیەت ناکرێت بەیەکەوە کۆ ببنەوە؟ ئایا لە دیندا ڕەگوڕیشەی عەقڵیەتێکی سیاسیی نادۆزرێتەوە لەسەر قبولکردنی جیاوازی کار بکات؟**

لای ئەو خوێنەرانەی بە نووسینەکانی من ئاشنان، بۆچوونی من بەرامبەر بەم پرسیارە ئاشکرایە. من تا ئێستا چەندان جار لەسەر ئەم مەسەلەیە دواوم. من پێم وایە، ئیسلام وەک ئایدیۆلۆژیا، چەند دەکرێت ببێتە هەڵگری پرۆژەیەکی فاشی، ئاواش ئەتوانێت ببێتە هەڵگری پرۆژەی دیموکراسیەت. هەمان شت بە نیسبەت هەموو دینەکانی دیکەشەوە هەر ڕاستە. بڕێکی زۆر لە کەنیسەکانی ئەڵمانیای سەردەمی هیتلەر، دەستیان لەناو دەستی نازییەتدا بوو، وەک چۆن بڕێکی زۆری کەنیسەکانی دەرەوەی ئەڵمانیا، لە بەرەی دژ بە نازییەتدا بوون. ئەوەی دەستنیشانی ئەوە دەکات، ئایا دین دەبێتە هەڵگری کام پرۆژەی سیاسی، خودی دین خۆی نییە، بەڵکوو ئەو گەمەکەرە سیاسییانەن کە دین دەخەنە ناو ململانێی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزییەکانەوە. ئیسلام دینێکە نە دیموکراسە نە فاشی،

بەڵام دەکرێت هەم بکرێتە پرۆژەی بنیادنانی دەسەڵاتێکی فاشییانە و هەم بە پرۆژەی بنیادنانی دەسەڵاتێکی دیموکراسییانە. فاشییەت و نازییەت دوو دیاردەی نوێن و دین دیاردەیەکی هێجگار کۆنە. ئەوەشی پێی وا بێت نازییەت و فاشییەت، یان دیموکراسیەت و مافەکانی مرۆڤ، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەناو دینەوە دێن، ئەوە نە لە فاشییەت و لە نازییەت و نە لە دیموکراسیەت و نە لە مافەکانی مرۆڤ و لە پێش هەمووانیشەوە لە دین خۆشی تێنەگەیشتووە. ئەمانە دیاردەی مێژوویی ئاڵۆزن و ئەمیان سەبەبی ئەوی تریان نییە.

مێژووی دین، مێژووی دەرکەوتنی یەک فیکرەی نەگۆڕ نییە لەناو ساتەوەختە مێژووییە جیاوازەکاندا. مێژووی ئیسلام، بۆ نموونە، مێژووی پێکدادان و ململانێی نێوان هێز و دەسەڵات و لێکدانەوە جیاوازەکانە. ئەوەی بەدرێژایی مێژوو دەستنیشانی ئەوەی کردووە ئیسلام چ ناوەڕۆکێکی هەبێت و باس لە چی بکات و هەڵگری چ مانا و دەلالەتێک بێت، خودی دینەکە خۆی نەبووە، بەڵکوو ئەو هەلومەرجە مێژوویی و سیاسی و عەقلییە بووە کە گەمەکەرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان خۆیان لە هەناویدا دۆزیوەتەوە. بەداخەوە لە ناوەندی ڕۆشنبیریی ئێمەدا و لە پەیوەندی بە ئیسلامەوە دوو گروپ هەن، گەرچی دژبەیەکن، بەڵام هەردووکیان ئیسلام وەک هێزێکی ئەفسانەیی دەستنیشانکەری مێژوو و ڕووداوەکان دەبینن. هەردووکیان ئیسلام دەکەنە مۆتۆڕی ئەو مێژووە درێژەی کۆمەڵگە موسڵمانەکان تێیدا ژیاون و مانا و ڕووداوەکانیان تێدا بەرهەم هێناوە، نەک مێژوو بکەنە ئەو ناوەندەی کە ئیسلام تێیدا مانا و دەرکەوتی جیاوازی وەرگرتووە. یەکەمیان گروپە ئیسلامییەکانن کە جەوهەرێکی نەگۆڕ بە ئیسلام دەبەخشن و دەیکەنە "خوانێکی موقەدەس" کە گوایە کۆمەڵگە لە دەوری کۆ دەبێتەوە. دووهەمیان هێزگەلێکی عەلمانین کە ئیسلام دەکەنە ئەو هێزەی بەدرێژایی مێژوو نەیهێشتووە کۆمەڵگەی

ئێمە ببێتە کۆمەڵگەیەکی سەربەخۆ. ئەم دوو گروهە هەردووکیان گروهی جەوهەرگەران. واتە دوو گروهن هەردووکیان جەوهەرێکی نەگۆڕ دەبەخشنە ئیسلام، جەوهەرێک کە تێپەڕینی زەمەن و گۆڕانی شوێن هیچ کاریگەرییەک لەسەر ئەو دینە بەجێ ناهێڵێت. جیاوازیی ئەم دوو گرووهە لەوەدایە یەکێکیان مانایەکی پۆزەتیڤ و ئەوی دیکەیان مانایەکی نێگەتیڤ بەم جەوهەرە ئیسلامییە گریمانکراوە دەبەخشێت. ئەمە لە کاتێکدا ئەوەی دەستنیشانی ئەگەرەکانی هەر دینێک دەکات، جەوهەری دینەکە نییە، لە ڕاستیدا هیچ دینێک نییە جەوهەرێکی نەگۆڕی هەبێت، دین بریتییە لە مێژووی دین، مێژووی دینیش بریتییە لە مێژووی دەرکەوتە جیاوازەکانی ئەو دینە لەناو واقیعی کۆمەڵایەتیدا. ئەمەش مانای دابەزینی دین بۆ ناو پەیوەندییەکانی دەسەڵات و جێنشینبوونی لەناو خەیاڵی کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسیی هێزە جیاوازەکاندا. ئەوەی دەستنیشانی فۆرمی دەرکەوتنەکانی هەر دینێک لە مێژوودا دەکات، هاوکێشەکانی دەسەڵات و ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسی و ئابووری و توانای ڕاڤەکردن و ئاستی گەشەکردنی زانست و ئامادەگیی ڕەخنەگرانەی کۆمەڵگەیە وەک هێزێکی گەورەی ڕاڤەکردن. بەخشینی جەوهەرێکی نەگۆڕ بە دین، نەفیکردنی سیفەتی ڕاڤەکارییە لە ئینسان، سەندنەوەی ئەو ڕەهەندە هێرمۆنێتیکییە گرنگەیە لە ئینسان، کە ئینسان لە زیندەوەرەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.

بۆیە لە ڕووی تیۆرییەوە، من ئەگەری دروستبوونی هێزی دینی دیموکراس، جا چ ئیسلامی بێت یان غەیرە ئیسلامی، ڕەت ناکەمەوە. پێم وا نییە دین بەدرێژاییی خەت، ناکۆک و دژ بە دیموکراسیەت بێت، دەکرێت هێزە دینییەکان، جا چ لە فۆرمی هێزی سیاسیدا بن، یان وەک بەشێک لە کۆمەڵگەی مەدەنی ئامادە بن، ڕۆڵی سیاسیی گرنگ ببینن و ئەم ڕۆڵەشیان بە ئاراستەی بەرقەرارکردنی دیموکراسیەت بێت. مێژووی

ڕۆژئاوا، یەکەمین مێژووە کە ئەم ئەگەرە دیموکراسییانەی کارکردنی دین دەسەلمێنێت. دیموکراسیەتی ڕۆژئاوایی، کە نزیکەی سێ سەدە مێژووی هەیە، دیموکراسیەتێک نییە کە هێزە دینییەکان بەدرێژاییی خەت، تییدا لە هەڵوێستی دژ بە دیموکراسیەتدا بووبن، بەپێچەوانەوە بڕێکی بەرچاوی هێزە سیاسییەکانی ڕۆژئاوا، هێزی دینی بوون، یان لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدا بوون لەگەڵ دیندا، بەلام لە هەمان کاتدا هێزێک بوون بۆ دیموکراسیەت کاریان کردووە. وەک چۆن بە دیوی ئەودیودا هەر هێزێک کە گوتی عەلمانی و نادینییە، مانای ئەوە نییە هێزێکی دیموکراسییە. لێرەشدا دیسانەوە مێژووی ڕۆژئاوا نیشانمان دەدات، کە هێزی عەلمانی دەشێت ستالینیەت و نازییەت دروست بکات.

بەکورتی، وەک چۆن فاشیزم دەکرێت هەم دینی و هەم عەلمانی بێت، ئاواش دیموکراسیەت دەشێت هەم دینی و هەم عەلمانی بێت. هەموو گرێدانەوەیەکی حەتمییانەی دیموکراسیەت بە عەلمانیەتەوە، هەڵەیەکی تیۆرییە، وەک چۆن هەموو بەستنەوەیەکی دین بە فاشیزمیشەوە بە هەمان شێوە هەڵەیە. بەلام بۆ ئەوەی هێزێکی دینی، یان ڕاستتر بدوێم، هێزێک بە ئایدۆلۆژیایەکی دینییەوە، ببێت بە هێزێکی دیموکراس، دەبێت ئەگەرەکانی فاشییەتی لەناو خۆیدا کوشتبێت، یان لە واقیعێکدا بژی ئەو ئەگەرانەی تێدا بکوژێت. واتە بووبێتە هێزێک، قبوڵکردنی جیاوازی و قبوڵکردنی ڕێژەییبوون و قبوڵکردنی پارچەپارچەبوونی سیستمی هەقیقەتی قبول بێت. بۆ گەیشتن بەم عەقڵییەتە تایبەتە کە دیموکراسیەت پێویستی پێیەتی، دەکرێت ڤۆڵتێر ببێتە مۆدێل، کە دەڵێت "من لەگەڵ ڕاکەتدا ناکۆکم، بەلام ئامادەم تا مردن بەرگری لە مافی ڕادەربڕینت بکەم، " وەک چۆن دەکرێت بۆچوونەکەی ئیمامی شافیعی ببێت بە مۆدێل کە دەڵێت "بۆچوونی من ڕاستە بەلام دەشێت هەڵە بێت، بۆچوونی تۆ هەڵەیە بەلام دەشێت ڕاست بێت." بەکورتی، من دەمەوێت ئەگەری ئەوە

دانەخرێت کە دەشێت هێزێکی سیاسیی دینی هەبێت لە ڕیژەییبوونی خۆی و بۆچوونەکانی تێبگات، ئەو ڕاستییە قبوڵ بکات کە سیاسەتەکانی ئەو قابیلی ئەوەن کە هەڵە بن، دان بەوەدا بنێت کە ئینسان ئازادیی باوەڕ و ویژدان و ئایینی هەیە. ئەو دیدە قبوڵ بکات ئەو وەک ئیسلامییەک چەند ماف و ئەرکی هەیە، بێدینێکیش یان خاوەن دینێکی دیکە، هەمان ماف و ئەرکی لەسەر شانە. ئەمەش مانای ئەوەی دین لە مانا تەقلیدییەکەی خۆی دەر چووبێت و بووبێتە دینێکی عەلمانی سەر بە جیهان و سەر بە سەردەم. هێزە دینییەکان بۆچوونەکانی خۆیان وەک دەرکەوتی موقەدەس نەبینن، بەڵکوو وەک هەندێک بۆچوونی تایبەت وێنای بکەن. عەلمانیەت وەک چۆن ئایدیۆلۆژیای نادینی بەرهەم دەهێنێت، ئاواش دەسکاری مانا تەقلیدییەکانی دین دەکات و دەیکاتە "دینێکی عەلمانی." دەبێت ئاشکرا بێت من لێرەدا باس لە عەلمانیەت ناکەم وەک ئایدیۆلۆژیا، بەڵکوو وەک پرۆسەیەکی مێژوویی فرەلایەنی گۆڕان و تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی وێنای دەکەم. زۆرجار ئەوەی دین دەکاتە هێزێکی دژ بە دیموکراسیەت، ئەو حەماسەتە دینییەیە کە لای هێزە ئسوڵییەکان دروست دەبێت، حەماسێک کە تا ئەم ساتەی ئێستامان بە شێوەیەکی گشتی بە زمانی شەهادەت و بە زمانی بەکارهێنانی توندوتیژی و لەناوبردنی فیزیایی نەیاران دەدوێت. جگە لەمە، فاکتەرێکی دیکە، کە هێزە دینییەکان لە دیموکراسیەت دوور دەخاتەوە، تێگەیشتنیانە بۆ هەقیقەت. لای ئەم هێزانە، دین هەڵگری هەقیقەتێکی ڕەهایە و دەبێت سەرجەمی هەقیقەتەکانی دیکە لە بەردەمیدا بەنووچدا بێن، لە ڕاستیدا ئەم نووچدانە لەسەر ئەرزی واقیع، مانای نووچدان لە بەردەم ئەو هێزانەدا کە بە ناوی ئەو هەقیقەتەوە ئەدوێن، یان خۆیان خۆیان بە پارێزەر و بەرجەستەکەری ئەو هەقیقەتە دەزانن. گۆڕینی ئەم هەقیقەتانە بۆ ڕا، دەروازەی گۆڕانی ئەم هێزانەیە بۆ هێزی دیموکراس.

خاڵێکی دیکەی نادیموکراسیبوونی هێزە دینییەکان، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وێناکردنەی ئەم هێزانە بۆ ئەخلاق هەیانە، ئەم هێزانە ئەخلاقی راستەقینە کورت دەکەنەوە بۆ یەک شێوازی هەڵسوکەوت و ئەم تاقە شێوازەش وەک شێوازێکی دینی دەناسێنن. سەرجەمی هەڵسوکەوتەکانی دی کە لەگەڵ ئەو شێوازە دینیەی ئەخلاقدا ناگونجێت، بە حەرام و ناکردە لەقەڵەم ئەدەن.

بەکورتی، دین لە دۆخی داخران و دۆگماییبوونیدا، لە دۆخی دژ بە جیاوازییبوون و دژ بە کرانەوەدا، لە دۆخی مۆنۆپۆلکردنی هەقیقەت و مانادا، لە دۆخی سەپاندنی بەزۆری سیستمێکی ئەخلاقیدا، دەبێتە دینێک، ئەگەرەکانی فاشیزم لەناویدا بەهێزتر دەبێت تا ئەگەرەکانی دیموکراسیەت. بەڵام دین لە دەرەوەی ئەو مەرجانەدا، دەکرێت ببێتە یەکێک لەو هێزانەی کە بە قازانجی بەرقەراربوونی دیموکراسیەت کار بکات. واتە دین دەشێت هەم ببێت بە ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسیی پەرگیر و ترسێنەر، هەم دەشێت ببێتە ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسیی کراوە و گونجاو لەگەڵ سیستمی دیموکراسیدا. وەک وتم، کێشەی هێزە دینییەکانی ئەمڕۆی عێراق، ئەوەیە کە لە یەکەمیانەوە نزیکن نەک لە دووهەم، لەبەر دەرگای فاشییەتدا راوەستاون، نەک لە بەردەم دەرگای دیموکراسیەتدا.

– پەیوەندیی نێوان دیموکراسیەت و ئازادی و دیموکراسیەت و دادپەروەری کۆمەڵایەتی، چۆن دەبینیت، ئایا دیموکراسیەت لە عێراقدا دەتوانێت ئازادی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی پیادە بکات؟

شەڕی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و شەڕ بۆ بە لیبراڵکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی، دوو شەڕی درێژن و بە دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراسی کۆتاییان پێ نایەت. ئەم دوو شەڕە، واتە شەڕ بۆ لانی کەمی یەکسانیی

کۆمەڵایەتی و شەڕ بۆ ئازادی و سەربەخۆیی تاکەکەسی، دوو شەڕن بە چەند کەس و گروپ و تاقمێک بەتەنها ناکرێت، بەڵکوو پێویستە بەشی هەرە گەورەی کۆمەڵگە بە شێوەیەکی ڕۆژانە و لە بواری جیاجیادا ئەنجامی بدەن. دەبێت سەرجەمی ئەو هێزانە کاری بۆ بکەن کە هەست دەکەن ناعەدالەتییان بەرامبەر کراوە و ئیرادە و ویستی تاکەکەسیشیان پێشێل کراوە. تەنانەت لە سیستەمە دیموکراسییە چەسپاوەکانیشدا هێزە کۆمەڵایەتییەکان و تاکەکەسەکانیش، بەردەوام ئەم شەڕە دوو جەمسەرییە دەکەن. بەرقەراربوونی دیموکراسیەت وەک سیستمێکی سیاسی، مانای ئەوە نییە کە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و پاراستنی ئازادییە تاکەکەسییەکان بۆ هەتاهەتایە گرەنتی کراون و پارێزراون. دەشێت دیموکراسیەت وەک سیستمی سیاسی لە فۆرمی جێگۆڕکێی دەسەڵات و ڕێکخستنی هەڵبژاردن و ئامادەگیی میدیای ئازاددا بەرقەرار بێت، بەڵام لەپاڵیشیدا ناعەدالەتییەکی گەورە لە دابەشکردنی سامان و دابەشکردنی هەل و ئەگەری پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا ئامادە بێت، یان سنووری ئازادییەکانی تاکەکەس زۆر بەرتەسک و بچووککراو بێت. واتە دیموکراسیەت ناتوانێت ڕاستەوخۆ و بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەو دوو کێشە گەورەیەی بوونی کۆمەڵایەتی و بوونی ئینسانی چارەسەر بکات. نموونەی هەرە بەرچاوی ئەم ڕاستییە، دیموکراسیەتی هیندستانە، کە لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بە گەورەترین دیموکراسیەتی دونیا دەژمێردرێت. سیستمی دیموکراسیەت، لە هیندیدا بە ڕادەیەکی باش کار دەکات، بەڵام کۆمەڵگەی هیندی کۆمەڵگەیەکی زۆر ناعادیلە و ئازادیی تاکەکەسیش تێیدا زۆر سنووردارە. لەبەر ئەوە ناکرێت پرسیاری عەدالەت و پرسیاری ئازادی ببەستینەوە بە بوون، یان نەبوونی دیموکراسیەتەوە. بێگومان بوونی دیموکراسیەت ڕێگەی دابینکردنی ئەم دوو ڕەهەندە گرنگە ئاسانتر دەکات، بەڵام دیموکراسیەت بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی مانای بەرقەراربوونی عەدالەت و دەستەبەرکردنی ئازادیی

تاکەکەسی نییە.

ئەم لێکجیاکردنەوەیە بەرەو ئەوەمان دەبات کە بڵێین بەڵی دەکرێت سیستمێکی سیاسی هەبێت کە تا ڕادەیەکی زۆر لە کارکردندا دیموکراسی بێت، بەڵام ئەو ژینگەیەی کە تێیدا ئامادەیە، ژینگەیەک نەبێت لیبراڵ بێت. لیبراڵ بە مانای بوونی ژینگەیەک کە گرنگترین پرنسیپ تێیدا پرنسیپی ئازادیی و ئۆتۆنۆمبوونی تاکەکەس بێت. ئازادی و ئۆتۆنۆمبوونی تاکەکەسی، گرنگترین دوو چەمکێکن کە لیبراڵیزم بەرگرییان لێ بکات. مێژووی دیموکراسیەتیش، مێژوویەک نییە، کە بەبێ ئەم دوو پرنسیپە نەیتوانیبێت بژی. تا کۆتاییی شەستەکانی سەدەی بیستەم، واتە تا سەردەمانی شۆڕشی ١٩٦٨ ی قوتابییان و گەنجان لە ئەوروپا، لە وڵاتێکی وەک هۆڵەندادا ئینتیمای دەستەجەمعی لە ئینتیمای تاکەکەسی گرنگتر بووە. ئەوەی شووناسی تاکەکەسەکانی دەستنیشان کردووە ئەندامبوونیان بووە لە یەکێک لەو چەند گروپە دینی و سیاسییانەدا کە لەو وڵاتەدا ئامادە بوون، بەتایبەتی ئەندامبوونیان لە گروپە دینییەکاندا. لەمەش خراپتر پەیوەندیی نێوان ئەو گروپە دینییانە بە جۆرێک بووە، کە ئەندامانی ئەمیان، بۆ نموونە کاسۆلیکەکان، نەیتوانیوە ژن لە گروپەکەی تریان بهێنێت، یان دوای زەحمەتێکی زۆر توانراوە کارێکی لەو بابەتە ڕێک بخرێت. واتە ئینسانەکان ئازاد نەبوون تەنانەت لە هەڵبژاردنی شەریکی ژیانی خۆیاندا. لە ڕاستیدا ئەم دۆخە لە بەشێکی زۆری کۆمەڵگە ئەوروپییەکانی دیکەشدا بە پلە و ڕادەی جیاوازتر لەئارادا بووە. تەنها لە کۆتاییی شەستەکانەوە، پرۆسەی بەتاکبوونی تەواوەتی و پرۆسەی لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی شووناسە دەستەجەمعییەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان دروست دەبێت. ئەمە چی دەگەیەنێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دیموکراسیەت لە هۆڵەندا، مێژوویەکی درێژی هەبووە لە ژینگەیەکدا، کە ناتوانین بە ژینگەیەکی لیبراڵ ناونووسی بکەین. پێشم وایە لە وڵاتەکانی

دیکەی ئەوروپادا دۆخێکی نزیک بەم دۆخەی هۆڵەندا لەئارادا بووە.

بە بۆچوونی من، دیموکراسیەت سیستمێکە زیاتر پابەندە بە ئامادەگی کۆمەڵێک نوخبەوە کە توانای یەکدی قبوڵکردن و دابەشکردنی دەسەڵاتیان هەبێت، نەک پابەند بێت بە ئامادەگیی کۆمەڵگەیەکەوە تیایدا هەمووان لیبراڵ بن و لیبراڵیزم ئەو پانتاییە کولتووری و ڕەمزییە بێت، کە پەیوەندیی نێوان گروپەکان و تاکەکان ڕێک بخات. دیموکراسیەت پابەندی ئامادەگیی کۆمەڵێک نوخبەیە، کە لە گەشەی خۆیاندا زیاتر بکرێنەوە و زیاتر مەودا خۆش بکەن بۆ هێزی کۆمەڵایەتیی نوێ، کە بتوانن نوخبەی خۆیان بەرهەم بهێنن و ببنە بەشێک لە بازنەی دەسەڵات. ئەوەی بۆ دیموکراسیەت پێویستە، ئەوە نییە، کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە باوەڕ بە دیموکراسیەت بهێنن، بەڵکوو ئەوە گرنگە، کە نوخبەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بچنە پرۆسە و ململانێیەکی یاسایی و ئاشتیخوازەوە، کە سندوقەکانی دەنگدان داوەر بێت لەنێوانیاندا. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە، ئایا هێزە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن نوخبەی خۆیان پێبگەیەنن و پێگەی خۆیان لەناو دەسەڵاتدا بکەنەوە و ببنە بەشێک لەو تۆڕی دەسەڵاتە سیاسییەی کە بەسەر کۆمەڵگەدا دەکشێت، یان نا؟

ئێستا با لەم سەرەتا تیۆرییەوە بگەڕێینەوە بۆ عێراق. دەوڵەتی عێراقی لە قۆناغی دروستبوونییەوە تا ساڵی ١٩٥٨ دەوڵەتێک بووە بە شێوەیەک لە شێوەکان، جێگەی زیاد لە نوخبەیەکی سیاسیی تێدا بووەتەوە. ئەم نوخبانە توانیویانە لە فۆرمی حزب و گروپی سیاسیی ڕێکخراودا ئامادە بن. جگە لەمە، لە دەرەوەی دەوڵەت خۆشیدا، کۆمەڵێک هێز و گروپ و کەسایەتیی جیاواز هەبوون، کە لانی کەم دەسەڵاتێکی ڕەمزی و مەعنەویی گرنگیان هەبووە و کاریگەرییان لەسەر بڕیاری سیاسی و لەسەر داڕشتنی سیاسەتیی دەوڵەت هەبووە. بێگومان لە هەموو ئاستەکانی دابەشکردنی دەسەڵاتدا، کەموکوڕی گەورە هەبووە،

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، جۆرێک لە دابەشکردن و دەستگۆڕکێی دەسەڵات هەبووە، کە فۆرمێکی سەرەتایی دیموکراسیەتیش بەرقەرار بووە. بەڵام مێژووی دوای ساڵی ١٩٥٨، مێژوویەکە تەواو پێچەوانەی مێژووی بەر لە ١٩٥٨، مێژووی دوای ١٩٥٨ دەبێتە مێژووی مۆنۆپۆلکردنی دەسەڵات و مێژووی لەناوبردنی فرەتەوەرەیی دەسەڵات لە عێراقدا، دەبێتە مێژووی لەناوبردنی نوخبەیەک بۆ سەرجەمی نوخبەکانی دیکە، دەبێتە سەرەتای کۆکردنەوەیەکی بەرتەسک و ترسناکی هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی نوخبەیەکی نیوە سەربازی و نیوە مەدەنی بچووکدا. بە جۆرێک، لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا کار دەگاتە ئەوەی سەرجەمی دەسەڵاتەکان لە دەستی سەدام حوسەین و خێزان و خێڵ و دۆستەکانیدا کۆ ببێتەوە و هیچ هێزێکی دیکە لەناو جومگە گرنگەکانی دەوڵەتی عێراقیدا بوونی نەبێت.

ئەمە لە ئاستی دەسەڵاتی ناو دەوڵەتدا. لەناو کۆمەڵگەشدا بەعس لەوەدا سەر کەوت کە ئینسانی عێراقی لە کۆی ئینتیما دەستەجەمعی و کۆییە تەقلیدییەکانی دابماڵێت و لە بەردەم دوو ئەگەردا دا یبنێت: یان بوون بە بەعسی یان تەنیاکەوتن و لەدەستدانی هەموو پەناگەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی. بە مانایەکی دیکە، بەعس لە ئاستی کۆمەڵگەدا لەوەدا سەر کەوت، لە ڕێگەی پرۆسەی بەبەعسیکردنی کۆمەڵایەتییەوە، بەشی هەرە گەورەی شێوە دەسەڵاتە تەقلیدییەکانی ناو کۆمەڵگەی عێراقی لەناو ببات و حزب ببێتە جێگرەوەی هەموویان. واتە دەسەڵاتی حزب ببێتە جێگرەوەی دەسەڵاتی خێڵ و چین و گروپە دینی و ڕۆشنبیرییەکان.

بە مانایەکی دیکە، مێژووی دوای ١٩٥٨ ی عێراق، مێژووی لەناوبردنی نوخبە جیاوازەکانی قۆناغی پێشووە لەلایەن نوخبەیەکی نیمچە سەربازی و نیمچە مەدەنییەوە، کە لەناو دەزگاکانی حزب و دەزگا دەوڵەتییەکاندا دروست دەبوون. نوخبەیەک، کە دەسەڵاتی سیاسیی خۆی بەکار دەهێنا

بۆ بەهێزکردنی پایە ئابووری و مادییەکانی خۆی. لە ڕاستیدا ئەم نوخبەیە دەسەڵاتی سیاسیی و دەسەڵاتی ئابووری بە شێوەیەک تێکەڵ دەکات، کە مەسافەیەک لە نێوان بڕیاری سیاسی و بڕیاری ئابووریدا نەمێنێتەوە. ئەوەی کە بڕیارە سیاسییەکان دەر دەکات، هەمان ئەو کەسانە بن کە بڕیارە ئابوورییەکانیشیان بەدەستە. ئەمەش ئەو میکانیزمە جەهەنەمییەی هێنایە پێشەوە کە سیاسەتکردن و دەوڵەمەندبوون زۆر بەتوندی بەیەکەوە گری بدات. بنەمای بەفایشبوونی دەوڵەتی پۆست کۆلۆنیالی عێراقی لەم سڕینەوەیەی سنووری نێوان نوخبەی سیاسی و نوخبەی ئابووریدایە، یان گۆڕانی نوخبەی سیاسیی خۆی بۆ بەهێزترین نوخبەی ئابووری لە وڵاتدا. ئەم دۆخە دواجار لە قۆناغی دەسەڵاتداریتی سەدامدا دەوڵەتی عێراقی دەکاتە دەوڵەتێکی تۆتالیتاری و بەعسیش بە حزبێکی فاشی. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێ بدەم، ئەو ڕاستییەیە کە نوخبەی سیاسی و ئابووریی تازە لە عێراقدا، لە قۆناغی باڵادەستی تەواوی سەدام حوسەیندا، سنوورەکانیان بە شێوەیەکی ترسناک تێکەڵ دەبێت و کورت دەبێتەوە بۆ کەسوکارەکەی سەدام حوسەین خۆی.

لە ئاستی کۆمەڵگەشدا، تۆڕێکی گەورەی دیسپلین و چاودێری دروست دەبێت، کە دەست دەخاتە ناو شەخسیترین ڕەهەندەکانی ژیانی ئینسانەوە لە عێراقدا. هەموو ئەمانەش جۆرێک لە ئینسانی بەرهەم هێنا کە دەکرێت بە ئینسانی "بێئینتیما و تەنیاکەوتوو" ناونووسی بکەین. مێژووی هەفتاکان و هەشتاکانی عێراق، مێژووی دروستکردنی لەشکرێکی گەورەیە لەم تاکەکەسە تەنهاکەوتووانە. چەند دەوڵەتی عێراقی لە دەوڵەتی نوخبەیەکی سەربازی مەدەنییەوە دەبوو بە دەوڵەتی خێڵ و خێزان و بنەماڵەی سەدام، ئاواش کۆمەڵگەی عێراقی لە کۆمەڵگەی گروپە جیاوازەکانەوە دەبوو بە کۆمەڵگەی تاکەکەسە تەنها و بێمتمانە و دوودڵەکان. چەند بازنەی دەسەڵات بچووک دەبوووەوە بۆ بازنەی

کەسە نزیکەکان لە سەدام خۆیەوە، ئەوەندەش لە خوارەوە تەنیا یان هەتیوکەوتنی کۆمەڵایەتی تاکەکەسەکان گەورەتر دەبوو. یەکێک لە نهێنییە گەورەکانی مانەوەی دەسەڵاتی سەدام لە عێراقدا، لە بەگەڕخستنێکی ترسناکی ئەم میکانیزمە کۆمەڵایەتییەدا بوو.

بەڵام لە نەوەدەکاندا ئەم دۆخە گۆڕا، لەدوای ڕاپەڕینەوە بەعس وەک دەوڵەت و وەک دەزگا و وەک ئایدیۆلۆژیا، هێزی کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنی جارانی نەما. ڕاپەڕین لە عێراقدا بەشێکی گەورەی دەزگاکانی حزب و دەوڵەتی بەعسی لە عێراقدا لەبەریەک هەڵوەشاندەوە و ژمارەیەکی زۆری ئەو ئەندامانەی بەعسیش کوژران کە کاریان دیسپلینکردن و ترساندنی ئینسان بوو لە عێراقدا. ڕژێمی سەدام ناچار بوو بۆ مانەوەی خۆی بڕێکی گەورەی ئەو دەسەلاتانەی کە جاران لە دەستی دەوڵەت و حزبدا کۆی کردبوونەوە، ببەخشێت بە سەرکردە دینی و عەشایەرییەکان. بەو هیوایەی لە ڕێگەی ئەو سەرکردە دینی و عەشایەرییانەوە بتوانێت ئەمجارەیان بە شێوەیەکی نوێ کۆمەڵگەی عێراقی کۆنترۆڵ بکات. لەم قۆناغەدا دەکرێت باس لە بەخێڵەکیکردنەوەی کۆمەڵگەی عێراقی بکەین، باس لە زیندووکردنەوەی کۆمەڵێک پەیوەندیی تەقلیدیی خێڵەکی و دینی بکەینەوە کە بەعس لە قۆناغی یەکەمی دەسەڵاتدارێتیدا لە هەفتاکان و هەشتاکاندا بەشێکی زۆریانی لەناو بردبوو. ئەم پرۆسەی بەخشینی دەسەڵاتە بە سەرکردە خێڵەکی و دینییەکان، سەرەتای دروستبوونی دوو نوخبەی تر بوو کە جیاواز بوون لەو نوخبە دەسەڵاتدار و حزبییەی بەعس خۆی بەدرێژایی سالانی بەر لە ڕاپەڕین دروستی کردبوو: مەبەست لەو دوو نوخبەیە، نوخبەیەکی خێڵەکی نوێیە کە لە دەسەڵاتی سەرۆک خێڵەکاندا بەرجەستەیە، لەگەڵ نوخبەیەکی دینیدا کە لە دەسەڵاتی پیاوانی ئاییندا بەرجەستەیە. بەعس بەدرێژاییی نەوەدەکان کاری لەسەر دروستکردنی ئەم دوو نوخبەیە کرد و تاقە مەرجێکیشی بۆ بوونی ئەم

دوو نوخبەیە بە دوو نوخبەی دەسەلاتدار بریتی بوو لە دڵسۆزییان بۆ کەسی سەدام حوسەین خۆی.

کە ئەمەریکا بەعسی ڕووخاند، ئەم دوو نوخبەیە لەناو عێراقدا بەهێز بوون. وەک دەبینێن لە ئێستای دونیای دوای سەدامدا، ئەم دوو نوخبەیە لە فۆرمی حزب و ڕێکخراوی سیاسی و ناسیاسیدا ئامادە و چالاکن. گرووپەکەی موقتەدای سەدر و هەیئەی عولەمای موسلیمین، نموونەی ئەو نوخبە دینییەن کە لە قۆناغی دوای ڕاپەڕیندا دروستبوون. ئەو خێڵانەشی کە ئەمڕۆ چ لەناو شیعە و چ لەناو سوونەدا بەهێز و کاریگەرن، نموونەی نوخبەی دووهەمن. بەلام ئەمانە هەموو نوخبەکانی عێراقی ئەمڕۆ نین. دوای کەوتنی سەدام و گەڕانەوەی هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان کۆمەڵێک نوخبەی دیکە دروست بوون.

بەکورتی، لە عێراقی ئەمڕۆدا، کۆمەڵێک نوخبەی دینی و عەلمانی و ئەتنی و نەتەوەیی و لیبرال و نالیبرال ئامادەن، کە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا زیاتر ئاشکرا دەبێت کە نە ئەتوانن بەیەکەوە کار بکەن، نە ئەشتوانن دۆخی جەنگێکی ناوخۆیی سەرتاسەری لەگەڵ یەکدا بەرپا بکەن. بەم جۆرە لە سبەینێی دوای کەوتنی سەدامدا عێراق کەوتە بەردەم نەخشەیەکی سۆسۆلۆژی نوێ، ئەم ولاتە بوو بە شوێنی کۆبوونەوەی کۆمەڵێک نوخبە کە پێشتر هەموویان بێدەنگ و کەنارگیر و ڕاونراو بوون.

بە باوەڕی من، ئەم دۆخەیە وا دەکات پرسیاری دیموکراسیەت لە عێراقدا پابەندی ئەوە نەبێت ئایا هەموو تاکەکەسێکی عێراقی دەبێتە ئینسانێکی دیموکراس بۆ ئەوەی سیستمی دیموکراسیەت لەم ولاتەدا بنیاد بنرێت، هەروەها پابەندی ئەوەش نەبێت ئایا کۆمەڵگەی عێراقی کۆمەڵگەیەکی لیبراڵە، یان نا، بەڵکوو بە پلەی یەکەم پابەندی ئەوە بێت ئایا ئەو نوخبە تازانەی ئەمڕۆ لە عێراقدا دروستبوون، تا چەند ئامادەن

چوارچێوەیەکی سیاسی و یاسایی و ئەخلاقی بۆ ململانێ و کێبڕکێ سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان دروست بکەن. تا چەند ئەم نوخبانە دەتوانن بازنەیەکی نوێی دەسەڵات لە عێراقدا دروست بکەن کە توانای ئەوەی هەبێت زۆربەی ئەو هێزانەی ئەمڕۆ لەو وڵاتەدا ئامادەن، بگرێتە خۆی. بە باوەڕی من، ئەگەر عێراق دەروازەیەکی بۆ دیموکراسیەت تێدا بێت، ئەوا دەبێت ئەم دەروازەیە بێت، دەنا هەموو ئەگەرەکانی تر، تاریکییەکی گەورەیە. پرسیارەکە ئەمەیە: ئایا ئەم نوخبانە دەکەونە ناو گەمەی لەناوبردنی یەکدییەوە، یاخود گەمەی یەکدی قبوڵکردنێکی یاسایی و دەستووری دەست پێ دەکەن؟

لە هەمان کاتدا، بە بۆچوونی من، شەڕی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و شەڕی لیبراڵیزم لە عێراقدا، دوو شەڕ نین ئەم نوخبانە بیکەن، بەڵکوو دوو شەڕن دەبێت کۆمەڵگەی عێراقی بیان کات. ئەم نوخبانە لەپێناوی مانەوەی خۆیاندا گەر لەوەدا سەر کەوتن دەسەڵاتێکی دەستووری بنیاد بنێن و کایەی سیاسی لە عێراقدا بە ئاقاری دیموکراسیەتدا ببەن، ئەوکات زەمینەی ئەنجامدانی جەنگ بۆ عەدالەت و جەنگ بۆ لیبراڵیزم ئاسانتر دەبێت. واتە هەوڵدانی ئەم نوخبانە بۆ پاراستن و هێشتنەوەی خۆیان لە چوارچێوەیەکی یاساییدا، لە هەمان کاتدا زەمینەی شەڕی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و شەڕی لیبراڵیزم لەم وڵاتەدا خۆش دەکەن. بەڵام پێچەوانەی ئەمە، دەرەنجامەکەی پێچەوانە دەبێت. بێگومان بوونی ئەو دابەشبوون و هەمەجۆرییەی ئەمڕۆ لەناو نوخبەکانی عێراقدا هەن، لە دۆخی بەرقەراری ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتیدا، ئەنجامدانی ئەم دوو شەڕە ئاسانتر دەکات. بەڵام دواجار ئەم دوو شەڕە، شەڕی ئینسانی عێراقین و خۆی نەبێت کەسی دی لەسەر ئەم ئەستێرەیەدا نییە لەباتی ئەو بیانکات.

**- ئەی دۆخی کوردستان چۆن دەبینیت؟ ئایا تا چەند دەکرێت ئەو ئەزموونەی لە کوردستاندا هەیە بە ئەزموونێکی دیموکراسیی ڕاستەقینە ناو ببەین؟**

من تا ئێستا چەند جارێک وتوومە ئەوەی لە کوردستاندا بەرقەرارە، دیموکراسیەت نییە. هەروەها وتووشمە، نە پارتی و نە یەکێتی دوو هێز نین بە کردەوە دیموکراس بن. دیموکراسیەت لای ئەم دوو هێزە ئەوەندەی مادەیەکی ئیعلامییە، ئەوەندە چەمکێک نییە بۆ دامەزراندنی سیستمێکی سیاسیی کراوە و بنیادنانی دەسەلاتێک قابیلی دەستگۆڕکێ و لێپرسینەوە و قابیلی لێکجیاکردنەوەیەکی ڕاستەقینە بێت. بۆ ئەوەی لە ڕەگە کۆمەڵایەتییەکانی لاوازی دیموکراسیەت لای پارتی و یەکێتی تێبگەین، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ خوێندنەوەیەکی وردی مێژووی دوای ڕاپەڕین و لەو خاڵەوە دەست پێ بکەین کە پێشمەرگە چەکدار و سەرکردە سیاسییەکانی ئەم دوو حزبە لە شاخەکانەوە بەرەو ناو شارەکانی کوردستان گەڕانەوە.

هەموومان باشمان لەبیرە لەدوای کشانەوەی ئیدارەکانی بەعس لە بڕێک لە ناوچەکانی کوردستان، ئەم دەڤەرە بە کردەوە کەوتە ژێر دەستی پارتی و یەکێتییەوە. هێزە سیاسییەکانی تر زۆر لەوە لاوازتر بوون بتوانن کاریگەرییەکی ڕاستەقینەیان لەسەر بارودۆخی کوردستان و لەسەر بڕیاردانی سیاسی هەبێت. گەڕانەوەی ئەم حزبانە و دروستبوونی ئەم گۆڕانە لە کوردستاندا، زۆر شتی گۆڕی، من لێرەدا تەنها لە دەرەنجامە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم گەڕانەوەیە ئەدوێم. ئەم گەڕانەوەیە دەسکارییەکی ڕیشەیی و ڕادیکاڵی نەخشەی سۆسیۆلۆژی کۆمەڵگەی کوردستانی کرد، بەتایبەتی لە ئاستی پەیوەندییەکانی دەسەلات و توانا و هێزی ئابووریی ئەو هێزانەدا کە لە کوردستاندا بوون بە هێزی بالادەست و حاکم. گەڕانەوەی پارتی و یەکێتی، کۆمەڵێک هێزی کۆمەڵایەتیی نوێی دروست

کرد، کە بەر لەم گەڕانەوەیە گەر وەک تاکەکەسیش هەبووبن، ئەوا وەک هێزێکی کۆمەڵایەتیی بەهێز و دەسەڵاتدار بوونیان نەبوو. لە سەرەتای گەڕانەوەیاندا سەرکردایەتییەکانی یەکێتی و پارتی تەنها وەک نوخبەیەکی سیاسی لەناو نەخشەی کۆمەڵایەتیی کوردستاندا ئامادە بوون، کە ئەرکی بەڕێوەبردنی کوردستانیان کەوتە ئەستۆ. تاقە دەسەڵاتێک ئەم نوخبە سیاسییە لە بەردەستیدا بوو، دەسەڵاتێکی سیاسی و سەربازی بوو. واتە پارتی و یەکێتی لە سەرەتای ڕاپەڕیندا وەک نوخبەیەکی سیاسی و نوخبەیەکی سەربازی لە کوردستاندا ئامادە بوون. بەڵام ئەمڕۆ، دوای تێپەڕینی ١٣ ساڵ، ئەم دوو نوخبەیە لەوەدا سەر کەوتن، کە ببنە نوخبەی هەرە دەسەڵاتدار و هەرە دەوڵەمەندی ئەم وڵاتە. ئەم دوو نوخبەیە لە ماوەی ئەو ١٣ ساڵەدا، دەسەڵاتی سیاسیی و سەربازیی خۆیان تەرجەمە کرد بۆ دەسەڵاتێکی ئابووری و ئیداری و ڕەمزیی گەورە. بە جۆرێک ئەم وڵاتەیان بەڕێوە برد، کە خۆیان لە یەک کاتدا هەم نوخبەی سیاسی و هەم نوخبەی سەربازی و هەم نوخبەی ئابووری و هەم نوخبەی ئیداری بن. لای ئەم دوو هێزە، پرۆسەی مۆنۆپۆلکردنی دەسەڵاتە جیاوازەکان، لە دەسەڵاتی سیاسییەوە بۆ دەسەڵاتی ئابووری، پرۆسەی مۆنۆپۆلکردنێکی سەرتاسەری بوو، لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و فەرهەنگیدا ڕەنگی دایەوە. شەڕی ناوخۆ یەکێک لە وێستگە گرنگەکانی درێژەدان بوو بەم جێگۆڕکێ کۆمەڵایەتییە. لە ڕاستیدا بەبێ شەڕی ناوخۆ و بەبێ دروستکردنی ئەو نائارامییە کۆمەڵایەتییەی ئەم شەڕە خستییەوە، زەحمەت بوو ئەم جێگۆڕکێ کۆمەڵایەتییە و ئەو مۆنۆپۆلکردنە سەرتاسەرییەی دەسەڵات بەم شێوەیەی ئەمڕۆ بهاتایەتە کایەوە. شەڕی ناوخۆ سیاسەتی بەحزبیکردنی کۆی ڕەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی لێ کەوتەوە، ئەمیش گەندەڵییەکی ترسناکی بەرهەم هێنا، کە پێشێلکردنی هەموو جۆرە یاسایەک لە دابەشکردنی سەروەت و سامانی کۆمەڵایەتی و

ئیداریدا دیارترین دەرکەوتیەتی. هەموو ئەمانەش بوونە هۆی پەکخستنی هەر سیاسەتێک لانی هەرە کەمی عەدالەتی کۆمەلایەتی لە دابەشکردنی سامان و لە ڕەخساندنی هەل و شانسی پێشکەوتنی کۆمەلایەتیی تێدا بێت. واتە ئەو نوخبە سیاسییە هەزارەی لە شاخەکانەوە هاتەوە، نەیدەتوانی ببێت بەو نوخبە ئابووری و ئیداری و سەربازییە دەوڵەمەندەی ئەمڕۆ، گەر مەوقیعە سیاسییەکەی خۆی بەو شێوە گەندەڵ و نایاسایی و نانەتەوەیی و ناعەدالەتییە نەخستایەتە کارەوە، بە مەبەستی کۆنترۆلکردنی سەرجەمی ڕەهەندە جیاوازەکانی ژیان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا. ڕەگ و ڕیشەکانی دەوڵەمەندی ئەمڕۆکەی نوخبە سیاسییەکەی ناو پارتی و یەکێتی، لەم ڕەوتە تایبەتەدایە، کە مێژووی ئێمە لەدوای ڕاپەڕینەوە کەوتە ناوی.

کێشەکەش لەوەدایە لە تاریکترین ساتەوەختەکانی ئەنجامدانی ئەم جێگۆڕکێ کۆمەلایەتییەدا، کە زەبروزەنگ و گەندەلی و جەنگ ڕۆلی سەرەکیی تێدا دەبینی، ئەم دوو هێزە بێبڕانەوە باسی دیموکراسیەتیان دەکرد. پێویست ناکات من بیلێم، لەم سیاقەدا باسکردنی دیموکراسیەت قەشمەریکردنێکی گەورەیە بە دیموکراسیەت.

لەدوای کەوتنی سەدامیشەوە، گۆڕانێکی ئەوتۆ بەسەر شێوازی کارکردنی ئەم نوخبە سیاسییەدا نەهاتووە، هەمان ئەو پەیوەندییەی کە سیاسەت و ئابووری، سیاسەت و مۆنۆپۆلکردنی دەسەلات، سیاسەت و هەلی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی، بەیەکەوە گرێ دەدات، درێژەی هەیە. وەک هەمیشە، پارتی و یەکێتی کۆی پرۆسە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتییەکانیان مۆنۆپۆل کردووە و بازنەیەکی زۆر بچووکیان بۆ هێزەکانی دەرەوەی خۆیان بەجێ هێشتووە بۆ ئامادەبوون. ئەوەشی کە ئەم دوو هێزە ئامادە نین بکەونە موونافەسەی یەکدییەوە، پەیوەندیی بە پاراستنی ئەو میکانیزمانەوە هەیە کە ئەو جێگۆڕکێ کۆمەلایەتییەی بەدرێژاییی سالانی نەوەد تا ئێستا بۆی مەیسەر کردوون.

ئەگـەری دیموکراسـیەت، کاتێـک لـە کوردسـتاندا دەبێتـە ئەگەرێکـی ڕاستەقینە، کە ئـەم نوخبـە سیاسییە ئەو دۆخی مۆنۆپۆڵکردنە سەرتاسـەرییە لەدەسـت بدات، واتـە دۆخێـک بێتـە کایـەوە، کـە نوخبـەی سیاسـی هەمـان نوخبـەی ئیداری و ئابـووری نەبێت، حزب یـان سـەرکردەکانی لـە ڕێگـەی هێـزی سـەربازی و دەزگا ئەمنییەکانـەوە نەبـن بـە گەورەتریـن هێـزی سـەرمایەدار لـە کوردسـتاندا. بەکورتـی، بەبێ ڕزگارکردنـی ئابـووری لـە دەسـتی سیاسـەت، ناکرێت بیـر لـە دیموکراسیەت بکەینـەوە. نابێـت ئـەوەی بڕیـاری سیاسـی ئـەدات، هەمـان ئـەو کەسـە بێت کـە بڕیـاری ئابـووری و بڕیـاری ئیداریـش ئـەدات. بەبێ لەیەکترهەڵوەشـاندنەوەی ئـەو دەسـەڵاتە جیاوازانـەی کـە ئـەو نوخبـە سیاسـییە لـە کوردسـتاندا هەمـووی لـە دەسـتی خۆیـدا کۆ کردووەتـەوە، نـەک ناتوانین باس لە دیموکراسیەت بکەین، بەڵکوو لـە بـەردەم ئەگـەری دووبارەبوونـەوەی ئەزموونـی بەعسـداین. بەکورتـی، پرۆسـەی دەنگدان لـە دوای کەوتنی بەعسـەوە، هیچی ئەوتۆی لـەو میکانیزمە سیاسـی و کۆمەڵایەتییانـە نەگۆڕیوە، کـە پارتی و یەکێتی لـە دوای ڕاپەڕینەوە هەریەکێکیانـی لـە ناوچەکانـی خۆیـدا کـرووەتـە "حزبـی قائیـد."

* تێبینی:

ئـەم چاوپێکەوتنـە هـی سـاڵی (٢٠٠٤) ە، بـەڵام نەمتوانـی بیدۆزمـەوە لەگـەڵ کام ڕۆژنامـە یان گۆڤاردا کراوە. لـە کاتی پێداچوونەوەشـدا، بـە مەبەسـتی زیاتر ڕوونکردنـەوەی مەبەسـتەکان، هەندێک دەسـکاری بچووکی ئـەم یان ئـەو برگـە کـراوە. لەلایەکـی تـرەوە لـە تێکسـتەکەی بەردەسـتمدا پرسـیارە ئەسڵییەکان دیار نەمابوون، بۆیـە ناچار بـووم لەسـەر بنەمـای وەڵامـەکان، خۆم سـەرلەنوێ پرسـیارەکان دارێژمـەوە.

## کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

١. بنەڕەتەکانی فەلسەفە-حەمید عەزیز
٢. کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە (چ٢)-فەرهاد پیرباڵ
٣. ڕێبازە ئەدەبییەکان (چ ٢)-فەرهاد پیرباڵ
٤. مۆزەخانەی پاکیزەیی-ئۆرهان پامۆک- و.بەکر شوانی
٥. نەتەوەی زێرابەکان-جەبار جەمال غەریب
٦. ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی (چ٢)-جەعفەر عەلی
٧. سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی...-جەعفەر عەلی
٨. مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و... (چ٢)-ئەحمەدی مەلا
٩. نهێنییەکانی ژیان-ئۆشۆ-و. ئازاد بەرزنجی
١٠. کورتیلەیەک لە مێژووی کات -ستیڤن هۆوکینگ و لیۆنارد ملۆدینۆ-و. حوسەین حوسەینی و هیوا عومەر
١١. کۆشک-فرانتس کافکا-و. عەتا نەهایی
١٢. فەصلول مەقال- ئیبن ڕوشد-و. مەریوان عەبدول
١٣. شۆڕشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا-وریا ڕەحمانی
١٤. دەسەڵات و جیاوازی-مەریوان وریا قانع
١٥. لە چ ئێستایەکدا دەژین-مەریوان وریا قانع
١٦. شوناس و ئاڵۆزی-مەریوان وریا قانع
١٧. سیاسەت و دونیا-مەریوان وریا قانع
١٨. جەمشید خانی مامم-بەختیار عەلی
١٩. کەشتی فریشتەکان (کتێبی١)-بەختیار عەلی
٢٠. کەشتی فریشتەکان (کتێبی٢)-بەختیار عەلی
٢١. لە دیارەوە بۆ نادیار-بەختیار عەلی
٢٢. وەک باڵندەی ناو جەنگەڵە ترسناکەکان-بەختیار عەلی
٢٣. چێژی مەرگدۆستی-بەختیار عەلی
٢٤. مەعریفە و ئیمان-بەختیار عەلی و هێمن قەرەداخی
٢٥. دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکاو...- گۆران ئیبراهیم صاڵح

٢٦. سەمەرقەند (چ٢)-ئەمین مەعلوف-و. ئەحمەدی مەلا
٢٧. وێستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی-فاروق ڕەفیق
٢٨. ئەخلاقناسی-تەحسین حەمە غریب
٢٩. گەشەسەندنی ڕامیاری...-د. ک. پێسچانی-و. د. ئارام عەلی
٣٠. مێژووی کۆنی کورد (چ٢)-جەمال ڕەشید فەوزیە ڕەشید-و. ملکۆ کەلاری
٣١. منداڵانی گەڕەک-هیوا قادر
٣٢. مرۆڤی یاخی-ئەلبێر کامۆ-و. ئازاد بەرزنجی
٣٣. پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی...-هێرش جەوهەر مەجید
٣٤. مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢)-فریشتە نورائی-و. هەورامان فەریق کەریم
٣٥. سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨)-توانا ڕەشید کەریم
٣٦. شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨)-هەوراز جەوهەر مەجید
٣٧. کتێبی پەراوێزنووسان-عەتا محەمەد
٣٨. فیکر و دونیا (بەرگی ١)-مەریوان وریا قانع
٣٩. فیکر و دونیا (بەرگی ٢)-مەریوان وریا قانع
٤٠. دین و دونیا (چ٢)-مەریوان وریا قانع
٤١. کتێب و دونیا (چ٢)-مەریوان وریا قانع
٤٢. کۆمەڵگەی ڕەش-د. عادل باخەوان
٤٣. زستانێکی درێژ-کولم توبیێن-و. دلاوەر قەرەداغی
٤٤. فرانسیسکۆس قەدیسی من (چ٢)-نیکۆس کازانتزاکیس-و. دلاوەر قەرەداغی
٤٥. ئاهەنگی تەگەکە-ماریۆ بارگاس یۆسا-و. جەلیل کاکەوەیس
٤٦. شەوی لیشبۆنە-ئێریش ماریا ڕیمارک-و. کەریم پەرەنگ
٤٧. من و ئەو-ئەلبێرتۆ مۆرافیا-و. کارزان عەلی
٤٨. میرنامە (چ٢)-جان دۆست-و. سەباح ئیسماعیل
٤٩. ڕووخسارە بەندکراوەکەم-لەتیفە-و. ڕووناک شوانی
٥٠. قەپێلک-مستەفا خەلیفە-و. هەورامان وریا قانع
٥١. خەونی پیاوە ئێرانییەکان و کەوتنی بۆرە قەلا-و. ماردین ئیبراهیم
٥٢. گرگن-پێر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
٥٣. ١٩٨ (چ٢)-جۆرج ئۆروێل-و. حەکیم کاکەوەیس
٥٤. سوور و ڕەش-ستاندال-و. سیامەند شاسواری
٥٥. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٥٦. جادەی مێخەک (١)-دلاوەر قەرەداغی
٥٧. جادەی مێخەک (٢)-دلاوەر قەرەداغی
٥٨. ئێوارستان-پێر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
٥٩. دارستانی نەرویجی-هاروکی موراکامی-و. تارا شێخ عوسمان
٦٠. ئێوارەی پەروانە (چ٦)-بەختیار عەلی

٦١. شاری مۆسیقاره سپییه‌کان (چ٣)-به‌ختیار عه‌لی
٦٢. مه‌رگی تاقانه‌ی دووه‌م (چ٥)-به‌ختیار عه‌لی
٦٣. کۆشکی باڵنده غه‌مگینه‌کان (چ٢)-به‌ختیار عه‌لی
٦٤. تا ماته‌می گوڵ... تا خوێنی فریشته (چ٣)-به‌ختیار عه‌لی
٦٥. سێوی سێهه‌م (چ٣)-به‌ختیار عه‌لی
٦٦. ئاوره‌که‌ی ئۆرفیۆس-به‌ختیار عه‌لی
٦٧. غه‌زه‌لنوس و باغه‌کانی خه‌یاڵ (چ٢)-به‌ختیار عه‌لی
٦٨. ئه‌ی به‌نده‌ری دۆست، ئه‌ی که‌شتی دوژمن (چ٢)-به‌ختیار عه‌لی
٦٩. دواهه‌مین هه‌ناری دونیا (چ٥)-به‌ختیار عه‌لی
٧٠. ئێمه‌ی په‌نابه‌ر-کۆمه‌ڵێ نووسه‌ر
٧١. گره‌وی به‌ختی هه‌ڵاڵه (چ٢)-عه‌تا نه‌هایی
٧٢. عێراقییه‌ک له‌ پاریس-سه‌مۆئێل شه‌معون-و. سه‌باح ئیسماعیل
٧٣. جیهانی سۆفیا و فه‌رهه‌نگی سۆفیا (چ٤)-یۆسساین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٤. کچه‌ی پرته‌قاڵ (چ٥)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٥. له‌ ئاوێنه‌یه‌کدا، له‌ نهێنییه‌کدا (چ٢)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٦. کچی به‌ڕێوه‌به‌ری سێرک (چ٢)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٧. نهێنی یاری کاغه‌ز (چ٢)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٨. مایا (چ٢)-یۆستاین گارده‌ر-و. به‌هرۆز حه‌سه‌ن
٧٩. ئینسایکلۆپیدیایه‌کی مێژوویی وێنه‌دار-کۆمه‌ڵێ نووسه‌ر-و. هه‌ورامان وریا قانع
٨٠. فه‌لسه‌فه‌ی بوون-د. محه‌مه‌د که‌مال
٨١. وه‌ک ڕووباره‌ به‌خوڕه‌که‌-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مه‌حمود
٨٢. دیارییه‌ مه‌زنه‌که‌-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مه‌حمود
٨٣. سیشه‌ممان له‌گه‌ڵ مۆریی-میچ ئه‌لبۆم-و. جوتیار ژاژڵه‌یی
٨٤. دوالیزمی دژ یه‌ک له‌ هۆنراوه‌ لیریکییه‌کانی مه‌ولانای ڕۆمی و...-لهۆن قادر عه‌بدولڕه‌حمان
٨٥. ڕووناک وه‌ک ئه‌وین، تاریک وه‌ک مردن-مه‌مه‌د ئوزون-و. وریا غه‌فووری
٨٦. کاندید-ڤۆلتێر-و. به‌یان سه‌لمان
٨٧. باوکه‌ گۆریۆ-به‌لزاک-و. ئه‌حمه‌دی مه‌لا
٨٨. زێبرا-جه‌بار جه‌مال غه‌ریب
٨٩. منداڵی سووتاو-ستیگ دا گه‌رمان-و. دلاوه‌ر قه‌ره‌داغی
٩٠. ورێنه‌-ئه‌نتۆنیۆ تابوکی-و. عه‌تا محه‌مه‌د
٩١. مردن له‌ ڕوانگه‌ی ئایینه‌کانه‌وه‌-بوساحه‌ ئه‌حمه‌د-و. دانا مه‌لا حه‌سه‌ن
٩٢. گوێ بگره‌، پیاوی بچووک (چ٤)-ویلهێلم ڕایش-و.خه‌بات عارف
٩٣. ڕێبه‌ری کتێبسازه‌ کوژراوه‌کان-عه‌تا محه‌مه‌د
٩٤. کچه‌ فیلم گێره‌ره‌وه‌که‌-هێرنان ڕیڤێرا لێتێلییێر-و. عه‌تا محه‌مه‌د
٩٥. باوکی ئه‌و-په‌رینوش سه‌نیعی-و. ڕووناک شوانی

٩٦. داوێنپیسی-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٩٧. کیمیا گەر (چ٢)-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٩٨. ڕۆژهەڵاتی عەدەن، ڕۆژئاوای خودا-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
٩٩. خۆشی پیشەی من نییە (چ٢)-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
١٠٠. خیانەت لە نیشتمانەکەم دەکەم-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
١٠١. ڕۆژژمێری کیژۆڵەیەک-ئان فرانک-و. عەلی عوسمان یاقووب
١٠٢. جیهانی ڕۆمان-دکتۆر هاشم ئەحمەدزادە
١٠٣. نەفرەت لە دۆستۆیڤسکی (چ٢)-عەتیق ڕەحیمی-و. ئازاد بەرزنجی
١٠٤. ڤایدۆن (چ٢)-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٥. گۆر گیاس (چ٢)-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٦. سیاتیتۆس-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٧. مەسیح لە خاچ دەدەنەوە (چ٢)-نیکۆس کازانتزاکیس-و. دلاوەر قەرەداغی
١٠٨. تۆ مەچۆ بۆ شەڕ (چ ٢)-ماردین ئیبراهیم
١٠٩. سە گوەڕ (چ ٧)-محەمەد موکری
١١٠. چاوەکانی (چ١٠)-بوزورگ عەلەوی-و. ئازاد بەرزنجی
١١١. A-6171 من لە ئاوشفیتز دەرباز بووم-فێرێنک گوێندوێر-و. عەتا محەمەد
١١٢. باراباس-پێر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
١١٣. تۆڵە (چ٥)-محەمەد موکری
١١٤. سڵاو؟ کەس لەوێیە؟ (چ٢)-یۆستاین گاردەر-و. سیروان مەحمود
١١٥. هیچ-کۆچەر ئەبوبەکر
١١٦. هەورەکانی دانیال-بەختیار عەلی
١١٧. ئێمە زەریامان بەزاند-جولی ئوتسوکا-و. دلاوەر قەرەداغی
١١٨. بەناوی ژیانەوە-ئەریک فرۆم (چ٥)-و. ئازاد بەرزنجی
١١٩. کوردستان لە ڕووبەڕووبوونەوەی داعشدا-د. بورهان أ. یاسین
١٢٠. دڵڕەقیی و بێ ماڵیی-مەریوان وریا قانیع
١٢١. دزێکی ڕاستگۆ- دۆستۆیڤسکی-کاروان مەحمود
١٢٢. تیمساح-دۆستۆیڤسکی-کاروان مەحمود
١٢٣. سۆفیست-ئەفلاتوون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان

